عثمان بن محمد الخميس




# دەمێك لە مێژووی ئیسلام

لە وەفاتی پێغەمبەرەوە تا کوشتنی حوسەین ساڵی ٦١ کۆچی

وەرگێڕان و دەستنووسینی
عەلی خان

پێداچوونەوەی
م. خلیل أحمد



ناوی کتێب بەعەرەبی: حقبة من التاريخ مابين وفاة الرسول ﷺ إلى مقتل الحسين ﷺ سنة ٦١ﻫ
نوسەر: عوسمان محمد خميس
ناوی کتێب بە کوردی: دەمێك لە مێژووی ئیسلام لە وەفاتی پەیامبەرەوە ﷺ تا کوشتنی حوسەین ﷺ ساڵی ٦١ ك
وەرگێران و لەسەر نوسینی: علی خان
پێداچونەوەی: م.خەلیل أحمد
تایپ: ڕەزا صەلاحەدین
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمد أمین
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە وساڵی چاپ: دووەم ١٤٣١ك - ٢٠١١ز
تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە بەڕێوە بەرایەتی کتێبخانەی گشتی سلێمانی ژمارەی سپاردنی ( ١٤٠٧ )ی ساڵی ٢٠٠٨ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# دەمێك لە مێژووی ئیسلام

## لەوەفاتی پەیامبەرەوە ﷺ تا

## کوشتنی حوسەین رضي الله عنه ساڵی ٦١ك


**نوسینی**

عوسمان محمد خەمیس

**وەرگێڕان و لەسەر نوسینی**

علی خان

**پێداچونەوەی**

م.خلیل أحمد



**چاپی دووەم**




## پێشەکی چاپی دووەم

سوپاسی خوای مەزن دەکەم بەو شێوەیەی شایستەیەتی، صەڵات و سەلام لەسەر ڕێنموییکاری مرۆڤایەتی کە موحەممەدی پەیامبەریەتی ﷺ، هەروەها لەسەر خۆشەویستان و ئازیزان و سەرخەرانی پەیامبەر ﷺ، کە خێزان و خانەوادە و هاوەڵەکانیەتی -بەتایبەتی-، ئوممەتەکەیەتی -بەگشتی-. دوای ئەوە:

**خوێنەری سەنگین**... ئەمە چاپی دووەمی کتێبی «**دەمێك لە مێژووی ئیسلام**»ـە، کە بە تەوفیق و پشتیوانی خوای میهرەبان، ساڵێکی نەبرد چاپی یەکەمی تەواو بوو -لە مەشدا فەزڵ و میننەت لە سەرەتا و کۆتایی، لە پاش و لە پێشدا هەر بۆ خوای فەزڵبەخشە، ستایشی دەکەم، ولێی دەپاڕێمەوە، وامان لێ بکات لە ئاست نیعمەتەکانی ئەو بین و بتوانین هەقی بدەین-، وا بە پشتیوانی خوای میهرەبان چاپی دووەمی دەستکاری کراو و بۆ زیادکراو و هەڵەچنی کراو لە بەرگێکی نوێدا دەخرێتەوە بەردەستی خوێنەرانی، بە هیوای سودمەند بوون و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لەم بوارەدا لە کتێبخانەی کوردیدا بەدی دەکرێت. سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بەتێبینی و پێشنیارە بونیادنەرەکانیان، چاپی دووەمیان زیاتر دەوڵەمەندتر کرد. خوای میهرەبان ئیخلاص بە هەموو لایەکمان ببەخشێت و تەوفیقمان بدات بۆ ئەوەی خۆی پێی خۆشە. وصل اللهم علی محمد وآله، والحمد لله رب العالمین.


علی خان

**مزگەوتی قازی موحەممەد - کەلار**

**دووشەممە، ٢٣ی زیلقەعدەی حەڕامی ١٤٣١**

alikhan@ba8.org

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ پەرستراوی هەق، سوپاسێك شایستە بێ بە جەلالەت وگەورەیی ئەو، بەردەوام بێ بە بەردەوامی ئەو، قورس و سەنگین بێ بە سەنگینی عەرشی ئەو، فراوان و زۆر بێ بە زۆری دروستکراو و وشەکانی ئەو، بە ژمارەی ئەوەی بەچاو دەبینرێ و ئەوەشی بەچاو نابینرێ لەسەر سورهێنەرەکانی قودرەتی ئەو، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دڵمانی بە نووری ئیسلام ڕووناك کرد، تاریکیی وچەوتی نەفامیی لەسەر دڵمان لابرد، سوپاس بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیسلام، لە سەر نیعمەتی ئیمان، لەسەر نیعمەتی ئەمان، لەسەر نیعمەتی سوننەت، لە سەر نیعمەتی قورئان، سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە هەقی سەرخست و دەرخست، ناهەقی لابرد و ژێر خست، سوپاس بۆ خوای تاك و تەنها، تەنها و تەنها، بێ شەریك، بێ ڕەفیق، بێ هاوەڵ، بێ هاوسەر، تەنیا لە ناوەکانیا، تەنیا لە سیفەتەکانیا، تەنیا لە زاتیا، تەنیا لە کرداریا، هیچ شتێك وەکو خوا نیە و هەر ئەوە بیسەری بینا، تاکە بێ نیاز، تاکە جێی نیاز، بێ نیاز بە هەموو مەخلوقات، جێی نیازی خەڵك و کەون و کائینات، نە لە کەس بووە و نە کەسی لێ بووە، زانا و ئاگادارە بەوەی بووە و بەوەی ئەبێ، بەوەی نەبوە و بەوەشی نابێ، گەر ببوایە چۆن دەبوو، بۆ نەبووە و بۆ نابێ؟ بێسەر و دانا و زانا و کار لەجێ و بەجێ لە بۆ ئەوەی دەشێ و لەو کاتەی بشێ، بیسەری هەموو دەنگێگ، بە هەر ڕەنگێك، بە هەر لوغەتێك، زانا بەوەی پێش ووتن چی دەڵێی بە چی نیەتێك، زانا بە هەموو نهێنیەك، بەوەشی حەشار دراوە لە سنگی هەر کەسێك، بینەری مێروولەی ڕەش، لەسەر بەردێکی ڕەش، لە شەوێکی ڕەش، بیسەری خشەی پێی، بەرزی وپیرۆزی ومەزنی بۆ ئەو خوایەی کە گەڵایەك لە دارەکەی بەر نایێتەوە مەگەر بە ئیزن و ئاگا و زانستی ئەو نەبێ، بەر ئەبێ یا بەر نابێ، شایستەی

هەموو سوپاسێك، شوكرێك، سەنایەك، مەدحێك، لەهەر كاتێك، لە هەر بارێك، لەوەی دەشێ وشایستەیە بۆ ئەو.

شایەتی ئەدەم -شایەتومانێك ڕزگارم كا و سوودم پێ بگەیەنێ لە ڕۆژێك، كە نە ماڵ و نە سامان سوود ناگەیەنن تۆسقاڵێك، مەگەر كەسێك دڵی سەلیم بێ و لە بۆ خوای گەورە سوڵحا بێت چۆن سوڵحانێك- كەوا هیچ خوایەك، پەرستراوێك بە هەق شایستەی پەرستن نی یە، تەنها الله نەبێت، هەر الله شایستەی پەرستن و ڕوولێكردن و هاوارپێكردنە ، جگە لە ئەو هیچی تر شایستەی پەرستن نییە. كوفر بە هەر پەرستراوێكی تری جگە لە الله دەكەم، تەنها ئەو شایستەی پەرستنە، هەرچی غەیرە ئەو هەیە سەرەنجامی بۆ نەمان و فەوتان و لەناوچوونە.

سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە پێغەمبەرێكی بە «رَحْمَةً لِلْعَالَمِين» ڕەوانە كرد، هەرچی خراپی و چەوتیی و چەپەڵی و گەندەڵی و هەڵدێری و ستەمی ڕوون كردەوە و لابرد. شایەتی ئەدەم كەوا موحەممەد بەندە و پەیامبەر و ڕەوانە كراوی خوایە، ڕەوانەی كرد لە بۆ سەرجەمی گەلان، خۆشەویستمان، نوری چاومان، بە جوانی بە ئەركەكەی هەستا، بە بێ وچان، بە بێ وەستان، بە بێ كۆڵدان، بە جوانی بانگەوازەكەی گەیان، خەڵكی لە خەو هەستان، تا ئەوەبوو: نەزانی فێركرد، چەوتی ڕاستەوە كرد، پیسی پاكەوە كرد، لێڵی ڕوونەوە كرد، تاریكی ڕۆشنەوە كرد، غەم و خەفەت و پەژارە و ناڕەحەتی و نەهامەتی و مەینەتی و شەڕ و ئاشوبی لابرد -بە نەفس وماڵ وسامان ودایك وباوكمەوە بە فیدای خۆی وڕێبازەكەی بم-، بەزەیی و ڕەحمەت لە بۆ جیهانیان، «سوێند بەخوا هیچ شتێك نەما لە هەق وڕاستی، لەوەی سوودی بۆتان هەبێ مەگەر بۆم ڕوونكردوونەتەوە

وپـێم ڕاگەیانـدوون، هـیچ شـتێك نـەما لـە لاری و چـەوتی ، مەگـەر بێـدارم کردوونەتەوە لێی وپـێم ڕاگەیانـدوون»، سـەلات و سـەلامی خـوا لەسـەر خـۆی وخانەوادە وکـەس وکـارە پـاك وبـەڕێزەکانی، هاوەڵـە مـەرد و جوامێرەکـانی، خۆشەویستانی خۆشەویست، ئەوانەی ئیسلام لەسەر دەستیان گەیشتە ئەو پـەڕی دونیا -بەکوێرایی چاوی دوژمنانیان- ، هەروەها لەسەر خێزان و شوێنکەوتووانی بەچاك تا ڕۆژیی دوایی، داوی ئەوە:

خوێنەری سەنگین: ئەم کتێبە باس لە ماوەیەکی مێژوویی زۆر کورت دەکات کـە بریتییـە لـە وەفـاتی پێغەمبـەر ﷺ تـا کوشـتنی حوسـەین ﷺ، دوای باسکردنێکی پوختی ڕووداوە مێژوویـەکانی ئـەو دەمـە، وەڵامـی ئـەو شـوبهە وگومانانەی نەیار وگروپە لاڕێکان دەداتەوە کە هەر لە کۆنەوە دژایەتی کۆمـەڵی ڕزگار بوویان کردووە، نەك بـە شـوێنکەوتنی بەڵگـە و نـوری خـوا، بـەڵکو بـە شوێنکەوتنی ئارەزوو و هەوا.

لە کاتێکدا خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، کە شوێنی هەوا وئارەزوو نەکەوێت، بەڵکو شوێنی ئەوە بکەوێت کە لە لایەن خواوە بۆی دادەبەزێت، تەنها ئـەوە ڕوونـاکی وهیدایەتـە ، هـەر ڕێگـا وڕێبازێك لەوە لایدا تاریکی وسەرگەردانیە.

زۆربەمان بیستوومانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی: «ئوممەتەکـەم دابەش دەبێتە سەر حەفتاو سێ بەشەوە، هەموویان لە ئـاگرن تـەنها دانەیـەکیان نەبێت».

جا هەر یەك لەو گروپە لاڕێیانەی، کە هەن ئەڵێن: ئێمە ئەو کۆمەڵەیەین کە ڕزگاریان دەبێت.

کەوابوو مرۆڤ چۆن هەقەکەیان بناسێت؟

خوای گەورە لە قورئاندا فێری ئەوەمان دەکا کە هیچ شتێك بە بانگەشە وئیدیعاکردن نیە، بەڵکو ئەبێت لێکۆڵینەوەی لێ بکرێت، لێکۆڵینەوەش بریتییە لە گەڕان بە دوای بە بەڵگەکاندا، کە تا چەند دروستن پاشان تا چەند بۆ ئەو مەبەستانە دەشێن.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ {الحجرات:٦}. واتە: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوناهکارێك هەواڵێکی بۆ هێنان، ئەوا لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە».

هەروەها خوای تەعالا کاتێك باسی بتەکان «لات وعوززا ومەنات» دەکات، بەڵگەی پوچەڵێتی ئەو بتانە بەوە دەسەلمێنێت کە ئەو بێ باوەڕانە لە خۆیانەوە دیپەرستن ولەسەر ئەوە هیچ بەڵگەیەکیان لە لایەن خواوە بۆ دانەبەزیوە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنۡ هِيَ إِلَّآ أَسۡمَآءٞ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾ {النجم:٢٣}. واتە: «ئەو بتانە هەر ناوانێکی ڕووتن کە ئێوە وباو باپیرانتان لێتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر پەرستراوی ئەوان نە ناردۆتە خوارەوە».

هەروەها کاتێك باسی ووتەی جولەکە وگاورەکان دەکات کە ووتویانە: (کەس ناڕواتە بەهەشتەوە مەگەر کەسێکی جولەکە یا گاور نەبێت» خوای گەورە لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: ئەمە هیوای ئەوانە، پێیان بڵێ کوا بێنن بەڵگەکانتان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن؟!

هەروەها دەفـەرموێ: ﴿أَمَّن يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾، واتە: ئایا خوایەکی تر هەیە بێجگە لـەخوا هەقەکە؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن بێنن کوا بەڵگەکانتان؟.

لە چەندین شوێنی تری قورئاندا خوای گەورە لەسەر ئەو کار و عیبادەتانەی، کە موشریك و لاڕێکان ئەیکەن داوای بەڵگەی خوایی و ڕاستیان لـێ دەکـات ، پێیان دەڵێ: کوا بەڵگەکانتان. ئایا لە لایەن خواوە لەسەر ئەو کارەتان نوسراوتان بۆ دابەزیوە، لەسەر ئەو نوسراوە ئەڕۆن بەڕێوە و کار بـەو نوسـراوە دەکـەن، کـوا بێنن ئەو نوسراوە لە کوێیە؟!

کەواتە قورئان فێری ئەوەمان دەکات کە هەموو شـتێك بـە بەڵگـە جـێگیر بکەین و بە بەڵگەش هەڵی بوەشێنینەوە.

جـا نوسـەر هەسـتاوە بـە موناقەشـەکردنی ئـەو بەڵگانـەی، کـە نـەفس نەخۆشەکان ئەیهێننەوە بۆ بریندارکردنی هاوەڵان، تا چەند ئەو بەڵگانـە ڕاسـت و دروست و صەحیحن، پاشان تا چەند بۆ مەبەست و مەرامەکانی ئـەوان دەشـێن، ئایا بەڵگەیە بە دەستیانەوە، یان بەڵگەیە بەسەریانەوە؟

لەگەڵ ئەوەدا خوای گەورە خۆی لە قورئاندا لە ئایەتی شەشی سورەتی ئالی عیمراندا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەوا هەندێك ئایاتی قورئـان موحکـەمن و هەندێکی تری موتەشابهن، جا مەنهج و ڕێبـازی هـەق و صـەحیح ئەوەیـە تـۆ موتەشابیهەکان بە موحکەمەکان ڕاڤە بکەی نـەك بـە پێچـەوانەوە، کـە ئەمـە گومڕایی سەرلێشێواویەکە ئەو گروپە لاڕێیانە تێی کەوتوون.

*** پرسیارێك:**

ئەم کتێبە بە گشتی وەڵامی تانەی شیعەکانە لە هاوەڵان، ئەی خۆ کورد شیعەی تێدا نییە -هەشبێت زۆر کەمە-؟ کەوابوو بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە؟!

لە وەڵامدا ئەڵێین: سەرەتا بابەتەکە پەیوەندی بە هاوەڵانەوە هەیە، پارێزەرانی قورئان و سوننەت، بۆیە بەرگریکردن لەوان بەرگریکردنە لەو قورئان و سوننەتەی کە لە ڕێگەی ئەوانەوە گەیشتۆتە دەستمان، هەر وەك چۆن پێمان وایە تانەدان لەوان ، لە تانەدان لە دینەوە سەرچاوەی گرتووە.

کەواتە ئەم کتێبە بەرگری کردنە لە دین بەبێ لەبەر چاوگرتنی هەرشتێکی تر.

دوای ئەوەش: بەڵێ کورد ڕێژەیەکی زۆرکەم شیعەی تێدایە، بەڵام زۆرێك لە عەلمانیەکان و خەڵکی چەواشەکار ، بوون بە زمانحاڵی شیعە لە قسەکردنە صەحابە و توانج لێدانیان و بریندارکردنیان، جارێك ناوهێنانیان بە عەصابە، جارێك بە خوێن مژ، جارێك بە چاو سور، جارێك بە صەددام و جارێك بە...هتد، بەڕێژەیەکی زۆر بەرچاو و لێرە و لەوێ، لە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا -ئەمە جگە لەوەی هەموو یا زۆربەی بەڵگەکانیان لە کتێبی شیعەکانەوە ڕوایەت دەکەن و دەیهێننەوە- هەر کەسە و هەڵدەستێ قسەی خۆی دەکات، خەریکی ڕاگەیاندنە کۆڕ لەسەر حەساسترین دەم دەبەستێ کە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانیەتی.

بۆیە وەرگێڕانی ئەم کتێبە لەم شوێنە و لەم کاتەدا، زۆر جێی خۆیەتی و کاتی خۆیەتی و زۆر گرنگە.

## سەبارەت بە کاری منیش لە وەرگێڕانەکەدا:

- هەرچیم بۆ ئەسڵەکە زیاد کردبێت خستومەتە نێوان ئەم دوو کەوانەوە [].

- هەر پەراوێزێکیش زیادەی خۆم بن لە خوارەوە نوسیومە (وەرگێڕ).

- هەرچی واتاکردنێك هی خۆم بێ نووسیومە «واتە» بۆ نوسەرەکەش نووسیومە «یانی»، بۆ ئەوەی ڕاڤە و واتا کردنی خۆم و نوسەرەکە تێکەڵ نەبێ.

جا لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکە زۆر زانستیە، بۆیە هەوڵمداوە -بە پێی توانا- هەم بەو زانستیەی خۆیەوە بیهێڵمەوە، هەم خوێنەریش لە ناوەڕۆکەکەی بەهرەمەند بکەم، بەبێ زیاد کردن، ئەگەریش زیادم کردبێت -کە ئەمەش کەم جار بووە- جیام کردۆتەوە. سەبارەت بەو سەرچاوانەی سودم لێبینیون بۆ وەرگێڕانەکە: - بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان بە زۆری پشتم بە پوختەکەی مامۆستا مەلا صاڵح بەستووە، ئەمە جگە لەوەی هەر واتایەکیانم بە دڵ نەبووبێ، پەنام بردۆتە بەر (ڕامان) و ئەوەی مامۆستا هەژاری موکریانی.

- بۆ فەرمودەش بە زۆری پشتم بە (فتح الباري) ئیبن حەجەر و (شەرحی صحیحی موسلیم) ی نەوەوی بەستووە. هەندێك جاریش (عون المعبود)ی ئەبو داود و (تحفة الاحوذي) شەرحی ترمذي.

- بۆ زمانەوانیش لە فەرهەنگە کوردیەکان سوودم لە فەرهەنگی دەریا و فەرهەنگی شیرین بینووە، لە عەرەبیەکانیش (مختار الصحاح) و (معجم الوسیط) لەگەڵ چەندین سەرچاوەی تر کە لە شوێنی خۆی ئاماژەم پێکردوون.

لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی مامۆستا خەلیل ئەحمەد دەکەم، کە ئەرکی کێشا و پێداچوونەوەی ئەم وەرگێڕدراوەی کرد، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە، و سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی هاوکاریان کردم لە وەرگێڕانی ئەم بابەتە.

**خوێنەری سەنگین...**

ئەمە ئەوەیە کە توانیومە، نەك ئەوەی کە ویستوومە، داواکارم لـە خـوای گەورە بیکاتە توێشـووی سـەفەری درێـژم، لــە تـاوان خـۆم و بـاوکم و دایکـم و خانەوادەکەم خۆش ببێ، بە ڕەحمی خۆی ڕەحمم پێ بکا، ئیخلاصم پێ ببەخشێ ، لەم کارەم و لەسەرجەم کارەکانی ترمدا.

هەژاری بەزەیی تۆین ئەی پەروەردگارا! ئەوەم فێرکە سـودم پـێ دەگەیـەنێ وسودیشم پێ بگەیەنە بەوەی فێرم دەکەی، هەر خـواش لــە مەبەسـت ئاگـادارە، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ،اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ والحمد لله رب العالمين.

وەرگێڕ

هەینی ١٤٢٩/٥/٢٤- ٢٠٠٨/٥/٣ز

Alikhan_alkurdi@Gawab.com

## پێشەکی نوسەر

إِنَّ الحَمْدَ لله، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. أَمَّا بَعْدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الامُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلُّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.

که به مێشکمدا هات لەسەر ئاوها بابەتێك بنوسم، له ڕاستیدا دوو دڵ بوم، هەنگاوێکم بۆ پێشەوە دەناو هەنگاوەکەی تر بۆ دواوە، لەبەر زۆری ئەوانەی ڕۆچوون له باسکردنی ئەم جۆرە بابەتەدا، هەندێك جار بەڕەوایی و زۆرجاریش به ناڕەوایی، بێ گومان ئەم بابەتە له بابەتە هەرە زیندوەکانە، ئەگەر چی کاتێکی زۆریشی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام هەر زیندووە له دەروناندا، بۆ گەورە ڕاگرتنی بۆ ئەو جیله بێ وێنە و نمونەییە، ئەو ئەستێرە مەزنانەی که هەڵبژێردرابوون.

جا لەبەر ئەوەی قسەی هەق ڕوناکیە و چرای ڕێگایە ، ولەبەر ئەو فەزڵ و چاکەیەی ئەو جیله پیرۆزە بەسەرمانەوە هەیانە؛ پێویست بوو بەشێك لەو هەقەیان بەسەرمانەوە بەجێ گەیەنین، چونکە ئەوان وەکو خەڵکی تر نین، نه له زانستیان ، نه له کردەوەیان کەس پێشیان نەکەوتوە و کەسیش پێیان ناگات. ئا بەوانە خوا - سبحانه- دینەکەی سەرخست و بەهێزکردو دەرخست.

ئێمە ئەگەر چی باسی فەزڵی هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ دەکەین، بەڵام ناڵێین مەعصومن، بێ تاوان و هەڵەن، چونکە خوای گەورە مەعصومیەتی تەنها بۆ فریشتەکان و پەیامبەران -علیهم السلام- قەرار داوە.

**بەڵێ، هەندێکیان هەڵەیان کردوە، لەژیانی پەیامبەردا ﷺ و لەدوای مردنیشی، چونکە ئەوانیش ئادەمیزادن و مەعصوم نین، بەڵام ئەوەی ئەوان کێشاویانە هەر لە ئێش و ئازار و دەردەسەری لە پێناوی ئیمان بەخوا و پەیامبەرەکەی و بانگەواز کردن بۆ دینی ئیسلامی ڕاست و ڕێك و میللەتی ئیبراهیم، بەجێ هێشتنی ماڵ و منداڵ و نیشتمان، تێکۆشانیان لە پێناوی خوادا بە ماڵ و گیانیان، بەرگریکردنیان لەپێناوی پەیامبەردا ﷺ بە هەموو ئەوەی کە هەیان بووە، ئا ئەمانە ئەو هەڵانەیان لە چاو چاکە گەورەکانیاندا وەك دەنکە بەردێك لێدەکا لەبەرانبەر شاخێکدا، وەك دڵۆپە ئاوێك لێدەکا لە بەرانبەر دەریایەکدا.**

بێگومان مێژووش گرنگیەکی زۆری هەیە لە ژیانی گەلان و میللەتاندا، چونکە مێژوو کۆڵەکەی بوونی ئەو میللەتانەیە، بەرنامە و ڕێبازیان بە ئێستایان و بە داهاتویانەوە مێژوو دیاری دەکات، هیچ میللەتێك نیە ویستی فەرمانڕەوایی و دەسەڵات بەدەست گرتنی هەبێ، ئیللا ئەبێ پەیوەندی بە ڕابردویەوە توند و تۆڵ بکات بۆ داواکردنی هێز و کۆمەك لەو ڕابردوە لە بۆ بنیاتنانی ئێستا و سەرپەرشتی کردنی ئایندەی.

جا میللەتێکی وەکو میللەتی ئیسلام لە پێشترە بۆ ئەمە وەك لە میللەتانی تر، بەهۆی ئەو مێژوە پرشنگدارەیەوە، کە پڕە لە پاڵەوانێتی و سەروەری و

شکۆمەندی و دەستکەوتی زانستی و شارستانیەتی، بەڕادەیەك مێژووی هەر میللەتێکی تری لە بەرانبەردا لە پێش چاو بچوك دەبێتەوە. بەڵام بەهۆی لاوازی ئوممەتەکەمانەوە لەم ڕۆژگارەی ئەم ڕۆیدا -بەهۆی بەرهەمی دەستی نەوەکانیەوە، خوای گەورە نەوەی مەیمون و بەراز و تاغوت پەرستانی بەسەردا زاڵکردوین، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم.

وَمَنْ يَهُنْ يَسْهُلِ الهَوَانُ عَلَيْهِ مَا لِجُرْحٍ بِمَيِّتٍ إِيلام[١]
هەرکەس ڕیسوابێ سەرشۆڕی پێڕەزایە زامی گیانی مردو ئێش وئازاری تیایە؟

ئەڵێم: لەم لاوازیەدا هەر دەبێت بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئوممەتە شکۆدارە گەشاوەکەمان؛ بۆ ئەوەی وردبەونەوەمان لە خودی خۆمان، لە دەوروبەری خۆمان ئاسان بێت و بەجوانی ببینین، شوێن پێی خۆمان لەبۆ ئایندەمان بدۆزینەوە، ئەمانەش تەواو نابن بە گەڕانەوە و وردبوونەوەمان نەبێت لە مێژوە ڕاستەقینەکەمان ، و هەرچیش ڕاستی نەبێت هیچ نییە.

**جا ئەگەر بەوردی تەماشایەکی مێژووی خۆمان بکەین، تێبینی دەکەین، کە پاکترین و خاوێنترین دەم «حقبة»[٢] ئەو دەمەیە پەیامبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی تێیدا ژیاوە، ئەو نەوەیەی کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامی لەسەر شان نابوو، بەڕاستی ئەوانە هەڵبژێردراوی نێو دروستکراوەکانی خوان لە دوای پەیامبەران -علیهم السلام-.**

---

(١) ديوان أبو الطيب المتنبي ل١٦٤.

(٢) (الحُقُبُ أو الحُقْبُ) : المدة الطويلة من الدهر. و (الحِقْبَةُ) : المدة لا وقت لها ، أو السّنة. انظر «لسان الميزان» لابن منظور (٢٥٣/٣) مادة (حقب).

بەڕاستی مێـژووی ئوممـەتی ئیسـلامیش توشـی تـێ ئـاخنی و شـێواندن و تێکدانی زۆر هاتووە، بەهۆی ئەو کۆمەڵ و گروپانەی کە لە سەرەتای ئیسلامەوە دروست بوون، هەر کۆمەڵە و هەوڵی داوە بایەخ و گرنگـی خـۆی زیـاد بکـات و بەرز بکاتەوە لەسەر حیسابی بەرانبەرەکەی، ئەمەش کەلێنانێکی دروستکرد لـە مێژووی گەورەکانی ئوممەتەکەماندا.

لـەنێو ئوممەتـدا خـەڵکانێك دەبـینی سـنوری شـەرعی بەرزانـدووە لـە خۆشویستنی کەسایەتیەکاندا، هەبووە هاوەڵی پایەبەرز عەلی کوڕی ئەبو تـالبی ﷺ زۆر خۆشویستوە، خۆشویستنێك کە سەری تەواو لێتێکداوە، ڕوداو و باس و هەواڵی ئاوهای لێوە گێڕاوەتەوە کە قبوڵناکرێ، لەهەمان کاتیشدا هەوڵی داوە لە بایەخی ئەوانی تر کەم بکاتـەوە، و خـەڵکانی تـر بـە دەسـتدرێژیکەر بـۆ سـەر مافەکانی عەلی ﷺ لەقەڵەم بدا، بەمە ستەمیان هەم لەخۆیان و هەم لە عـەلی کرد، تەنانەت زیادەڕۆییکردن لەو هاوەڵە بەڕێزە سەری کێشا بـۆ وەچەکانیشـی، کار گەیشتە ئەوەی بڵێن : ئیمامن و دیاری کراون و مەعصومن ، هەر وەکو چۆن پیغەمبەران مەعصومن علیهم السلام[1].

* ئەوە عەلیـە ﷺ ئـەڵێ: « خـەڵکانێك بەڕادەیـەك خۆشـیان دەوێـم تـا دەیانباتە ئـاگرەوە، خـەڵکانێکیش بەڕادەیـەك ڕقیـان لـێم دەبـێ تـا دەیانباتـە ئاگرەوە»[2].

---

(١) بەڵکو لە (بحار الأنوار)ی مەجلیسیدا (بـ٢٣-٢٧) و هتر، زیادەڕۆیی لەمـە گـەورەترمان پێش چاو کەوت.

(٢) أخرجه ابن أبي عاصم في (السنة) برقم (٩٨٣)، وقال العلامة الناصرالدين الألباني=

* هەروەها ئەڵێ: « دوو كەس لەسەر من تیا ئەچن: كەسێكی زیادڕۆ لە خۆشەویستنم، كەسێكی زیادڕۆ لە ڕق لێبوونم»[1].

ئەم جۆرە بیركردنەوە و شێوە زیادەڕەویانەش -لەسەر ڕاسترین بۆچون- لە دوای نیوەی (سەدەی سێیەمی كۆچیەوە) سەریان هەڵداوە.

بەڵگەیەی ئەم ڕاستیەش ئەوەیە: ئەو ڕق لێبونەی نێوان عەلی ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەكان، كە باسی لێوەدەكەن، لە هەواڵ و ڕیوایات و باسە صەحیحەكاندا شتی وا نابینین، بەڵكو بە پێچەوانەوە، شتانی وامان بینی، كە بەڵگەن لەسەر مەزنی ئاستی خۆشویستنیان لە بۆ یەكتری، لەگەڵ بینینی چەندەها ڕوداوی پرشنگدار لە خۆشەویستی وخۆنەویستی و برایەتی و دۆستایەتی و دڵسۆزی و ئامۆژگاری و ژن و ژنخوازی، بە ڕادەیەك كە هەر بە ویژدانێكی شەیدای ڕاستی، ئەوانە ببینێت، ئەو وتە ساختە و دەلەسە دوژمناوی و ڕقاوی و بوغزاویانە بە درۆ دەخاتەوە..

لەو وێنە پرشنگدارانە:

*** هەر سێ خەلیفە سەر ڕاستەكە: ئەبوبەكری صیدیق، عومەری كوڕی خەتتاب، عوسمانی كوڕی عەففان، هانی عەلی دەدەن لە بۆ خواستنی فاتیمە وبەشداریش دەكەن لە ئامادەكرن و شایەتیداندا:**

---

=(**إسناده صحيح على شرط الشيخين**). وانظر (نهج البلاغة) (٤٦٩) (٤/١٠٨)،و (مناقب الامام أمير المؤمنين) (محمد بن سليمان الكوفي) (٢/٢٨٣)،و (الأمالي)للطوسي (ص٢٥٦).

(١) المصدر السابق برقم (٩٨٤)، وقال العلامة الألباني (اسناده حسن).

* **عەلی** رضي الله عنه **ئەڵێ:** « ئەبوبەکر و عومەر هاتنە لام و وتیان: بۆ نارۆی بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ و باسێکی فاتیمەی لا بکەی »[(١)].

* **هەروەها ئەڵێ:** پەیامبەری خوا ﷺ پێی وتم: « هەر ئێستا بڕۆ قەڵغانەکەت بفرۆشە و پارەکەییم بۆ بهێنە، تا پێداویستی ماڵ بۆ (خۆت) و (فاتیمە) ئامادە بکەم ».

عەلی رضي الله عنه ئەڵێ: منیش ڕۆیشتم و فرۆشتم بە عوسمانی کوڕی عەففان بە چوارسەد درهەمی ڕەشی کۆچی.

کاتێك کە پارەکەم لێوەرگرت و ئەویش قەڵغانەکەی لێوەرگرتم.

[عوسمان] وتی: ئایا من بۆ تۆ لە قەڵغانێك زیاتر ناهێنم وە تۆش بۆ من لە دیرهەم زیاتر ناهێنی؟ منیش وتم: بەڵێ.

ئەویش وتی: دە ئەو قەڵغانە دیارییە لە منەوە بۆ تۆ.

منیش قەڵغانەکە و پارەکەم هێنا و ڕۆیشتم بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ قەڵغان و درهەمەکانم خستە بەردەستی و باسی ئەوەی عوسمانم بۆ کرد ، ئەویش دوعای خێری بۆ کرد، پاشان مشتێکی لە درهەمەکان گرت و بانگی ئەبوبەکری کردو دای بە دەستیەوە و فەرمووی: « ئەی ئەبوبەکر بەم درهەمانە هەندێ پێداویستیی ماڵ بۆ کچەکەم بکڕە »[(٢)].

---

(١) ( أمالي) للطوسي (ص٣٩)، ( بحار الأنوار) (٩٣/٤٣).

(٢) ( كشف الغمة) (٣٦٩/١)، (بحار الأنوار) (١٣٠/٤٣).

* ئەنەس ئەڵێ: پەیامبەری خـوا ﷺ پێـی وتم: « بـڕۆ بـانگی ئەبوبـەکر وعومەر و عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبەیرم بۆ بکە، بە ژمارەی ئـەوانیش لـە پشتیوانان بانگهێشت بکە » ئەڵێ: منیش ڕۆیشتم و هەموویانم بانگ کرد، دوای دانیشتن پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بە شاهیدی ئێوە ئەوا من «فاتیمە»م لە «عەلی» مارەکرد لەسەر چوارسەد میسقاڵ زیو»[١].

* **عەلی رضي الله عنه ئوم کەلسومی کچی لە عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه مارە دەکات، خوا لە هەمویان ڕازی بێ[٢].**

* **عەلی** رضي الله عنه منداڵـەکانی بـەناوی بـراو خۆشەویسـتە دینیەکانیـەوە نـاو دەنێت: ئەبوبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کـوڕی عـەففان[٣]، هەروەها ستایشیان دەکات:

عەلی رضي الله عنه ئەڵێ: « بەڕاستی ئە مـن هـاوەڵانی پەیامبـەرم ﷺ بینیـوە، دە بەخوا کەستان لەوان ناچن، سوێند بەخوا بەهۆی دونیا نەویستیانەوە دەیـانتبینی بەیانیان سەر و قژیان شێواو و تۆزاوی بوو ، شەوانیشیان بە شەو نوێژ و سوژدە و ڕاوەستانەوە زیندو دەکردەوە، جارێك گۆنایان و جارێك نێو چەوانیان لەزەوی دەنا [بۆ دەربڕینی ملکەچی و زەلیلی بۆ خوای بەرز و پیرۆز]، کە باسی ئاخیرەتیان بۆ

---

(١) (کشف الغمة) (١/ ٣٥٨)، ( بحار الأنوار) (٤٣/١١٩).

(٢) (فروع الكافي) كتاب النكاح، باب تزويج أم كلثوم (٥/٣٤٦)، و (فـرو ع الكـافي) كتـاب الطـلاق، بـاب المتـوفى عنهـا زوجهـا (٦/ ١٢٠). وقبلـها البيهقـي في (السـنن الكـبرى) (٧/٦٣)،(مصنف عبدالرزاق) (٦/ ١٦٣).

(٣) أنظر كتب الأنساب كـ(عمدة الطالب) لابن عنبة، و ( الأنساب ) للسمعاني.

دەكرا وەكـو ئـەوە وابـوو بەسـەر زوخاڵـەوە وەسـتابن، بـەهۆی درێـژی و زۆری سوژدەكانیانەوە خەویان لێ نەدەكەوت، وەكو ئەوەی شتێكی ڕەق لە نێو چاوانیان بێت و تێیـدا بسـوڕێتەوە و نـەهێڵێت بخـەون و پشـویەك بـدەن، هەركـە باسـی خوابكرایە فرمێسك بە چاوەكانیاندا دەهاتە خوارەوە و دەم و چاویانی تەڕ دەكـرد ودەلەرزان و دەهەژان وەكو چۆن دار لە ڕۆژی بای توند دا دەلەرێتەوە »[1].

عەلی منداڵی هەبوو بەناوی ئەبوبـەكر و عومـەر و عوسمـان، ئەبوبـەكر و عوسمانی لەگەڵ حوسەین لەڕوداوی (طف)دا كوژران، بـەڵام عومـەریان تەمـەنی زۆرتر كرد[2].

جا وەك لە سەرەتای كتێبەكەدا ئامـاژەم پێـدا، دوو دڵ بـووم لـە نوسـینی بابەتێكی ئاوها، تا بۆم دەركەوت بەرژەوەندی لەوەدایـە لەسـەر ئاوهـا بابـەتێك بنوسم -ئەوندەی خوا ئاسانی كا-، ئەمـەش دوای ڕاوێـژپێكردنی هەنـدێك لـەو زانایانەی كە جێی متمانەمن، جا ئەگەر هەر ڕەواییەكی تێدا بوو لە خواوەیـە - سبحانە وتعالی-، هەر ناڕەواییەكیشی تێدابوو لە نەفسی خۆم و شەیتانەوەیە.

---

(١) (نهج البلاغة) خطبة رقم ٩٧. جا كتێبی نهج البلاغە ئەگـەر چـی ئێمـە پێمـان وا نیـە نیسبەتی بدرێتە پاڵ عەلی ڕەزای خوای لێبێ، بەڵام لە ڕوانگەی ئیلزامكردنی شیعە بە كتێبەكانی خۆیانەوە. سەبارەت بە كتێبەكانی ئەهلی سوننە ئەوە پڕە لە ستایشكردنی عـەلی بـۆ هـاوەڵانی= =پەیامبەر صلی الله علیه وسلم بە تایبەت هەردوو كتێبەكەی بوخاری وموسلیم، بۆ نمونە بڕوا بزان لە باسی ئەبوبەكر وعومەردا چی دەفەرموێ.

(٢)( بحار الأنوار ) (٧٤/٤٢)،( الشجرة الزكية في الأنساب ) (٤١٣).

**لەم توێژینەوەیەدا باس لە دەمێكی كورتی زۆر گرنگی ئەو مێژووە دوور و درێژەمان دەكەم، لە وفاتكردنی پەیامبەری خواوە ﷺ دەست پێدەكات، تا ساڵی ٦١ی كۆچی پیرۆزی پەیامبەر ﷺ.**

كتێبەكەم دابەشكردوە بەسەر پێشەكیەك و سێ بەش:

**لە پێشەكیەكە:** باسی سێ **مەبەستی گرنگم** تێدا كردوە:

مەبەستی یەكەم: چۆنێتی خوێندنەوەی مێژوو.

مەبەستی دووەم: لە مێژودا كتێبی كێ بخوێنینەوە.

مەبەستی سێیەم: دەستەواژەی مێژوونوسان لە شێواندنی مێژوودا.

**لە بەشی یەكەمدا:** ڕووداوە مێژووییەكانم تێدا گێڕاوەتەوە، هەر لە وەفاتكردنی پەیامبەری خواوە ﷺ هەتاوەكو ساڵی شەست و یەكی كۆچی پیرۆزی پەیامبەر ﷺ.

بە پێی توانا بەسەنەدی صەحیحەوە باسی گرنگترین ئەو ڕوداوانەم كردوە كە لەم ماوەیەدا ڕویداوە، لەگەڵ ئاماژەكردن بە چیرۆكە ساختە و پوچەكان.

**لە بەشی دووەمدا:** باسی «**عەدالەتی هاوەڵانم**» کردوە.

بەهێنانـەوی بەڵگـەکانی قورئـان و سـوننەت لەسـەر عەدالـەتیان، لەگـەڵ باسکردنی گرنگترین ئەو شوبهانەی لە بارەیانەوە وروژێنراوە لەگەڵ ڕونکردنـەوەی ڕاستیەکان لەم پرسەدا.

**لەبەشی سێیەمدا:** لەم بەشەدا باسی «مەسـەلەی خیلافـەت» جێنشـینیم کردووە.

هەروەها بەڵگەی شیعەکانم لەسەر لە پێشتری عەلی ﵁ بە دوور و درێـژی هێناوەتەوە. بەشێوازێکی زانستی زۆر ورد قسەم لەسەر کردووە، بە شـێوازێك وا نازانم لە بێجگە ئەم کتێبە بەرچاوت بکەوێت. ئەمەش لەو لایەنـەوە نـایلێم کـە موعجیبی نەفسی خۆم بوبێتم، بەڵکو لـەو لایـەوە ئـەیلێم: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾[1].

ئەمە و داواکارم لە خوای بەرز و بەتوانا ئەم کردەوەیەم بە پاکی و پوختی بۆ وەجهی خۆی لێوەرگرتبێتم، إنه ولي ذلك والقادر عليه. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

عوسمان موحەممەد خەمیس

خوا لە خۆی و دایك و باوکی و موسڵمانان خۆشببێت

(١) واتە: وباسی ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگارت بکە و دەری بخە.

تو خوا ئەی خوێنەر و بیسەری کتێبەکانم
بە ماقوڵی و دانایەوە بڕوانە نوسینەکانم

هەڵەیەك دەبینی سڕبۆشیکە بە جاکی خۆت
خۆ گەر زیری ڕاستی کەوە خێرە بۆ خۆت

چندین سوار جاك کەوتن و کەوتنیان بۆنە بوو
جەندین شمشێر کول بوو بەڵکو کەلیش بوو

برام تاوانکار و هەڵەکارین هەر هەموومان
بۆزش خەڵکانی بەڕێز و جاك قبوڵە لایان*

---

* شیعرەکە بە عارەبی :

بِـالله يَـا قَارِئـًا كَتْبِـي وَسَـامِعَهَا    أَسْـبِلْ عَلَيْهَـا رِدَاءَ الحَكْـمِ وَالكَـرَمِ
وَاسْـتُرْ بِلُطْفِـكَ مَـا تَلْقَـاهُ مِـنْ خَطَـإٍ    أَوْ أَصْـلِحَنْهُ تُثَـبْ إِنْ كُنْـتَ ذَا فَهَـمِ
فَكَـمْ جَـوَادٍ كَبَـا وَالسَّـبْقُ عَادَتُـهُ    وكَـمْ حُسَـامٍ نَبَـا أَوْ عَـادَ ذُو ثُلَـمِ
وَكُلُّنَـا يَـا أَخِـي خَطَّـاءُ ذُو زَلَـلِ    وَالعُـذْرُ يَقْبَلُـهُ ذُو الفَضْـلِ وَالشِّـيَمِ

# چەند مەبەستێکی گرنگ لەبەردەم مێژوودا

مەبەستی یەکەم: چۆن مێژوو بخوێنینەوە؟

دووەم: لە مێژوودا کتێبی کێ بخوینینەوە؟

مەبەستی سێیەم: دەستەواژەی

مێژو نوسان لەشێواندنی مێژودا

# ڕێخۆشکار

یەکێك لە گەورەترین درۆکانی مێژوو، گومانی ئەو گومان لـە دلآنەیـە کـە وائەزانن هاوەلآنی پەیامبەر ﷺ ڕقیان لە یەکتر بووە ودوژمنایـەتیان لـە ئاسـت یەکتردا پەنهان کردووە!!

ئـای بەڕاسـتی گومـانێکی پوچـە، زۆر دوورە لـەوەی خـوای پـەروەردگار لەقورئاندا ڕوونی کردۆتەوە و دەفەرموێت: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّـهِ﴾ [آل عمران:١١٠]. واتـە: (بەڕاسـتی ئێـوە چاکترین ئومـەتێکن بـۆ خـەلکی هێنرابێتـە دی، فـەرمان بـە چـاکە دەکـەن و جلەوگیری لە خراپەیش دەکەن و باوەڕی دامەزراو و بەخوا دەهێنن). یـان ئـەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (خير الناس قرن[1])اتە: (باشـترینی خـەلك، خەلکانی سەردەمی منن).

یەکێك لە دیاردەکانی نامۆ بوونی ئیسلام لە دوای سـێ سـەردەمە بەچـاك دانراوەکەوە «القـرون المفضـلة»[2]، ئـەوەبوو کـە کۆمـەلێك نووسـەر دەرکـەوتن، مێژوویان شێواند و دەستکاریان کرد، ڕاستیەکانیان گۆڕی و دژایـەتیان کـرد، وا گومانیان دەبرد کە هاوەلآنی پەیامبەر ﷺ بـراو تـەبا نـەبوون لەگـەلْ یـەکتردا، بەسۆز و بەزەیی نەبوون بۆ یـەکتر، بـەلکو دوژمـنی یـەکتر بـوون و هەنـدێکیان

(١) (صحيح البخاري) كتاب الشهادات، باب لا يشهد على شهادة جور اذا أشهد حديث رقم (٢٥٠٩).

(٢) سەردەمی یەکـەم: سـەردەمی پەیامبـەر ﷺ و هاوەلـەکانێتی ﷺ، پاشـان سـەردەمی شوێنکەوتوان (التابعين) پاشان سـەردەمی شـوێنکەوتەی شـوێنکەوتوان (أتبـاع التـابعين) دێـت. (وەرگێڕ)

نەفرینی لەوی تریان کردووە، فڕوفێڵیان لە یەکتر کردووە، دووڕوو بوون لەگەڵ یەکتردا، هەندێکیان موئامەرەیان لە هەندێکی تریان کردووە، بە ستەم و زۆر و دوژمنایەتی و ئارەزو پەرستی و دونیا ویستی.

دەبەخوا درۆیان کرد و بوختانێکی ڕون و درۆیەکی زلیان هەڵواسی.

لەڕاستیدا ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبێر و ئەبو عوبەیدە و عائیشە و فاتیمە و باقی هاوەڵە بەڕێزەکانی تریش، لەوە بەڕێزتر و گەورەترن کە شتی ئاوهایان لێبوەشێتەوە. بەڵکو بەنی هاشم و بەنی ئومەییە لەوە بە وەفاتر بوون بۆ ئیسلامەکەیان و سیلەی ڕەحمەکەیان و خزمایەتیەکەیان، پەیوەندی نێوانیان لەوە توندتر بووە، لەوە زیاتر یارمەتیدەری یەکتر بوون لە بۆ کاری خێر. ئەوانەی کە لەسەر دەستیان فەتحی ناوچەکانی سەرزەوی کرا و گەلان بەهۆی تێکۆشان و بانگەوازیانەوە هاتنە نێو ئیسلامەوە. ئا ئەوانە کەسێکیان تێدا نیە، ئیلا پەیوەندی خزمایەتی یان ژن و ژن خوازی لەگەڵ بەنی هاشمدا هەیە.

بشزانە، سەلمێنەری ئەوەی کە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ باشترین خەڵکێکن کە مرۆڤایەتی لە دوای پەیامبەرانەوە بەخۆیەوە بینیویەتی، ئەو هەواڵە صەحیحانەیە کە خەڵکانی ڕاستگۆ و عادل گێڕاویانەتەوە. ئەو ڕیوایەتانەشی، کە ژیاننامەی هاوەڵان دەشێونن و وای دەگێڕنەوە کە هاوەڵان خەڵکانێکی نەفس نزم بوون، ئەوە ئەو ڕیوایەتانەیە کە هەواڵخوان (ڕاوی)ە درۆزنە دەم هەڵبەستەکان هەڵیان بەستووە.

بێگومان مێژووی موسوڵمانان پێویستی بە نوسینەوەیەکی سەر لەنوێ هەیە، بەوەرگرتنی لە سەرچاوە پاك و پوختەکانیەوە. بە تایبەتتر لەو جێگایانەی،

کە مێژوونوسە ناموسڵمانە هەواڵ هەڵبەستەکان نوسیویانەتەوە، لە کاتێکدا دەزانین، کە ئوممەتی ئیسلامیمان دەوڵەمەندترین ئوممەتە بە ناوەڕۆکی مێژووەکەی و هەمووی بە سەنەدی چەسپاو لە لەناوچون پاراستووە.

بەڕاستی مێژوونووسانی پێشینە چاکەکانمان دەست پێشخەریان کرد و ئەوەبوو پێش لەناوچونی ئەو هەواڵانە فریاکەوتن و پاراستیان. هەر هەواڵێك کە پێیان گەیشت نووسیانەوە، لە صەحیح و ضەعیف، لەگەڵ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی هەواڵەکەو ناوی هەواڵ خوانەکانی، بۆ ئەوەی خوێنەر لە بەرچاو ڕۆشنی دا بێت لە ئاست ڕاستی و ناڕاستی ئەو هەواڵانە. ئێستاش نۆرەی ئێمەی پاشین (خَلَف )ـە کە شوێن پێی پێشینە چاکەکانمان هەڵگرین و ئەو کتێبانە بپاڵێوین و ڕاست و ناڕاستەکانی و باش و خراپەکانی لەیەکتر جیاکەینەوە، تا بەمە ببینە باشترین پاشین بۆ باشترین پێشین، هەروەها با هەموو بزانن، کە لاپەڕەکانی ژیانی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ وەکو دڵیان وابووە لە بێوەیی و پاکی و پوختی دا. بەڕاستی ئوممەتی ئیسلامی وای لێهاتووە بێ بەش بووە لە زۆرترین چاوگەکانی هێزی خۆی، کە بریتییە لە باوەڕبوون بە مەزنێتی ڕابردووی، لە کاتێکدا ئەم ئوممەتە لە نەوەی پێشینێکن هەرگیزا و هەرگیز مێژوو ژیاننامەی لەوان پاکترو درەخشانتر و گەشاوەتری بەخۆوە نەبینیوە. **ئەو کەسەشی دەیەوێ لەبارەی مێژووەوە بنوسێت؛ ئەوە پێویستە لە ئاست ئەهلی هەق و خێردا بە ویژدان و سینە ساف بێت، شارەزایان بێت و شارەزای مافەکانیان بێت، و لێهاتو و کارامە بێت لە جیاکردنەوەی هەواڵخوانەکان و دروستی و نادروستی هەواڵەکاندا، دەستپاك و ڕاستگۆ بێ و بەدوای ڕاستیەکاندا بگەڕێت.**

# مەبەستی یەكەم: چۆن مێژوو بخوێنینەوە؟

ئەبێت مێژوو بخوێنینەوە وەك خوێندنەوەی فەرمودەكانی پەیامبەر ﷺ.

جا ئەگەر ئێمە بمانەوێت فەرمودەكانی پەیامبەر ﷺ بخوێنینەوە، دەبێت بگەڕێین بەدوای چەسپاوی هەواڵەكە، ئایا لە پەیامبەری خواوە هەواڵی وا چەسپاوە یا نەء؟

هەرگیزیش ناتوانین ڕاستی و چەسپاوی فەرمودەكانی پەیامبەر ﷺ لە هەڵبەستە و بێ بناغەكان جیا بكەینەوە، هەتا تەماشای سەنەد و دەقی هەواڵەكە نەكەین[1]. چونكە زانایان گرنگی زۆریان بە فەرمودە و

(١) ڕچە (سەنەد): زنجیرە كەسێكن پێكەوە بۆ دەقی فەرمودەیەك.

جا لەبەر ئەوەی لەم كتێبەدا پێویستیمان بە زانینی ئەم باسە وهاوشێوەكانی زۆر دەبێت بەنمونەیەك - ئەوانەی باسكراون لەم كتێبەدا- ڕوون دەكەمەوە: وەكو ئەم نموونەیە:

قال البخاري في صحيحه: حدثنا الحميدي عبد الله بن الزبير، قال: حدثنا سفيان، قال: حدثنا يحيى بن سعيد الأنصاري، قال: أخبرني محمد بن إبراهيم التيمي: أنه سمع علقمة بن وقاص الليثي، يقول: سمعت عمر بن الخطاب ﷺ على المنبر قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: « إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرىء ما نوى، فمن كانت هجرته إلى دنيا يصيبها، أو إلى امرأة ينكحها، فهجرته إلى ما هاجر إليه ».

جا هەر لە (قال البخاري)ەوە هەتاوەكو ئەوەی ئەڵێت: (سمعت رسول الله) پێی دەگوترێت سەنەد. و بە فەرمودەكەی پەیامبەری خوا ﷺ ((إنما الأعمال بالنيات..)) دەوترێت دەق (النص) و بە هەریەك لەوانەی ناویان هاتووە لە سەنەدەكەدا دەوترێت هەواڵخوان (ڕاوی).

(مرسل)یش ئەوەیە هەواڵەكە پاڵ بدرێتە پەیامبەرەوە ﷺ بەبێ ناوهێنانی سەحابیەكە یان ئەوەی سەروی تابعیەكە.

(مُدلّس)یش: بەو ڕاویە دەوترێ كە كاتێك باسەكە دەگێڕێتەوە تدلیس (گزی كردن یان فێڵكردن یان شاردنەوە) یەكی تێدا بەكار دەهێنێ، ئیتر یان ئەوەیە یەكێك لە ڕاویەكان كە دەزانێ ضعیفە ناوی

هەواڵخوانەکانی داوە و بەدوای فەرموودەکانیاندا ڕۆیشتوون و پاڵاوتوویانە، دوایش بڕیاریان لەسەری داوە و صەحیح و ضعیفیان لەیەکتر جیاکردۆتەوە، ئا لێرەشەوە فەرموودەکانیان لەو شتانە پاککردۆتەوە کە بە درۆوە یان بە تدلیسەوە[1] یان بەهەر شێوازێکی تر خراوەتە سەری.

بەڵام مێژوو جیاوازە، دەبینین زۆرێك لە ڕیوایەتەکانی مێژوو سەنەدی هەر نیە، جاری واش هەیە سەنەدی هەیە، بەڵام هیچ کام لەو ڕاویانەی کە لەناو ڕیواتەکەدا هەن ژیاننامەیان دیار نیە، هیچ یەکێکیش لەزانایان نابینین بە باشی یان بە خراپی ، بە مەدح و یان بەزەم (جرح و تعدیل) باسیانی کردبێت، جا لەم حاڵەتەشدا بڕیاردان لەسەر ئەو ڕیوایەتە قورسە، چونکە حاڵ و باری هەندێك لە پیاوانی سەنەدەکە نادیارن.

کەواتە کارەکە لێرەدا لە فەرمووده گرانترە، بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت کەمتەرخەمی تێدا بکەین، بەڵکو هەر دەبێت بەجوانی لێی ووردبینەوە و بزانین چۆن مێژووەکەمان وەردەگرین.

**لەوانەیە هەندێك بڵێن: خۆ ئەگەر ئاوها بکەین بەشێکی زۆری مێژوومان لەدەست دەڕوات !؟**

---

ناهێنێ و بەسەریدا دەڕوا، یان ئەوەتا بە ئاشکرا ناڵێ لە فلان کەسم بیستووە وەك بڵێ (حدثنا،= =أخبرنا، سمعت..) بەڵکو دەڵێ: (عن، أنّ، قال،..)، یان ئەوەتا ئەو کەسەی لێی دەگێڕێتەوە ناوی بە شێوەیەك دێنێ کە پێی ناناسرێتەوە، ئەمە ئەو شتانەن کە لەم کتێبەدا پێویستمان بە زانینی دەبێت. بۆ زیاتر بڕوانە کتێبەکانی زانستی فەرموودە. (وەرگێڕ)

(١) بۆ واتای تدلیس بڕوانە پەراوێزی لاپەڕەی پێشوو.

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر بەو شێوە نییە تۆ تەسەوری دەکەی، زۆرێك لەو ڕیوایەتە مێژوویانەی کە پێویستیمان پێ دەبێت - بەتایبەت لەم توێژینەوەماندا - هەمووی بەسەنەدەوە باسکراون، ئیتر ئەو سەنەدانە لە خودی کتێبەکانی مێژوودا بێت وەکو مێژووی (تەبەری)، یان لە کتێبەکانی فەرموودەدا بێت وەکو(صەحیحی بوخاری) و (موسنەدی ئیمام ئەحمەد) و (جامیعی تورمـوزی)و (موصەننەفی ئیبن ئەبی شەیبە)، یان لە کتێبەکانی تەفسیردا بێ، کە هەندێك ڕیوایاتی مێژوو بەسەنەدەوە دەگێڕنەوە، وەکو: (تەفسیری ئیبن جەریر) و (تەفسیری ئیبن کەسیر)، یان هەندێك جار لە کتێبە تایبەتییەکاندایە، کە باسیان لە ماوەیەکی تایبەت کردووە، بۆ نموونە کتێبی (حروب الردة)ی (الكلاعي) و (تاريخ خليفة بن خياط) کە پوختەیەکە.

**مەبەست ئەوەیە: گەر بمانەوێ بۆ ڕیوایەتێك لە ڕیوایەتەکان سەنەدێك بدۆزینەوە دانامێنین.**

ئەگەریش هاتوو دامـاین و نەمان توانی سەنەدێك بدۆزینەوە، ئەوکات بنچینەیەکی گشتیمان هەیە و کاری پێدەکەین، بە تایبەت لەوەی کە لەسەردەمی هاوەڵاندا ڕویداوە -کە بابەتی بەردەستمانە-، ئەو بنچینەیەش بریتیە لە: ستایشکردنی خواو پەیامبەرەکەیﷺبەسەر هاوەڵاندا، واتە ئەصل لە هاوەڵاندا عەدالەتە -وەك دواتر باسی لێوە دەکەین-.

هەر ڕیوایەتێکیش تانەو تەشەری تێدا بێت بۆ هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ چاوێك بە سەنەدەکەیدا دەخشێنینەوە:

- ئەگەر هاتوو صەحیح بوو، تەماشا دەکرێت بۆ ڕاڤەکردنی ڕیوایەتەکە و ئەوەی ڕیوایەتەکە مەبەستێتی.

- بەڵام ئەگەر هاتوو سەنەدەکەی ضعیف بوو یان هەر سەنەدی نەبوو، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ ئەصلەکەی خۆمان کە بریتیە لە: عەدالەتی هاوەڵان.

کەوابوو لەکاتی خوێندەوەی مێژوودا ئەبێت بەبژارکردن و پاڵفتەکردنەوە بخوێنینەوە، هەروەك چۆن فەرمودە دەخوێنینەوە، بەتایبەتتر مێژووی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ.

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیە، ئەڵێت: « ئەبێت مرۆڤ چەند بنەمایەکی گشتی (كُلّي) لەلا بێت، تا شتە جوزئیەکانی بۆلا بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی بە زانست و دادگەریەوە قسە بکات، دوای ئەوە ئەبێت بزانێت شتە جوزئیەکان چۆن بوون و ڕویانداوە، وەگەرنا لە جوزئیەکاندا دەکەوێتە درۆ و نەزانیەوە و لە گشتیەکانیشدا دەکەوێتە نەزانی و ستەمەوە، بەوەش خراپیەکی گەورە دەکەوێتەوە»[(١)].

بە داخەوە؛ زۆرێك ئەمڕۆ سەرسامی کتێبە مێژووییە تازە نوسراوەکان بوون، ئەو کتێبانەی کە بە زۆری بایەخ دەدەن بە ڕازاندنەوەی چیرۆکەکان، یا ناشیرکردنی شێوازەکان، یا هەردووکیان پێکەوە، بەبێ گوێدانە ڕاستی و چەوتی هەواڵ و باس و چیرۆکەکان.

وەکو کتێبەکانی (عەباس ئەلعەقاد)[(٢)].

---

(١) (مجموع الفتاوى) ( ١٩ / ٢٠٣ ) .
(٢) خاوەنی زنجیرە کتێبی( العبقریات ).

یان کتێبەکانی (خالد موحەممەد خالد)[١].

یان کتێبەکانی (تاها حوسێن)[٢].

یان کتێبەکانی (جۆرجی زەیدانی گاور)[٣].

یان...

جا ئەمانە کاتێك باس لە مێژوو دەکەن گرنگی بە دارشتن و ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی چیرۆکەکە دەدەن، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا ئەم چیرۆکە ڕاستە یا نە، بەڵکو هەندێکیان مەبەستیان ناشیرین کردنیشە، تەنها گرنگ ئەوەیە چیرۆکێکی خۆشت بۆ بەیان بکات.

**هەروەها لەو کتێبانەی کە پێویستە وریایی لێ بکرێ:**

١. (الأغاني لأبي الفرج الأصفهاني): خۆی کتێبەکە بریتیە لە دەمەتەقێ و شیعر و گۆرانی، بەڵام کۆمەڵێکی زۆر هەواڵی ناڕاستیشی تێ ئاخنیوە.

٢. (العِقْدُ الفَريد)لابن عبد ربه:

ئەمیش خۆی کتێبێکی ئەدەبیە، بەڵام گەلێك هەڵەی تێدایە.

٣. (الإمامة والسياسة)کە ئەدرێتە پاڵ ئیبن قوتەیبە، بەڵام بەدەمیەوە هەڵبەستراوە.

---

(١) خاوەنی کتێبی (خلفاء الرسول) و (رجال حول الرسول).

(٢) خاوەنی کتێبی (موقعة الجمل) و (علي وبنوه) و (الفتنة الكبرى).

(٣) خاوەنی کتێبی (تاريخ التمدن الإسلامی).

٤. (مروج الذهب)للمسعودي: ئەم کتێبەش سەنەدی تێدا نییە(بێ سەنەدە).

ئیبن تەیمیە: دەڵێ: (تاریخی مەسعودی ئەمەنـدە درۆی تێدایـە مەگـەر خـوا بزانێ، ئیتر چۆن بڕوا بکرێ بە حیکایـەتێکی سـەنەد پچـڕاو لـە کتێبێکـدا کـە ناسراوە بەوەی درۆی زۆری تێدایە)[١].

هەروەها ئیبن حەجـەر: ئـەڵێ: (و کتێبـەکانی وشـك هەڵگـەڕاوەن چـونکە شیعەیەکی موعتەزیلی بووە)[٢].

٥. (شرح نهج البلاغة) هی عەبدولحەمیدی کوڕی ئەبولحەدیدی موعتەزلی.

لە لای زانایانی جەرح و تەعدیل پیاوێکی ضعیفة، تەنانەت ئەگەر کەسـێك تەماشایەك بکات بزانێت بۆ ئـیبن ئـەبی ئەلحەدیـد هەسـتاوە بـە نوسـینی ئـەو کتێبەی، خۆی بە مولزەم دەزانێـت کـە لـە کتێبەکـە و خاوەنەکەشـی بکەوێتـە گومانەوە؛ لەبەر ئیبن عەلقەمی نوسیویەتی، ئەو ئیبن عەلقەمیەی کە بووە هـۆی کوشتنی (یەك ملیۆن) موسڵمان لە بەغداد بە دەستی تەتارەوە.

خوانساری[٣] لە بارەی ئـەو کتێبـەی ئـیبن ئـەبی ئەلحەدیـدەوە ئـەڵێ: (بـۆ خەزێنەی کتێبـەکانی وەزیـر موئەیەدئەلـدین موحەممـەدی کـوڕی ئەلعەلقـەمی نووسیویەتی)[٤].

(١) (منهاج السنة النبوية) (٤/٨٤).

(٢) (لسان الميزان) (٥/٥٣٢) مكتب المطبوعات الاسلامية .

(٣) خوانساری زانایەکی شیعەیە. (وەرگێڕ)

(٤) (روضات الجنات) للخوانساري (٥/٢٠ - ٢١).

تەنانەت زۆرێـك لـە زانایـانی شـیعەش سەرزەنشـتی خـاوەن كتێبەكـە و كتێبەكـەش دەكـەن؛ ئـەوەتا مـیرزا حـەبیبوڵڵای خـوئی -وەسـفی ئـیبن ئـەبی ئەلحەدید- ئەكات وئەڵێ: (كەسێكی نا شارەزا و نا كارامە بووە... و ڕەئی خراپ بووە و دید و بۆچونی بێ بازاڕ بووە... ئەو كابرایە ملە جـوڕێی زۆری كـردوە... ئەو كابرایە خەڵكێكی زۆری گومڕاكردووە و خۆیشی ڕێی وێڵ كردووە)[1].

سـەبارەت بـە كتێبەكەشـی؛ مـیرزا وەسـفی زۆری كـردوە، لـەو وەسـفانە: (لاشەیەكی بێ ڕۆح ... زۆر دەسوڕێ بەدەور توێك بە بێ باسـكردنی كـرۆك ... زۆر سودی نییە ... بەڕاستی جۆرە تـەئویلاتێكی دووری وای تێدایـە تەبیعـەت پێی تێك دەچێ و گوێ حەز لە بیستنی ناكا).

٦. (تاریخ الیعقوبی): ئەمەش كتێبێكە هەر هەمووی مورسەلە[2] سـەندی تێدا نییە و خاوەنەكەشی تۆمەتبارە.

* * *

---

(١-٢) انظر (منهاج البراعة شرح نهج البلاغة) للمیرزا حبیب الله الخوئي (١٤/١) طبعـة دار احیاء التراث العربي ـ بیروت.

(٢) بۆ زانینی مرسل بڕوانە (ل٢٨) پەراوێزی (١).

# مەبەستی دووەم: لەمێژوودا کتێبی کێ بخوێنینەوە؟

**٭ کەوابوو کتێبی کێ بخوێنینەوە؟**

**وەڵامەکەی ئەوەیە:** گەر دەتوانی و سەرت لەسەنەد دەرئەچێت و بۆت بژار دەکرێت؛ ئەوا کتێبەکەی ئیمامی تەبەری بخوێنەوە، بەڕاستی کتێبەکەی کۆڵەکەی ئەوانەیە لەسەر مێژوو دەنووسن.

ئەگەریش ناتوانی و بۆت جیا ناکرێتەوە ئەوا ئەمانە بخوێنەوە:

(البداية و النهاية)ی ئیبن کەسیر.

(تاريخ الإسلام)ی زەهەبی.

(العَوَاصِمُ مِنَ القَوَاصِمِ)ی ئەبوبەکر ئیبن ئەلعەرەبی، بەڕاستی لە باشترینی ئەو کتێبانەیە کە باس لەم فەترەیە بکات[1].

**هەروەها لەو کتێبە بە سوودە مێژوانەی کە لەم بارەیەوە نوسراون، ئەگەر چی کورت و پوختن بەڵام هەر بەسودن، وەکو:**

١. (مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري)ی دکتۆر یەحیا ئیبراهیم یەحیا.

٢. (الخلافة الراشدة والدولة الأموية من فتح الباري)ی دکتۆر یەحیا ئیبراهیم یەحیا.

٣. (تحقيق مواقف الصحابه من الفتن)ی دکتۆر موحەممەد ئەمحەزۆن.

٤. (عصر الخلافة الراشدة)ی دکتور ئەکرەم ضیاء ئەلعومەری.

---

(١) بە تایبەت ئەوەی کە محب الدين الخطيب تەحقیقی کردوە. (وەرگێڕ)

٥. (مرويات خلافة المعاوية في تاريخ الطبري)ي خالد غەيس.

٦. (الطبقات الكبرى)ی ئیبن سەعد، کتێبێکی زۆر گرنگە، چونکە نوسەر بە سەنەدەوە ڕیوایەت دەگێڕێتەوە.

٧. (تاريخ خليفة بن خياط) کتێبێکی پوختە و گرنگیەکی زۆری بە سەنەد داناوە.

٨. (تاريخ المدينة)ی ئیبن شەیبە، ئەمیش دیسانەوە کتێبێکی سەندداره.

٩. (أحداث وأحاديث فتنة الهرج) ی دکتۆر عەبدولعەزیز دخان.

١٠.(أخطاء يجب أن تصحح من التاريخ) ی دکتۆر جەمال عەبدولهادی و دکتۆره وەفاء جومعە.

*** لەکاتی خوێندنەوەی کتێبە مێژوویەکاندا لە چی وریا بین؟**

کاتێك کتێبە مێژووییەکان دەخوێنینەوە دەبێت وریای ئەوە بین ئێمەش لەگەڵ بۆچوونی نووسەردا لار نەبینەوە؛ چونکە ئەبێت تەماشای بنچینەی ڕیوایەتەکە بکەین نەك بۆچوونی نووسەرەکە، **دەبێت بە ویژدان و ئینسافەوە بخوێنینەوە. هەروەها لە کاتی خوێندنەوەی مێژووی هاوەڵانی پەیامبەردا ﷺ ئەبێت ئەم دوو شتە بزانین:**

**یەکەمیان:** ئەبێت ئەوە بزانین، کە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ باشترین کەسن لەدوای پەیامبەران -عليهم السلام- چونکە خوای پەروەردگار مەدحی کردوون، و پێغەمبەری خواش ﷺ مەدحی کردوون، و لە چەندین فەرموودەدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوان باشترین کەسن لە دوای پەیامبەران -عليهم السلام-.

**دووەمیان: دەبێت بزانین هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ مەعصوم نین.**

بەڵێ ئێمە ئەڵێین ئیجماعیان عیصمەتی هەیە، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین: هەرگیز هەموو ئوممەتەکەی لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە[1]، کەواتە ئەوان لەوە مەعصومن کە هەر هەموویان لەسەر گومڕایی کۆببنەوە، بەڵام وەکو تاك نەخێر مەعصوم نین، چونکە مەعصومیەت تەنها بۆ پەیامبەران و فریشتەکانە، جگە لەوان بڕوامان بە مەعصومیەتی هیچ کەسێکی تر نیە.

جا لەم کتێبەماندا هەوڵئەدەین بەوپەڕی تێکۆشانەوە بۆ جیاکردنەوەی ڕاستیەکان و ڕوحیەکان، خۆشەویستیمان بۆ هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ هەرگیز نەبووە و نە ئەبێتە هۆکارێك بۆ شاردنەوە و پشتگوێ خستنی ڕاستیەکان، عەیبیش لەمەدا نابینین، ئەمەش دوای پرس و ڕاوێژمان بەو زانا و مامۆستایانەمان، کە جێی متمانەمانن.

ئەڵێم: هیچ عەیبێك نابینین لەوەی مرۆڤ ڕۆبچێت لەم جۆرە باسانەدا، بەڵکو عەیب ئەوەیە مرۆڤ ڕۆبچێت بە نەزانینەوە یا بە نیەت خراپیەوە، یان بە هەردووکیانەوە پێکەوە، بەڵام گەر هاتوو ڕۆچوونەکە بە زانین و دادگەریی و ئینساف و لەخوا ترسیەوە بوو، ئەوەندەی بۆم دەرکەوتووە هیچ ڕێگرێك نییە لە نەکردنی.

---

(١) أخرجه أحمد في (مسنده) من طريق أبي بصرة الغفاري، (٣٩٦/٦ رقم ٢٦٦٨٢). وأخرجه ابن ماجه -كتاب الفتن- باب السواد الأعظم (٣٦٧/٢) حديث رقم (٣٩٩٨). و ابن أبي عاصم في (السنة)- باب ما ذكر من أمر النبي بلزوم الجماعة (ص ٣٩ رقم ٨٠) من حديث أنس بن مالك. وصححه الشيخ الألباني في صحيح السنن.

**کەواتە:** ئەبێت هاوەڵان بە باشترین کەس بزانین، بەڵام ئەبێ بشزانین کە مەعصومیش نین. ئەوەش کە لە هەندێکیانەوە وەشاوەتەوە هەڵەیە (خطأ)ـە نەك (خطیئـة)[1] ئەم دووانەش دوو شتی جیاوازن. جا هەر ڕیوایەتێکت بینی تانە و تەشەری دەدا لە هاوەڵێك، نە زوو بەرپەرچی بدەرەوە، نە ڕاستەوخۆ قبوڵی بکە، تا تەماشای ڕیوایەتەکە دەکەین، ئەگەر سەنەدەکە صحیح بوو ئەوا لەو بەشەیە کە ئەوان پارێزرا و(معصوم) نین لە هەڵەوکورتی، وەکو هەر مرۆڤێکی تر هەڵە دەکەن، خۆ ئەگەریش سەنەدەکە ضعیف بوو، ئەوا هەر لەسەر ئەصلەکە بمێنەوە، کە ئەوان باشترین کەسن لەدوای پەیامبەران -علیهم الصلاة والسلام-.

سەبارەت بەمەدحی خوای مەزن بۆ هاوەڵان، ئەو فەرمایشتەی پەروەردگارە، کە ئەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا﴾[الفتح:٢٩].

واتە: (موحەممەد نێردراوی خوایە، ئەوانەشی لەگەڵیدان زۆر توندو تیژن بەرانبەر بێ باوەڕان و، بە بەزەیی ومیهرەبانن بەرامبەر بە یەکتری، دەیان بینیت، خەریکی کڕنوش و سوژدە بردنن، هیوایان بەدەستهێنانی فەزڵ و بەهرە و ڕەزامەندی خوایە، نیشانەیان وا بە ناوچاویانەوە لە ئەنجامی سوژدە بردنیان و عیبادەت کردنیان، ئەمە نمونەو وەسفیانە لە تەوراتدا، نمونەشیان لەئینجیلدا وەکو

(١) (خطأ): هەڵەکەی بە ئەنقەست نەکردووە، بەڵام (خطیئة) هەڵەکەی بە ئەنقەست کردووە. بڕوانە (النهایة في غریب الحدیث) باب الخاء مع الطاء. (الصحاح) مادة خطأ، و غیرهم. (وەرگێڕ)

ڕوەکێك وایە تازە چەکەرەی کردبێ و سەوز بوو بێت، ئەنجا چەکەرەکەی بەهێز کردبێ و قاییم بووبێ و لەسەر لاسکەکەی ڕێك و قنج ڕاوەستابێ، ئەوەندە جوان بێ جوتیارەکانی سەرسام کردبێ، ئەم وەسفە بۆ ئەوەیە خوا کافرانی پێ داخ لەدڵ بك[1] جا خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە، بە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە). لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار مەدحی سەرجەمی هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ دەکات، کەواتە ئەصل لە هاوەڵاندا -ڕەزای خوایان لێبێت- مەدح کردنە. هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: «لاتسبوا أصحابي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلا نَصِيفَهُ»[2].

واتە: (جوێن و قسە بە هاوەڵانم مەڵێن، [سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە][3] ئەگەر یەکێکتان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێ ناگاتە مشتێکی ئەوان بەڵکو نیوە مشتێکیشیان). ئەوە وەسف و مەدحی پەیامبەری خوایە ﷺ بۆ هاوەڵەکانی خۆی ڕەزای خوایان لێبێ.

---

(١) جا ئیمامی مالیك: ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە لەسەر کافر بوونی ئەوانەی کە ڕقیان لە هاوەڵانە -ڕەزای خوایان لێبێ-، دەڵێ: چونکە ڕقیان لە هاوەڵانە، هەر کەسێکیش ڕقی لە هاوەڵان بێت بەپێی ئەم ئایەتە کافرە، کۆمەڵێك لە زانایانیش لەگەڵ ئەم بۆچوونەی ئیمامی مالك دان. بڕوانە تەفسیری ئیبن کثیر بەرگی٧ ل٢٨٠. هەروەها بڕوانە: صب العذاب على من سب الأصحاب للآلوسي. (وەرگێڕ)

(٢) متفق عليه: (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب لو كنت متخذا خليلا، حديث (٣٦٧٣)، (مسلم) فضائل الصحابة، باب تحريم سب الصحابة ﷺ، حديث(٢٥٤٠).

(٣) ئەوەی نێوان هەردوو کەوانەکە زیادەی خۆمن و لە عەرەبیەکەدا ئەم لەفزەی ڕیوایەت نەکردووە، بەڵام زیادەیەکی صەحیحە. (وەرگێڕ)

-إن شاءالله- لە باسی (عەدالەتی هاوەڵاندا) بە تێرو تەسەلی باسی لێوە دەکەین.

ئەبو موحەممەدی قەحتانی لە (نونیەکەی) خۆیدا ئەڵێ:

لاَ تَقْبَلَنْ مِنَ التَّوَارِخِ كُلَّ مَا    جَمَعَ الرُّوَاةُ وَخَطَّ كُلُّ بَنَانِ
ارْوِ الحَدِيثَ الْمُنْتَقَى عَنْ أَهْلِهِ    سِيَّمَا ذَوِي الاحْلامِ وَالاسْنَانِ
كَابْنِ الْمُسَيِّبِ وَالعَلاءِ وَمَالِكٍ    وَاللَّيْثِ وَالزُّهْرِيِّ أَوْ سُفْيَانِ(١)

یانی: ئەگەر مێژویەکی ڕاستت دەوێ، ئەو مێژووەیە کە ئەمانە و هاوشێوەکانیان ڕیوایەتی دەکەن لە متمانە پێکراوەکانەوە (وەکو سەعیدی کوڕی موسەییب و عەلاء و مالیك و لەیس و زوهری وسفیان و هتد...)، نەك ئەوەی زۆرێك لەوانەی، کە تانەو تەشەر لە سیرەتنامەی هاوەڵان دەدەن ئەیڵێن: (بەڕاستی مێژوومان ڕەش و تاریك و لێڵە)!!

نەخێر بە دڵنیاییەوە وا نیە. ئێمە مێژوومان سپی وپاکە، جوانە، خاوێنە، مرۆڤ چێژ لە خوێندنەوەی وەردەگرێت.

*** هەرکەسێکیش زیاتری دەوێت، با بگەڕێتەوە بۆ کتێبە مێژووییەکان:**

وەکو (تاريخ الأمم و الملوك) کە بە (مێژووی تەبەری) ناسراوە.

یان (البداية والنهاية)ی ئیبن کەسیر.

---

(١) (نونية القحطاني) الأبيات (١٧٩ - ١٨١).

یان (تاريخ الإسلام)ی زەهەبی.

وباقی کتێبە مێژوویە متمانە پێکراوەکانی تریش.

جا (مێژووەکەی ئیمامی تەبەری) بەگرنگترین کتێبی مێژووی ئیسلامی دادەنرێت، زۆرجاریش خەڵك لە ئەمەوە ڕیوایەت دەکەن، هەم ئەهلی سوننەت و هەم ئەهلی بیدەعیش ڕیوایەتەکانی دەگێڕنەوە و بە بەڵگەی دەهێننەوە، باشە تۆ بڵێی هۆی چی بێ مێژووەکەی تەبەری دەخرێتە پێش هەموو مێژووەکانی ترەوە؟!

**«مێژووی تەبەری» یش پێش دەخرێت لەبەر زۆر شت لەوانە:**

١. نزیکی سەردەمی ئیمامی تەبەری لەو ڕوداوانە.

٢. ئیمامی تەبەری بەسەنەد ڕیوایەتەکان دەگێڕێتەوە.

٣. گەورەیی ئیمامی تەبەری و پایە زانستیەکەی[1].

٤. زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی تر لەویانەوە وەرگرتووە.

کەوابوو، هەر کە ویستمان لە مێژوودا شتێك بخوێنینەوە، ئەوا با ڕاستەخۆ بڕۆین بۆ لای ئیمامی تەبەری -رحمه الله-، بەڵام هەر وەك وتم، هەم ئەهلی

---

(١) تەبەری: ناوی موحەممەدی کوڕی جەریری کوڕی یەزیدە، (ئەبو جەعفەری تەبەری) پێ دەڵێن، موفەسیر و موحەدیس (فەرمودەناس) و مێژوونووس و شارەزا و ئوصولییەکی زۆر بەناوبانگە، پێشەوایەکی موجتەهیدە لە ساڵی (٢٢٤ هـ) لە (تەبرستان) لە دایك بووە و لە ساڵی(٣١٠ هـ) کۆچی دوایی کردووە، لە کتێبەکانی: (تاريخ الامم والملوك) و ( جامع البيان في تأويل آي القرآن). ئیمامی زەهەبی ئەڵێ: (كان ثقة حافظا، رأسا في التفسير، إماما في الفقه و الاجماع والاختلاف، علاّمة في التاريخ وأيام الناس، عارفا بالقرآت و غير ذلك ) ت.و (سير أعلام النبلاء) (١٤/٢٧٠ ).

سووننە شت لە مێژووەکەیەوە وەردەگرن، هەم ئەهلی بیدەعیش بەهەمان شێوە ئەوەی لێ دەبەن کە ڕێکە لەگەڵ مەزهەبەکەیان، ئیدی چۆن ئەم دوو شتە بگونجێنین؟!

ئەوەی ئیمامی تەبەری: لە باقی مێژوونووسانی تر جیا دەکاتەوە ئەوەیە ـ وەکو باسم کرد ـ قسە ناکات مەگەر بەسەنەد نەبێت، جا ئەهلی سوننە سەنەدە صەحیحەکانی تەبەری وەردەگرن، بەڵام ئەهلی بیدەع صەحیح و ڕاست و ضەعیف وەردەگرن، گرنگ ئەوەیە لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەواندا بگونجێ. کە ئاوهابوو پێویستە شێواز و ڕێباز (منهج )ی ئیمامی تەبەری بزانین لە نوسینەوەی «مێژووەکەیدا».

*** مەنهەجی ئیمامی تەبەری لە نوسینەوەی مێژووەکەیدا:**

بەڕاستی ئیمامی تەبەری -رحمه الله- بێخەم و ئاسودەمان دەکات لەم مەسەلەیەدا، بەو پێشەکیەی کە بۆ کتێبەکەی نووسیویەتی، خۆزگە ئەوانەی ئەو مێژووە دەخوێننەوە ئەو پێشەکیەش بخوێننەوە[1].

ئیمامی تەبەری -رحمه الله- لە پێشەکی مێژووەکەیدا دەڵێت:

**«با ئەو کەسەی ئەم کتێبەمان دەخوێنێتەوە بزانێت، هەموو ئەو شتانەی لێرەدا باسم کردوون و بە مەرجم گرتوون لێرەدا بینوسمەوە، تەنها پشتم بەستووە بەو هەواڵانەی کە ڕیواتکراون و باسم کردوون، لەگەڵ ئەو فەرمودانەی کە پاڵم داون بە خاوەنەکانیانەوە، جا ئەم کتێبەم هەر هەواڵێکی**

(١) بەڵکو پێویستە هەموو کەسێك، کە کتێبێك دەخوێنێتەوە پێشتر پێشەکی کتێبەکە بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئاگاداری ئەو ڕێباز و شێوازە بێت کە نووسەر گرتویەتیە بەر.

**تێدا بێت کە لەوانەی پێش خۆمانەوە ڕیوایەتمان کردووە و ئەبێتە جێی نارەزایی خوێنەری و بێزاری بیسەری، لەبەر ئەوەی ئەو ڕیوایەتانە نە صەحیحن و نە هیچ واتایەکیشیان لە هەقیقەت و واقیعدا هەیە، جا با بزانرێت ئەوە لەلایەن ئێمەوە نەبووە، بەڵکو لەلایەن هەندێك لە هەواڵخوانەکانەوە هاتووە، کاری ئێمە تەنها گواستنەوەی ئەوانە بووە بەو شێوەی بۆمان گوازراوەتەوە و بە دەستمان گەیشتووە»**[1].

وا ئەزانم ئیمامی تەبەری بەم پێشەکیەی کتێبەکەی بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆی تۆی خوێنەر!!

ئەوەتا پێت ئەڵێ: ئەگەر لەم کتێبەمدا هەواڵێکت بینی پێی نارازی بوویت و بەناماقوڵت زانی، ئەوە تەماشای ئەوانە بکە وا لێیانەوە ڕیوایەتمان کردووە، بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی ئەودایە، لەسەرمە ناوی ئەوانە بهێنم بۆیان گێڕاومەتەوە، ئەگەر جێی متمانە بوون قبوڵی کە وەگەرنا قبوڵی مەکە.

ئەم کارەش زۆربەی فەرموودەناسەکان پێی هەستاون، هەر بۆیە کە دەگەڕێیتەوە بۆ کتێبەکانی فەرمووده بێجگە لەهەردوو (صەحیحی بوخاری و موسلیم) نەبێت کە پەیمانیان داوە جگە لە صحیح ڕیوایەت نەکەن.

بۆ نموونە کە بگەڕێیتەوە بۆ: (جامع الترمذي)، یان ( سنن أبي داوود)، یان (الدارالقطني)، یان (الدارمي)، یان (مسند أحمد) و...کتێبەکانی تریش، دەبینیت تەنها سەنەدەکە باس دەکەن و بە مەرجیان نەگرتووە تەنها صەحیحەکان

---

(١)(مقدمة تاريخ الطبري) (ص٥).

دەربهێنن، تەنها باسی سەنەدەکەیان کردووە، بۆیە پێویستە بڕۆیت تەماشای سەنەدەکە بکەی، گەر سەنەدەکە صەحیح بوو قبوڵی بکە، وەگەرنا نەخێر.

لێرەشدا تەبەری پەیمانی نەداوە تەنها هەواڵە ڕاستەکان بگێڕێتەوە، تەنها پەیمانی ئەوەی داوە ناوی ئەو کەسانە بهێنێت کە هەواڵەکانیان لێوە دەگێڕێتەوە.

ئیبن حەجەریش -رحمه الله- باسی ئەم مەنهەجە دەکات، کاتێك ئاماژە بە ڕێباز و مەنهەجی زۆربەی کۆنەکان دەکات، ئەڵێ: (زۆربەی فەرمودەنەسەکانی سەردەمی کۆن، لە ساڵەکانی دوو سەد بەرەو سەرەوە، کە بە سەنەدەوە باسی فەرمودەیەکیان کردووە، وایان زانیوە ئیتر ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوە و بەرپرسیارێتیان لەسەر نەماوە)[1].

کەوابوو هیچ بەرپرسیاریەتیەك لە ئەستۆی ئیمامی تەبەریدا -رحمه الله- نەماوە.

**جا ئیمامی تەبەری لە کتێبی مێژووەکەیدا، زۆر جار لە پیاوێکەوە ڕیوایەت دەکات کە ناوی لوطی کوڕی یەحیایە و کونیەکەی (ئەبو میخنەفە).**

ئەم لوطی کوڕی یەحیایە، تەبەری رحمە الله (پێنج سەدو هەشتا و حەوت) ڕیوایەتی لێ دەگێڕێتەوە.

---

(١) (لسان الميزان) (١٢٨/٤) ترجمة الطبراني صاحب المعاجم الثلاثة.

ئەم ڕیوایەتانەش لە وەفاتکردنی پەیامبەری خواوە ﷺ دەست پێدەکات هەتا خیلافەتی یەزید، ئەمەش ئەو ماوەیەیە کە لەم کتێبەماندا باسی لێوە دەکەین، لە گرنگترینیان :

١. سەقیفەی بەنی ساعیدە.

٢. چیرۆکی شورا.

٣. هەمو ئەو شتانەی کە خەوارج بەهۆیەوە هەستان و کردیانە سەر عوسمانرضي الله عنه.

٤. کوشتنی عوسمان.

٥. خیلافەتی عەلیرضي الله عنه.

٦. جەنگی جەمەل.

٧. جەنگی صِفّین.

٨. تەحکیم.

٩. جەنگی نەهرەوان.

١٠. خیلافەتی موعاویە رضي الله عنه.

١١. کوشتنی حوسێن رضي الله عنه.

لە هەر یەکێکی ئەم ڕوداوانەدا ڕیوایەتێکی ئەبی میخنەف هەیە، هەر ئەم ڕیوایەتانەشن کە ئەهلی بیدەع پشتی پێ دەبەستن و بایەخی پێدەدەن.

ئەم ئەبو میخنەفە، ئیبن موعین لە بارەیەوە دەڵـێ: ( لـیس بشـيء ) هـیچ نییە.

ئەبو حاتیم دەڵێ: ( متروك الحديث ) فەرموودەكانی واز لیٚ هێنراوە.

جارێكی تر هـەر لـەبارەی ئەمـەوە پرسـیاری لێكـرا، ئـەوەبوو دەسـتی ڕاتەكان و وتـی :

(بۆ كەس هەیە پرسیار لە بارەی ئـەوەوە بكـا) [پێویسـت بـە پرسـیاركردن ناكات].

دارە قوتنـیش ئەڵێ: (ضعيفـه).

ئـیبن حیببـان ئـەڵێ: (يـروي الموضـوعات عـن الثقـات) فـەرموەدە هەڵبەستراوەكان لە خەڵكانی سیقەوە دەگێڕێتەوە.

زەهەبیش ئەڵێ: (إخباري تالف، لا يوثق به)[1].

**بۆیە ئەگەر «مێژووی تەبەری»ت كـردەوە و ڕیوایـەتێكت بـینی تانـە و تەشەری دەدا لـە هـاوەڵانی پەیامبـەر ﷺ و بینیـت لـە ئـەبو میخنەفـەوە ڕیوایەتی كردووە، ئەوا پێویستە وەلای نێی!**

لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی ڕیوایەتی ئەبو میخنەفە!

ئەم ئەبو میخنەفەش، بیدعە و درۆكردن و زۆری ڕیوایـەتكردنی لـە خۆیـدا كۆكردۆتەوە.

---

(١) (الجرح والتعديل) (١٨٢/٧)، (ميزان الإعتدال) (٤١٩/٣)، (لسان الميزان)(٤/ ٤٩٢).

کەواتە موبتەدیعێکی زۆر درۆزنی زۆر ڕیوایەتکەره!!

جا ئەبو میخنەف خۆی بەتەنها نیە، بەڵکو ئەم ناودارترینیانە، وەگەرنا هی تریش هەن ئەمسالی: (واقیدی)[1] کە وازلێهێنراو (متروك)ــە و تۆمەتباریشــە، ڕاستە مێژوو ناسێکی گەورە و حافزە و زانایــە لــەبواری مێــژوودا، بــەڵام جێــی متمانە نیە. سێیەم: (ســەیفی کــوڕی عومــەری تــەمیمی)[2]، بەهــەمان شــێوە ئەمیش مێژووناسێکی ناسراوە، بەڵام وازلێهێنراو (متروك )ە و تۆمەتبارە.

(ئەلکەلبی)یش[3] بە هەمان شێوە، درۆزنێکی بەناوبانگــە، بۆیــە پێویســتە مرۆڤ هەمیشە بە دوای ڕیوایەتی ئەمانە و هاوشێوەکانیاندا بگەڕێ و تەئکیدیان لێبکاتەوە.

❊ ❊ ❊

---

(١) (سير أعلام النبلاء) (١٧٢/٩).
(٢) أنظر ترجمته في (ميزان الإعتدال)(٢٥٥/٢)، و (تهذيب التهذيب) (٢٩٥/٤).
(٣) ترجمة (محمد بن السائب الكلبي) في (ميزان الإعتدال) (٥٥٦/٣)

# مەبەستی سێیەم: دەستەواژەی مێژوونوسان لە شێواندی مێژودا؟

## ١. هەڵبەستن و درۆکردن:

لە خۆیانەوە چیرۆکێك هەڵدەبەستن، بۆ نمونە وەکو چۆن چیرۆکێکیان لەسەر دایکە عائیشە هەڵبەستوە -ڕەزای خوای لێبێ- کە کاتێك هەواڵی کوشتنی عەلی ﷺ یان پێداوە [لە خۆشیان] سوژدەی شوکری بۆخوا بردووە.

ئەم چیرۆکەش درۆیە [و ئەسڵی نیە][1].

## ٢. زیادە خستنە سەر ڕووداوەکان یان لێ کەم کردنەوەی بە مەبەستی تێکدان و شێواندن:

لێرەدا پێدەچێ بنچینەی ڕووداوەکە ڕاست بێت وەکو ڕووداوی (سەقیفە)، جا ڕوداوی (سەقیفە) ڕاستە و لەوێدا کۆبوونەوە لە نێوان ئەبوبەکر و عومەر و ئەبو عوبەیدە لە لایەك وحوبابی کوڕی مونزیر و سەعدی کوڕی عوبادە و هەندێکی تری پیشتیوانان لە لایەکی ترەوە ڕوویداوە.

بەڵام ئەوان هاتوون کۆمەڵێ شتی وایان خستۆتە سەری -کە دواجار باسی لێوە دەکەین- ویستوویانە ئەو ڕاستیە بشێوێنن.

---

(١) أبو الفرج الاصبهاني لە کتێبي (الأغاني) (ص ٥٥) هێناویەتی، جا ئەم ئەبولفەرەجە، شیعەیە و تۆمەتبارە بە درۆکردن، هەروەکو لە باسی ژیانیدا هاتووە لە (تاریخ بغداد) و (المیزان)یشدا، هەروەها تیجانیش -کە خۆی کردووە بە شیعە- لە کتێبی: (فاسألوا أهل الذکر) (ص٩٧) هێناویەتی و نەیووتوە لە کوێوە هێناویەتی و کێ ڕیوایەتی کردووە.

### ٣. لێکدانەوە «تأويل»ی پوچ و نابەجێ بۆ ڕووداوەکان:

بەوەی هەوڵدەدات تەئویلێکی پوچ و نابەجێی وا بۆ ڕووداوەکە بدۆزێتەوە کە لەگەڵ هەواو ئارەزو و بیروبۆچوونی خۆیی و ئەو مەزهەبەی لەسەریێتی بگونجێ.

### ٤. دەرخستنی عەیبە و هەڵەکان:

لێرەشدا پێدەچێت چیرۆکەکە [یان باسەکە یان ڕووداوەکە] ڕاست بێت، بەڵام لە هەر کوێیەك هەڵەیەك یا عەیبەیەکی تێدا بێت، تەرکیزی لەسەر دەکا و دەری دەخا، لە هەمان کاتدا لایەنە چاکەکانی دەشارێتەوە.

### ٥. دروستکردنی شیعر بۆ پشتگیری کردنی ڕووداوە مێژووییەکان:

یەکێکیان هەڵدەسێ و شیعرێك دەنوسێ و، پاشان دەیداتە پاڵ ئەمیری ئیمانداران عەلی، یا دایکی ئیمانداران عائیشە، یا زوبەیر یان تەڵحە ڕەزای خوا لە هەموویان بێ، لەسەر تانەو تەشەر دان لە هاوەڵان، هەروەکو چۆن شیعرێکیان داوەتە پاڵ ئیبن عەبباس، کە لە بارەی دایکی ئیمانداران ڕەوە ووتویەتی:

تَبَغَّلْتِ تَجَمَّلْتِ وَلَوْ شِئْتِ تَفَيَّلْتِ[1]

### ٦. دانانی کتێب و نامەی ساختەکراو:

هەروەك -إن شاء الله- دوایی لە چیرۆکی کوشتنی عوسماندا دێتە پێشمان، کاتێك کە چەندین نامە بە ناویەوە ساختەکرا، هەروەها چەندینی تریش بەناوی

(١) واتە سواری هێستر بووی پاشان حوشتر، ئەگەر بتەوێ سواری فیلیش دەبی، یانی: بۆ شەڕ و ئاژاوە نانەوە.

عائشەوە ساختە کرابوو، چەندینی تر بەناوی عەلی و تەڵحە و زوبەیرەوە ﷺ ساختە کراوە.

ئەمە بێجگە لەو کتێبانەی دەنوسرێن و ساختە دەکرێن ، وەکو کتێبی (نهج البلاغة) کە دراوەتە پاڵ عەلی کوڕی ئەبو تالب ﷺ، یان کتێبی (الإمامة والسياسة) کە دراوەتە پاڵ ئیبن قوتەیبە[1].

## ٧. قۆستنەوەی هاوشێوەیی ناوەکان:

بۆ نموونە دوو ئیبن جەریر هەیە:

**یەکەم:** موحەممەدی کوڕی جەریری کوڕی یەزیدە، کە (ئەبو جەعفەری تەبەری) پی دەڵێن، پێشەوایەکە لە پێشەوایانی ئەهلی سوونە.

**دووەم:** موحەممەدی کوڕی جەریری کوڕی ڕۆستەمە، ئەمیش هەر (ئەبو جەعفەری تەبەری) پێ دەڵێن، پێشەوایەکە لە پێشەوایانی شیعە[2].

ئەڕۆن کتێبەکانی ئیبن جەریرە شیعیەکە دەدەنە پاڵ ئیبن جەریرە سونیەکە، لەوانە کتێبی: (دلائل الامامة الواضحة ونور المعجزات)، هەردوکیشیان لە هەمان ساڵی ٣١٠ ك وەفاتیان کردووە.

هەروەها ئیبن حەجەریش دوانن:

**یەکەمیان:** ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی حەجەری عەسقەلانیە، کە یەکێکە لە پیشەوایانی فەرمودە.

---

(١) أنظر: مقدمة تأويل مشكل القرآن لابن قتيبة تحقيق سيد أحمد صقر ص ٣٢. و(مقدمة الميسر والقداح) لابن قتيبة تحقيق محب الدين الخطيب.

(٢) (لسان الميزان) في ترجمة محمد بن جرير بن رستم (٢٩/٧).

**دووەمیان:** ئەحمەدی کوڕی حەجەری هەیتەمیە، پێشەوایە لە فیقهدا بەڵام لە فەرموودەدا لێهاتوو نییە، هەروەها چەندین هەڵەی دیاری هەیە، وچەندین ڕەخنەی لەسەرە.

بۆیە ئەڕۆن ئەو فەرمودانەی هەیتەمی بە صەحیحی داناوە دەیدەنە پاڵ عەسقەلانی.

**❊ کەی ڕێبازی لێکۆڵینەوە لای ئەهلی سوونە دەستی پێکرد؟**(١)

لەگەڵ کەوتنەوەی فیتنە دەستی پێکرد، هەروەکو شوێنکەوتوی پایەبەرز پێشەوا (موحەممەدی کوڕی سیرین) -ڕەحمەت و ڕەزای خوای لێبێ- ئەڵێت:

(هەرگیز پرسیاری سەنەدیان نەدەکرد، بەڵام کە فیتنە کەوتەوە، ئەیانووت: کوا لە کێتان بیستووە؟ ! ناوی ئەو پیاوانە بێنن کە لێوەیتان بیستوون؟

ئیتر تەماشا دەکرا گەر ئەهلی سوننە بوایە فەرموودەکانیان وەردەگیرا، ئەگەریش ئەهلی بیدەع بوایە لێی وەرنەدەگیرا)(٢).

چونکە ئەصڵ وایە هەموو کەسێك جێی متمانەیە؛ جا ئیبن سیرینیش لە گەورە تابعیەکانە، گەیشتۆتە ژیانی هاوەڵان، لەگەڵ گەورە و بچوکی تابعیەکاندا ژیاوە. مەبەستیش لە فیتنە لێرەدا دەرکەوتنی گروپە گومڕاکانە لە کۆتایی خیلافەتی عوسمان.

---

(١) مەبەست لە ڕێبازی لێکۆڵینەوە: لێکۆڵینەوەیە لە سەرچاوەی هەواڵ و فەرموودەکان و صحیح و زەعیفی، هەروەها گرنگی دان بە ڕاویەکان و لەوەی کە دەیگێڕنەوە، ئەمەش بۆ پاراستنی فەرموودەکانی پەیامبەر ﷺ لە درۆی درۆزنان و تێ ئاخنی ناحەزان و حەزی ئەهلی هەوا و ئارەزووبازان. (وەرگێڕ)

(٢) مقدمة (صحيح مسلم) (١٥/١)، باب بيان أن الإسناد من الدين.

**❊ زەرورەتی لێکۆڵینەوە لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا:**

خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەستورێکی زێڕینی بۆ داناوین، کەم کەس هەستی پێ دەکات، کە بریتیە لە ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾ [الحجرات:٦].

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوناهکارێك هەواڵێکی بۆ هێنان، ئەوا لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەك زیان بە خەڵکی بگەیەنن بە نەزانیەوە، ئەوسا پەشیمان بنەوە لەو کارەی، کە کردوتانە).

بەمەش گەڕان بەدوای ڕاست و دروستی هەواڵەکان پێویست بوو.

❊ ❊ ❊

# ڕێخۆشکار

## هاتنی پەیامبەر ﷺ

لە ڕۆژی دووشەممە لە دوازدەی ڕەبیعولئەوەلد[1] خوای پەروەردگار منەت و نیعمەتی خۆی ڕشت بەسەر هەموو مرۆڤایەتی دا، بە لە دایکبوونی سەروەر و ڕێنووییکاری مرۆڤایەت[2]، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیبی هاشمیی قورەیشیی، بە هەتیویی هاتە دنیاوە، دوای شەش ساڵ یەتیمی باوك و دایکیش بوو، لەسکی دایکدا بوو باوکی وەفاتی کرد، کە تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ دایکیشی وەفاتی کرد، ئیتر دوای ئەوان عەبدولموتەلیبی باپیری بەخێوی کرد، ئەویش دوای دووساڵ وەفاتی کرد، ئینجا ئەبو تالبی مامی ئەرکی بەخێوکردنی گرتە ئەستۆ.

کە تەمەنی گەیشتە چل ساڵی خوای پەروەدگار بە مژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانەی کرد، ئەمیش هەستا بەگەیاندنی پەیامەکە بەجوانترین شێوە، ئەوەی پەروەردگار فەرمانی پێکرد دەست بەجێ گەیاندی، بۆ ئەوەی خەڵك لە تاریکیەوە دەربهێنێت بۆ ڕوناکی، ئەوەبوو گەورەو دەم سپیەکانی قەومەکەی هەستان بەدژایەتی کردن و ئازاردانی خۆیی و شوێن کەوتوەکانی. بەڵام هەر خەڵکانێك شوێنی کەوتن، دنیایان فرۆشت و دواڕۆژیان کڕی، بە ماڵ و گیانیان جیهادیان لەپێناوی خوا کرد و خودا و پەیامبەرەکەیان سەرخست: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ﴾ [الحشر:٨].

---

(١) لێرەدا جیاوازی هەیە لەبارەی دیاریکردنی ڕۆژی لەدایکبوونی پەیامبەر ﷺ.

(٢) پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «أنا سيد ولد آدم يوم القيامة ولافخر»، رواه أحمد (٢/٣) وابن ماجه برقم (٤٣٠٨) وصححه الألباني في صحيح السنن.

واتە: بۆ ئەو کۆچبەرە هەژارانەی لە ماڵ و سامانی خۆیان دوورخراونەتەوە و دەرکراون و بەتەمای پاداشت و ڕەزابوونی خوان، خواو پەیامبەرەکەی سەردەخەن، بەڕاستی ئا ئەوانە ڕاستگۆن.

بە درێژایی سیازدە ساڵ هەر بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازەکەی، تا ئەوەبوو پەروەردگار -عز وجل- فەرمانی پێکرد بە کۆچکردن بۆ مەدینە. ئەوەبوو ئەو شارەی مونەوەر و ڕوناك کردەوە، هاوەڵکانیشی لەگەڵیدا کۆچیان کرد، ماڵ و منداڵ و لانکەی خۆیان بەجێ هێشت، هەموو ئەمانەیان تەنها لە پێناوی خوادا -عز وجل- دەکرد. دوایی کە گەیشتنە مەدینە خەڵکەکەی جێیان کردنەوە و سەریان خستن و پشتیان گرتن، دژایەتی هەموو دنیایان کرد لەبەر ڕێزگرتن لە پەیامبەر ﷺ، باوەشیان بۆ کۆچبەرانیش کردەوە، بە ماڵ و سامانیانەوە، تەنانەت بە خێزانەکانیشیانەوە، ئەو ئەنصاریەی دوو ژنی هەبوایە دەهات بۆ لای موهاجیرەکە و پێی دەووت: (هەرکامیانت دەوێ من تەڵاقی دەدەم و لە بۆخۆت مارەی کە)[1].

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾

[الحشر:٩].

واتە: (و ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و لانکەی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران کردیانە بنکەی باوەڕ، ئەوەی کۆچ بکات بۆلایان خۆشیان دەوێت وە لە دڵ و دەرونیاندا هیچ حەسودیەکی تێدا نیە لەسەر ئەوەی، کە بەشی کۆچبەران دراوە -لە فەزڵ و پلەو پایە-، و خۆنەویستی دەکەن و باوی ئەوان دەدەن بەسەر

(١) بڕوانە: صحيح البخاري (٣٧٨١).

خۆیاندا ئەگەر چی خۆشیان موحتاجبن و پێویستیان پێی بێ[١]، هەر کەسێکیش خۆی لە ڕژدی و ڕەزیلی بپارێزێت، بەڕاستی هەر ئەوانن سەرفرازان).

پەیامبەری خوا ﷺ هەر بەردەوام و کۆڵنەدەر بوو لە بانگەوازەکەیدا، ئەوەبوو هەموو دوورگەی گرتەوە، تا ئەو ڕۆژە مەزنە هات و خوای گەورە تێیدا مەککەی پیرۆزی لە بۆ پەیامبەرەکەی ﷺ فەتح کرد و دانیشتوانەکەی هاتنە نێو ئیسلامەوە، بەدوای ئەوە سەرجەم دوورگەی عەرەبی ملکەچی پەیامبەری خوا بوون ﷺ.

دوای بیست و سێ ساڵ لە بانگەوازو تێکۆشان، ئەو قەدەرە حەتمیە هات، هەروەکو خوا -سبحانه- لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ [آل عمران:١٤٤]. واتە: (موحەممەد تەنها پەیامبەرێکەو(نەمر نییە)و بێگومان لە پێش ئەو پەیامبەرانی تر ڕابوردوون -هەروەکو چۆن ئەوان مردن ئەمیش دەمرێ-، جا ئەگەر وەفاتی کرد یاخود کوژرا، پاشگەز دەبنەوە؟ جا هەرکەس هەڵگەڕێتەوە، ئەوە هەرگیز هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنێ، خوا بە زوویی پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە).

وەکو وا بێت هەموو دونیا تاریك هەڵگەڕا بێت لە بۆ ئەم ڕوداوە گەورەیە، ئەی چۆن وا نەبێت؟ لە کاتێکدا پەیامبەرﷺ دەفەرموێت: ((إذا أُصِيبَ أَحَدكم

(١) هۆکاری دابەزینی ئەم بەشەی ئەم ئایەتە لە لە صحیحی بوخاری دا هاتووەو چیرۆکێکی زۆر بە پێزو پڕ وانەیە، وێنەیەکی جوانی ئەو ئەنصاریانە پیشان دەدات کە بەردەوام وابوون هەروەکو خوای پەروەدرگار باسیان دەکات. بۆ دەقی هۆی دابەزینەکە بڕوانە کتێبەکانی تەفسیر لە ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتەی سورەتی حەشر. (وەرگێڕ)

مصيبةٌ، فليذكر مصيبَتَهُ بِيَ، فإنها أعْظَمُ المَصَائِب)[1] واتە: (گەر یەکێکتان تووشی موسیبەتێك هات، ئەوا با موسیبەتەکەی بە من بەراورد بکات، بەڕاستی گەورەترین موسیبەتێك، مردنی منە)، بە دڵنیاییەوە لەو ڕۆژەوەی پەروەردگار دروستکراوەکانی دروستکردوە، هەرگیز جیهان کارەساتی لەوە گەورەتری بەخۆوە نەدیوە.

ئەوە فاتیمەی کچی پەیامبەرە ﷺ، کە باوکی وەفاتی کرد هاواری کرد: «يا أبتاه، أجاب ربّاً دَعاه، يا أبتاه، في جَنّةِ الفِردَوْس مأْواه، يا أبتاه، إلى جِبريل نَنْعاه»[2]. واتە: (ئەی باوکە گیان، داوای پەروەردگاری وەڵام دایەوە، ئەی باوکە گیان، فیردەوس مەنزڵگایەتی، ئەی باوکە گیان، سەرەخۆشی ئەو لای جوبرەئیل دەکەین).

ئەوەش ئەنەسی کوڕی مالیکە ﷺ ئەڵێ: (ئەو ڕۆژەی کە پەیامبەری خوا هاتە مەدینەوە هەموو شتێك تێیدا ڕۆشن بوویەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە وەفاتی کرد هەموو شتێك تێیدا تاریك و خامۆش بوویەوە، هێشتا دەستمان لەپەیامبەری خوا ﷺ هەڵنەگرتبوو ، خەریکی ناشتنی بووین و لە ناشتنی نەبووینەوە، ڕق و بێزمان لە دڵی خۆمان دەهاتەوە -کە هەڵیدەگرین و بەدەستی خۆمان دەینێژین-[3].

---

(١) الطبقات الكبرى (٢/٢٧٥)، وصححه العلامة الألباني في(سلسلة الأحاديث الصحيحة) رقم(١١٠٦).

(٢) (صحيح البخاري) كتاب المغازي، باب مرض النبي ﷺ ووفاته، الحديث (٤٤٦٢).

(٣) (سنن الترمذي) كتاب المناقب عن رسول الله ﷺ، باب فضل النبي ﷺ، حديث (٣٦١٨). (ابن ماجه) كتاب الجنائز، باب وفاة النبي ﷺ، حديث (١٦٣١). [وصححه الألباني ]

ئەوەش ئەبوبەکرە -لەدوای وەفاتکردنی خۆشەویست ﷺ- بە عومەر دەڵێ: با بڕۆین سەردانێکی ئوم ئەیمەین بکەین، وەك چۆن پەیامبەر صلى الله عليه واله وسلم سەردانی دەکرد[١]، هەر کە گەیشتنە لای دەستی کردە گریان، ئەوانیش وتیان: بۆ دەگریت؟! ئەوەی لای خوایە باشترە بۆ پەیامبەرەکەی ﷺ. ئەویش وتی: بۆ ئەوە ناگریم، کە نەزانم ئەوەی لای خوایە باشترە بۆ پەیامبەرەکەی ﷺ، بەڵام ئەگریم لەبەر ئەوەی ئیتر وەحی لە ئاسمانەوە پچڕا، ئەوەبوو هەردوکیانی کرد بە گریانەوە و دەستیان کرد بە گریان)[٢].

ئا بەم شێوەیە ڕوحی پاك و مویارەکی فڕی بۆلای پەروەردگاریی و دینەکەی خوای گەورەش هەر مایەوە.



(١) پەیامبەری خوا ﷺ هەتا لە ژیاندا بوو زۆر سەردانی دەکرد، بۆیە جێنشینەکەی لەسەر سوننەتی مامۆستا و سەروەرەکەی دەڕوات و سیلەی ڕەحمی ئەو بەجێ دێنێت، وەکو چۆن کاتێك کە باوکێك دەمرێت کوڕەکانی ئەڕۆن سەردانی ئەو هاوڕێ و دۆستانەی باوکیان دەکەن، کە تا باوکیان لە دونیا بووە خۆشی ویستوون و سەردانی کردوون، ئەمانیش وەکو شوێنکەوتەیەکی دڵسۆز سەردانی خۆشەویستانی خوشەویستەکەیان دەکەن. (وەرگێڕ)

(٢) (صحيح مسلم) كتاب فضائل الصحابة، الحديث (٢٤٥٤).

# بەشی یەکەم

## خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران
## ئەبو بەکری سدیق رضي الله عنه لەساڵی ١١بۆ١٣ك

## ڕێخۆشکار

دوای بڵاوبونەوەی وەفاتی پەیامبەر ﷺ، ئەبوبەکری صدیق ﷺ لە سُنحەوە[1] گەڕایەوە، پاشان ڕووی پەیامبەری ﷺ هەڵدایەوە و نێوچەوانی موبارەکی ماچ کرد و وتی: (دایك وبابم بە قوربانت بێ بە مردوێتی و بە زیندوێتی هەر بۆنت خۆشە).

داپۆشیەوە و پاشان سەرکەوتە سەر مینبەر و وتی: (هەرکەس موحەممەدی ﷺ دەپەرست، ئەوا بێگومان موحەممەد ﷺ وەفاتی کرد، هەر کەسێکیش خوای دەپەرست، ئەوا بێگومان خوا هەر زیندووە و نامرێ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾ [آل عمران:١٤٤]. ئیتر خەڵك پڕقوڕگیان بوو لەگریان، ئەوەبوو هاوەڵان دەرچوون بۆ سەر

(١) لە نزیکی مەدینەیە وماڵی خێزانەکەی تری ئەبوبەکر: (حەبیبەی کچی خاریجە) لە ئێرەدا بوو. ودوای نوێژی بەیانی، کە پەیامبەری خوا ﷺ حاڵی هەندێك چاك بوویەوە و هەموو پێی دڵخۆش بوون، وپەیامبەری خوا ﷺ فەرمانیدا، لەسەر بەرەکەتی خوا سوپاکەی ئوسامە بەرێ بکەوێت، ئەبوبەکریش هات و فەرمووی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەمڕۆ ڕۆژی کچی خاریجەیە و تۆش لەخوا بەزیاد حاڵت چاك بووە، جا ئیزن ئەفەرموون؟ ئەویش ڕێگەی پێدا. ئیبن کەسیر دەڵێ سالمی کوڕی عوبێد (مەولای ئەبو حوزەیفە ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت: (قورئان لە چوار کەسەوە وەربگرن:...یەکێکیان سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە) ڕۆیشت بەدوای ئەبوبەکر و ئاگاداری کردەوە. بڕوانە: (البداية والنهاية)...(وەرگێڕ)

شەقامەکان و ئەم ئایەتەیان دووبــارە دەکــردەوە. ئەنــەس دەڵــێ: (وەکــو ئــەوەی هەرگیز ئەم ئایەتەمان نەبیستبێت لەو کاتەدا نەبێت)[1]

قورئان لە سەردەمی پەیامبەرﷺو پێش وەفاتکردنی کامــڵ بــووە، لەگــەڵ ئەوەشدا ئەو ئایەتە بە شێوەیەك دەرکەوت وەکو ئەوەی تازە بیستبێتیان و لــەوەو پێش نەیانبیستبێت، لە دەرەنجامی گــەورەیی و ســەختی ئــەو موسیبەتە، کــە مردنی پەیامبەری خوایەﷺ.

ئینجا عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئــەبو تالــب و فــەزلی کوڕی عــەبباس و هەندێکی تریش، هەستان بە شۆردن و کفن کردنی پەیامبــەری خوا ﷺ، بەشکو نوێژی لەسەر بکرێ و بنێژرێ (بەدایکم و باوکمەوە بەقوربانی بم ﷺ )، بۆیەش ئەوانە خەریکی کفن کــردن و شــردنی بــوون ، چــونکە عــەبباس مامەیەتی و فەزڵ و عەلیش ئامۆزایین، هەر بۆیە ئەوان لە پێشترن بۆ پەیامبەری خوا ﷺ.

❊ ❊ ❊

---

(١) صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابه - باب له كنت متخذا خليلا رقم(٢٤٦٧).

# باسی یەکەم

## سەقیفەی[١] بەنی ساعیدە

لەو ماوەیەی کە عەلی و عەباس و فەزڵ، سەرقاڵی ئامادەکردنی پەیامبەری خوا ﷺ بوون، هەندێك لە پشتیوانان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە، **جا من سەرەتا ڕیوایەتەکەی (مێژووی تەبەری) دەگێڕمەوە، کە ڕیوایەتی ئەبو میخنەفە درۆزنەکەیە، دوای ئەوە ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریش دەگێڕمەوە و پاشان بەراوردێکی هەردووکیان دەکەین، لە بۆ دەرخستنی ئەو زیادانەی کە ئەبو میخنەف خستویەتیە سەری.**

تەنانەت لەوە دەچێت زۆرێك لەو زیادانە لای زۆربەمان تا ئێستا کۆمەڵە شتێکی تەواو وبێ عەیب (مُسَلَّم) بن، هەروەك لە باسی شورا و تەحکیمیشدا نمونەی تری لە شێوەی ئەمەمان دێتە پێش -إن شاء الله-.

ئیمامی تەبەری -رحمە الله- دەڵێ: هیشامی کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو میخنەفەوە، وتی: عەبدوڵلای کوڕی عەبدولڕحمانی کوڕی ئەبی عەمرەی ئەنصاری بۆی گێڕامەوە: کاتێك کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، پشتیوانەکان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە و وتیان: دوای پەیامبەری خوا ﷺ ئەمکارە دەدەینە دەست سەعدی کوڕی عوبادە، یەکێکیان هەستا و وتی: بەشمشێرەکانتان هەموو عەرەب ملی بۆ کەچ کردن، پەیامبەریش ﷺ وەفاتی کرد و لە دەستان ڕازی بوو، خەڵك بە ئێوە ئاسوەدەن، لە

---

(١) سەقیفە: شوێنی کۆبوونەوەیان بووە، وەکو شوێنی دانیشتنەکانی ئێستا.

پێش خەڵکی تر **ئەم کارە زەوت بکەن**، ئەوەبو هەر هەمووی ڕەزامەندیان لە ئاست دەربڕی و وتیان: بۆچونەکەت جێی خۆیەتی! یەکێکیان وتی: ئەگەر کۆچبەرە قورەیشیەکان ڕازی نەبوون؛ ئەوا ئەڵێین: ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە ! سەعدی کوڕی عویادە گوتی: **ئەمە سەرەتای لاوازی و کزبونە**[١].

کە هەواڵەکە گەیشتە عومەری کوڕی خەتتاب[٢]، کەوا هەندێ لە پشتیوانان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبونەتەوە و ئەڵێن: ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە، ئەوەبوو ڕۆیشت بۆ لای ئەبوبەکر و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند و وتی: برا پشتیوانەکانمان کۆبونەتەوە و ئاوها ئەڵێن، بەڕێکەوە با بڕۆین بۆلایان.

هەردوکیان ڕۆیشتن و لە ڕێگادا ئەبوعوبەیدەیان بینی، وتیان: لەگەڵمان کەوە، بە هەرسێکیانەوە ڕۆیشتن بۆلای پشتیوانان.

عومەر ئەڵێ: لە دڵی خۆما قسەیەکم ئامادەکردبوو لەوێ بەیانی کەم، بەڵام کە ویستم قسە بکەم، ئەبوبەکر ئاماژەی بۆکردم کە بێدەنگ بم، ئیتر ئەبوبەکر دەستی بە قسەکرد، سوپاس و ستایشی خوای کرد وپاشان وتی: خوای گەورە موحەممەدی ﷺ ڕەوانەکرد.. پاشان ووتارێکی درێژی ئەبوبەکر باس دەکات، لەوەشی باسی کردوە: موهاجیرین لە پێشترن بۆ خیلافەت.

حوبابی کوڕی مونزیر وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان! ئەم کارە لە دەستی خۆتان دەرمەکەن، خەڵك لەژێر بەیداخ و سێبەری ئێوەدایە، هیچ بوێرێك ناوێرێ

(١) مەبەستی: لەسەرەتاوە باسی چی دەکرا و ئێستا باسی چی دەکرێ؟ سەرەتا: با کارەکە زەوت بکەین! ئێستا: ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئەوان؟! ئەمە سەرەتای تەنازولە. (وەرگێڕ).

(٢) یەکێك لە پشتیوانان هەواڵی پێدابوو.

پێچەوانەتان بکات، خەڵکی ئەوە ئەکەن کە لە ئێـوەوە دەردەچـێ، ئێـوە خـاوەن دەسەڵات و پارەن، شان و شەوکەتتان هەیە، ئەگەر ئەوەی لێیان داوا دەکەن هـەر پێی ڕازی نەبوون **شاریان پێ چۆڵ بکەن**، ئەم کارانە بگرنە دەست و بەسەریانەوە بن، دە بەخوا ئێوە شایستەترن بۆ ئەم پۆستە وەك لە ئەوان، ئەوانەشی کە سەریان دانەئەنواند هەر بە شمشێرەکانتان سەریان بۆ دین دانوانـد، منـیش شـیاوترم لـە غەیری خۆم بۆ ئەم کارە.

لەو کاتە عومەر و ئەبوعوبەیـدە بـە ئەبوبـەکریان ووت: دەسـتت بێنـە بـا بەیعەتت بەینیێ، کاتێك ڕۆیشتنە پێشەوە بۆ ئەوەی بەیعەتی لێوەرگرن، بەشـیری کوڕی سەعد پێشی هەردووکیان کەوت و بەیعەتی لێوەرگرت، پاشـان ئوسـەیدی کوڕی حُضیر کە یەکێك بوو لە دەم سپی و پیـاو مـاقولان هەسـتا و وتـی: «**دە بەخوا ئەگەر خەزرەج یەکجار ئەم کارە بەدەست بگرێت هەتا هەتایە بەهۆیەوە فەزڵیان دەبێت بەسەرتانەوە**»[1]. سەعدیش گـوتی: دە بـەخوا توانـای هەسـتانم هەبوایە، کە توانام نیە، ئەوا گوێت لە نەڕەی شێرینم دەبوو بەشێوەیەك کە خۆت و هاوڕێکانیشتی بریندار بکردایە، کـە وای لێهـات، سـوێند بـێ بـەخوا! ئـەبێ بتگێڕمەوە بۆ نێو ئەو خەڵکـەی کـە تیایانـدا سەرشـۆڕ بـووی نـەك سـەربەرز، هەڵمگرن لەم جێگایە. ئـەوانیش هـەڵیان گـرت و بردیانـەوە ماڵەکـەی، چـەند ڕۆژێکی پێچوو، پاشان وتی: **بەخوا هەتا تیر لە تیردانەکم بێت تیرتان تێدەگرم، و نوکی ڕمەکەم ڕەنگ دەکەم -تیژ دەکـەم-، هـەتا هێـز لـە گیـانم بـێ بـە شمشێرەکەم لێتان دەکوژم**، بە خاوخێزان و ئەوەی گوێڕایەڵم بێـت لـە هۆزەکـەم

---

(١) یانی ئوسەیدی حودەیر حەسودی بە سەعدی کوڕی عوبادە بردووە کە لە هۆزی خەزرەجە.

لەگەڵتان دەجەنگم. ئیتر دوای ئەوە سەعد نە جومعە و جەماعەت، نە حەجی لەگەڵدا نەدەکردن، هەروا مایەوە هەتا ئەبوبەکر وەفاتی کرد)[1].

**ئەمە ڕیوایەتەکەی ئەبو میخنەف بوو دەربارەی چیرۆکی سەقیفە، ئێستاش ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاری دەگێڕینەوە لەسەر هەمان ڕوداو و دواجاریش بەراوردێك دەکەین :**

ئیمامی بوخاری دەڵێ: ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕاینەوە، وتی: سولەیمانی کوڕی بیلال بۆی گێڕاینەوە، لە هیشامی کوڕی عورووەوە، وتی: عورووەی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە، لە عائیشەی خێزانی پەیامبەرەوە ﷺ، فەرمووی: کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد... پشتیوانانیش لە لای سەعدی کوڕی عوبادە لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە و وتیان: ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە.

ئەبوبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدە ڕۆیشتن بۆلایان، عومەر ویستی قسە بکات، بەڵام ئەبوبەکر ئاماژەی بۆ کرد کە بێدەنگ بێت، عومەر دەڵێ: سوێند بەخوا هیچ مەبەستێکم نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە هەندێ قسەم ئامادەکردبوو بەلامەوە جوان بوو، ترسام ئەبوبەکر باسی نەکات، ئەوەبوو ئەبوبەکر بەشێوازێکی زۆر ڕەوان دەستی کرد بە قسەکردن، لە ووتەکانیدا وتی: ئەمیر لە ئێمە دەبێت و وەزیر لە ئێوە. بەڵام حوبابی کوڕی مونزیر هەستا و وتی: نەبەخوا، ئەمیرێك لە ئێمە دەبێت و ئەمیرێك لە ئێوە[2]. ئەبوبەکر وتی: نەخێر، ئەمیرایەتی لە ئێمە

---

(١) ( تاريخ الطبري) (٢/٤٥٥) بتصرف لطوها.

(٢) ئیبن ئەلتین دەڵێ: «بۆیە پشتیوانان وایان دەگوت: «ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە»، چونکە هەرگیز ناو عەرەب وا باو نەبووە لە غەیری هۆزەکەی خۆیان ببێتە کاربەدەستیان،

دەبێ و وەزیرایەتی لە ئێوە، ئەوان -مەبەستی قورەیشە- ماڵیان لە ناوەندی عەرەبدایە، بەهێزترین و خۆشەویسترین نەسەبیان هەیە لە ناو عەرەبدا، ئەوە عومەر و ئەبو عویەیدەیە بەیعەت بدەن بە یەکێکیان، عومەر ئەڵێ: بەڵکو بەیعەت بەتۆ دەدەین، تۆ گەورەمانی، و باشترینمانی ، و خۆشەویسترینمانی لای پەیامبەری خوا ﷺ ، پاشان عومەر دەستی گرت و بەیعتی پێدا و خەڵکیش بەیعەتیان پێدا، یەکێك لەوێوە وتی: سەعدی کوڕی عوبادەتان کوشت، عومەر وتی: خوا بیکوژێ(١).

ئەمە ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریە، هەروەك دەبینین کورتە و پوختە، و ئا ئەمەیە هەقیقەتی سەقیفە، ئەوەی ئەبو میخنەف زیادی کردووە (کە سەدی کوڕی عوبادە وتوویەتی: کوشتارتان لەگەڵ دەکەم، جومعە و جەماعەتی لەگەڵ

جا کاتێك ئەمان ئەو فەرمودەیان بەبیریان هێنانەوە « قريش ولاة هذا الأمر» «کاربەدەستی ئەم دینە بە دەست قورەیش دەبێ» ، پەشیمان بونەوەو گوێڕایەڵ بوون ». فتح الباري لابن حجر. (وەرگێڕ)

(١) (صحيح البخاري)كتاب فضائل الصحابة، باب لو كنت متخذا خليلا، الحديث (٣٦٦٧ - ٣٦٦٨).

* ئبن حەجەر ئەڵێ: « ووتەی: «یەکێك لەوێوە وتی: سەعدی کوڕی عوبادەتان کوشت»، یانی: خەریکن دەیکوژن، ووتراویشیە: کینایەیە بۆ پشتگوێ خستن و سەرشۆڕی. بەڵام ئەوەی لە ڕیوایەتەکەی موسای کوڕی عوقبە لە ئیبن شەهابەوە هاتووە ڕەددی ئەم ڕایە دەداتەوە، کە دەڵێ: یەکێك لە پشتیوانان وتی: سەعدی کوڕی عوبادەش بهێڵنەوە پێی پیا مەنێن [فەرامۆشی مەکەن]. عومەر وتی: بیکوژن، خوا بیکوژێت». بەڵێ، عومەر لەو فەرمانەی مەبەستی کوشتنی ڕاستەقینە نەبووە، سەبارەت بەوەی کە ئەڵێ: «خوا بیکوژێت» ، مەبەست: دوعا لێ کردنە، هەروەك لە زمانی عەرەبدا مەشهورە، ئەم ئایەتەش لە بۆ هەمان مەبەستە ﴿قُتِلَ الانْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾. جا لەسەر بۆچوونی یەکەم: بریتیە لە پشتگوێ خستنی و ئیهمال کردنی. لە فەرمودەکەی مالکیشدا هاتووە: «پێم ووت -لەو کاتە توڕە بووم-، خوا ئەو سەعدە بکوژێ بەڕاستی شەڕخڕ و ئاژاوە گێڕە»» ت.و، الفتح (٣/٣٨٤) دار الفكر.

نەدەکردن، حەجی لەگەڵ نەدەکردن، حوبابی کوڕی مونزیر هەستاوە و بەرپەرچی ئەبوبەکری داوەتەوە) و زیادەکانی تریش؛ هیچ کامیان ڕاست نین و نە چەسپاون.

ئەوەی کە دیارە چیرۆکی سەقیفە خۆی نەگەیشتۆتە نیوسەعات، کەچی دەبینیت چۆن ئەو ڕیوایەتە لەوە زۆرترە کە ڕویداوە.

سەبارەت بە سەدی کوڕی عوبادە؛ ئەوەتا ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لە حومەیدی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە ڕیوایەت دەکات، کە ووتویەتی:... پاشان ئەبوبەکر قسەی کرد، لەسەر فەزڵی پشتیوانان هیچ نەما باسی نەکات لە قورئان ولە فەرمودەکانی پەیامبەردا ﷺ .

ئینجا وتی: « خۆتان ئاگادارن پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك شیو -ڕێگا-یەك بگرن و پشتیوانان شیوێکی تر، من شیوەکەی پشتیوانان هەڵدەبژێرم، ئەی سەعد تۆ ئاگاداری و دانیشتبووی کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: «قُریش ولاة هذا الأمر، فبر الناس تبعا لبرهم وفاجرهم تبعا لفاجرهم»[1] قوڕەیش کاربەدەستانی ئەم دینەن، ئەوەبوو سەعد وتی: ڕاست دەکەیت، وەزیر لە ئێمە دەبێت و ئەمیر لە ئێوە».

(١) لە زیادەیەکی تردا هاتووە (ما أقاموا الدين) واتە: (هەتا یاساکانی دینیان بەجێهێنا). بڕوانە: فیض القدير. هەروەها ئیبن حەجەر لە فتح الباری دا دەڵێ: ڕێگاکانی ئەم فەرمودەیە (قریش ولاة هذا الأمر)م کۆکردنەوە گەیشتە نزیکەی چل سەحابی. بۆ ئەم ووتەیەم هێنایەوە چونکە هەندێك ئەم فەرموودەیەیان پێ هەزم ناکرێ. (وەرگێڕ)

ئەم ڕیوایەتــە ئیمــامی ئەحمــەد لــە موســنەدەکەی خــۆی دا بەســەنەدێکی صحیحی مورسەل ڕیوایەتی کردووە، لە ڕێگەی حومەیدی کوڕی عەبــدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە -ڕەحمەت و ڕەزای خوای لێبێ-[1].

ئەم ڕیوایەتە ئەگەر چی مورسەلیشە، بەڵام هەر لە ڕیوایەتەکەی ئــەو ئــەبو میخنەفە درۆزنە بەهێزترە.

❊ ❊ ❊

(١) بۆ زانینی مرسل بڕوانە ل٢٨، پەراوێزی (١).

# باسی دووەم

## ئەبوبەکری صدیق ﷺ لە چەند دێڕێکدا

**❊ ناوی:**

ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانی کوڕی عامری کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی تەیمی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالیبی کوڕی فەهر[١]. فەهریش قوڕەیشە.

عەلی کوڕی ئەبو تالب ﷺ دەڵێ: «إن الله أنزل اسم أبي بكر من السماء الصديق» واتە: خوای گەورە ناوی ئەبو بەکری لە ئاسمانەوە بە ڕاستگۆ (سدیق) دابەزاندووە[٢].

**❊ موسوڵمان بوونی :**

لە ئەبی دەردائەوە دەڵێ: (لە لای پەیامبەری خوا ﷺ دانیشتبووم، ئەبوبەکر بەرەو ڕومان هات و لایەکی کراسەکەی هەڵکردبوو هەتا هەردوو ئەژنۆکانی دەرکەوت، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بێگومان ئەم برایەتان دەمەقاڵێکی کردووە)، ئەوەبوو هات و سەلامی کرد و وتی: (ئەی پەیامبەری خوا ﷺ شتێك لە نێوان من و کوڕی خەتابدا ڕویدابوو، تووڕەییم کرد، بەڵام دواجار پەشیمان بوومەوە و داوای لێبوردنم لێکرد، ڕازی نەبوو، ئەوەتا

(١) ( معرفة الصحابة) لأبي نعيم (١/ ١٥٠).

(٢) (أخرجه الطبراني في)المعجم الكبير ) (١/٥٥)، وذكره الحافظ بن حجر في ( الفتح) (٧/١١) وقال: ( رجاله ثقات).

هاتوومەتە خزمەتی ئێوە، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: (خوا لێت خۆش بێ ئەی ئەبوبەکر(سێ جار).

دوایی عومەر پەشیمان بویەوە و ڕۆیشتبوو بۆماڵ ئەبوبەکر و پرسیاری کردبوو، ئەبوبەکر لەوێیە؟ گوتبویان: نەخێر، ئینجا هاتبوو بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ، کە هات پەیامبەرﷺ تورە بوو و دەم وچاوی مویارەکی لە توڕییدا گۆڕا، کە ئەبوبەکر بەو شێوەیە بینی، دڵی بۆ عومەر سوتا و وتی: (ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بەخوا خەتای من بوو) (دوو جار)[1].

ئینجا پەیامبەر ﷺ فەرمووی: (ئەمن خوا ڕەوانەی کردم، ووتتان درۆ دەکات، بەڵام ئەبوبەکر وتی ڕاست دەکات، بە خۆیی وماڵیەوە یارمەتی دام و هاوکاری کردم، ئیتر واز لە هاوڕێکەم دێنن بۆم). (دووجار ئەمەی فەرموو)، ئیتر دوای ئەوە کەس ئازاری نەدەدا[2].

هەروەها لە عەمماری کوڕی یاسرەوە دەڵێ: (ئەمن پەیامبەری خوام ﷺبینیووە، کەسی لەگەڵدا نەبوو تەنها پێنج بەندە و دوو ئافرەت و ئەبوبەکر نەبێت)[3].

---

(١) لە هەقیقەتیشدا هەروایە یەکەم جار لە ئەبوبەکرەوە بووە، ئەم ئەوی تووڕە کردوە، هەروەك لە چیرۆکەکەدا دیارە. (وەرگێڕ).

(٢) (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب قول النبي لو كنت متخذا خليلا، حديث(٣٦٦١).

(٣) (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب قول النبي ﷺ (سدوا الأبواب)، حديث (٣٦٥٤).

**※ كۆچكردنی :**

لــە ئەبوبــەكرەوە‌رضي الله عنه دەڵــێ: لەگــەڵ پەیامبــەری خــوا بــووم‌ﷺ لــە نــاو ئەشكەوتەكەدا، سەرم بەرز كردەوە بینـیم ئـەوە پێـی قوڕەیشـیەكانە، وتم: ئـەی پەیامبەری خواﷺهەندێكیان سەیرێكی خوار بكا دەمانبینێ، فـەرمووی: ( بـێ دەنگ بە ئەی ئەبوبەكر، دووان خوا سێیەمیان بێت؟)[1]

**※ خێزانەكانی و مندالّەكانی:**

- قەتیلەی كچی عەبدولعوززا، كە عەبدوڵلا و ئەسمای لێ بووە.

- ئوم ڕۆمانی كینانیە، كە عائیشە و عەبدولڕەحمانی لێ بووە.

- ئەسمائی كچی عومەیسی خەپعــەمی. كە موحەممەدی لێ بووە.

- حەبیبەی كچی خاریجە، ئەمیش ئوم كەلسومی لێ بووە.

**※ لە فەزڵەكانی:**

ئەبو هورەیرەرضي الله عنه دەڵێ: گـوێم لـە پەیامبـەری خـوا بـووﷺ دەیفـەرموو: (هەركەسێ جوتیك لە هەر شتێ لە شتەكان لە پێناوی خوادا ببەخشێ، ئەوە لـە دەرگاكانی بەهشتەوە بانگ دەكرێ: ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرە !! جا ئەگەر لـە نوێژگەران بێ، ئەوا لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەكرێ، ئەگەر لە تێكۆشـەران بـێ لەدەرگای جیهادەوە بانگ دەكرێت، ئەگەر لە سەدەقەخوازان (زەكات) بێ، ئـەوە

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب مناقب الأنصار، باب هجرة النبي ح وأصحابه إلى المدينة، حديث (٣٩٢٢). و (صحيح مسلم) كتاب فضائل الصحابة، حديث (٢٣٨١).

لە دەرگای سەدەقەوە بانگ دەكرێ وە هەر كەسێك لە ڕۆژوان بێ ئەوە لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەكرێ).

ئەبوبەكر وتی: (ئەوەی بانگ دەكرێت لەو دەرگایانەوە چ پێویستی بەوەیە[1] پاشان وتی: (ئەی پەیامبەری خواﷺهەیە لە هەموو دەرگاكانیەوە بانگ بكرێت؟) فەرمووی: )بەڵێ ئەی ئەبوبەكر هیوام وایە یەكێك بی لەو كەسانە[2]

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ دەفەرموێ: (پەیامبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان، سەركەوتە سەر كێوی ئوحود، كێوەكە هاتە لەرزین، ئەوەبوو پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ڕاوەستە جێگیربە ئەی ئوحود، تۆ تەنها پەیامبەرێك و صدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە)[3]

لە عەمری كوڕی عاصەوە؛ دوای ئەوەی كە پەیامبەری خوا ﷺ كردبووی بە فەرماندەی سەر سوپای(ذات السلاسل)، ئەڵێ: هاتم بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ وعەرزم كرد: (قوربان خۆشەویسترین كەس لەلای تۆ كێیە؟ )

---

(١) یانی ئەگەر یەكێك تەنها خاوەن یەك سیفەت لەو سیفەتانە بێت، لە دەرگای ئەو سیفەتەوە بانگ بكرێت، ئیتر پێویستی بەوە نیە لە دەرگاكانی ترەوە بانگ بكرێ، گرنگ ئەوەیە بڕواتە بەهەشتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) (متفق علیه): (صحيح البخاری) كتاب فضائل الصحابة، باب قول لو كنت متخذا خليلا، حديث (٣٦٧٥). وأخرجه (مسلم) كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل أبي بكر الصديق من حديث أبي هريرة حديث (٢٤١٧).

(٣) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب قول لو كنت متخذا خليلا، حديث (٣٦٧٥). وأخرجه (مسلم) كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل أبي بكر الصديق من حديث أبي هريرة حديث (٢٤١٧).

فەرمووی: ( عائیشە )، وتم: ( لە پیاوان )؟

فەرمووی: ( باوکی )، وتم: ( پاشان کێ )؟

فەرمووی: ( عومەری کوڕی خەتتاب)، و پاشان ناوی چەندین پیاوی تری هێن[1]

* زانستی:

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەڵێ: (پەیامبەری خوا ﷺ ووتارێکی بۆ خەڵکی خوێندەوە و) پاشان فەرمووی: (لە ڕاستیدا خوا بەندەیەکی سەرپشك (مُخَيّر) کردوە لە نێوان دونیا و ئەوەی لای خۆیەتی، جا ئەو بەندەیە ئەوەی لە لای خوای هەڵبژارد).

دەڵێ: (ئەبوبەکر دەستی کرد بە گریان). ئێمەش سەیرمان لە گریانەکەی هات، پەیامبەری خوا ﷺ باس لە بەندەیەك دەکات کە موخەیەر کراوە ! [دوای زانیمان] ئەو بەندەیەی سەرپشك کرابوو خودی پەیامبەری خوا بوو ﷺ، چونکە ئەبوبەکر پێی وتین. دوای ئەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی:

(بەڕاستی تاکە کەسێك کە زۆر بەخشندە و چاك بوویێ لەگەڵمدا لە هاوڕێیەتی و ماڵیدا ئەبوبەکرە[2]، وئەگەر جگە لەپەروەردگارم

---

(١) متفق علیه: (صحیح البخاري) کتاب فضائل الصحابة، باب قول لو کنت متخذا خلیلا، حدیث (٣٦٦٢). و(صحیح مسلم) کتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أبي بکر الصدیق، حدیث (٢٤٨٤).

(٢) دەقە عەرەبیەکە ئەڵێ (إن أمنّ الناس عليّ) بەڵام ئیمامی نەوەوی بەو شێوەیە ڕاڤەی دەکات کە لە سەرەوە واتام کردووە. (وەرگێڕ)

هەڵبژاردبایە بە (خلیل)ی[1] خۆم، ئەوە ئەبوبەكرم هەڵدەبژارد، بەڵام برا و دۆستی دینیە، وبا هیچ دەرگایەك لە مزگەوتدا بە كراوەیی نەمێنێتەوە و ببەسترێ، تەنها دەرگاكەی ئەبوبكر نەبێ[2].

* پەیوەستی بە پەیامبەرەوە ﷺ:

لە عەبدوڵلای كوڕی زوبەیرەوە ئەڵێ: (پرسیارم كرد لە عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص ب لە بارەی سەختترین ئەشكەنجەدانێك كە موشریكەكان بە سەر پەیامبەری خوایان ﷺ هێنابێ؟ ئەویش فەرمووی: (پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد، عوقبەی كوڕی ئەبی موعیتم بینی ڕۆیشت بۆلای، كراسێكی خستە ملی زۆر بە توندی جەڕاندی هەتا خەریك بوو بخنكێ، ئەوەبوو ئەبوبەكر هات و پاڵی پێوە نا و پەیامبەری ﷺ لێ دوورخستەوە، وتی: (أتقتلون رجلاً أن یقول ربی الله وقد جاءكم بالبینات من ربكم)، واتە: (پیاوێك دەكوژن هەموو

---

(١) (حبیب) واتە خۆشەویست، بەڵام (خلیل) پلەیەكی لە خۆشەویست زیاترە، بەڵكو ئەوپەڕی پلەی خۆشەویستیە، واتە: (زۆر خۆشەویست) نەك خۆشەویستی پەتی. جا شێخی عوسەیمین دەفەرموێ: (ئەوەی مەلاكان دەیڵێن موحەممەد حەبیبوڵلایە هەڵەیە، چونكە موحەممەد خلیل الله یە، نەك جبیب الله). لە شەوانی ڕەمەزاندا لای خۆشمان لە دوای نوێژی تەراویح مامۆستا ومەلای مزگەوتەكان لە پەیامبەر ئیراهیمدا ﷺ دەڵێن خلیل الله، بەڵام لە پەیامبەر موحەممەد دا ﷺ دەڵێن حبیب الله، ئەمەش وەكو ڕوونم كردووەوە بەو شێوەیە نییە، ئومێدەوارم ڕاست بكرێتەوە، خۆ ئەگەر لا ببرێ ئەو باشتر چونكە زیادەیە، و باشترین بەرنامە بەرنامەی موحەممەدە ﷺ. (وەرگێڕ).

(٢) (صحیح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب قول النبی ﷺ (سدوا الأبواب)، حدیث (٣٦٥٤).

تاوانێکی ئەوەیە ئەڵێت تەنها الله پەروەردگامە، و بەڵگە و نیشانەی تەواوی لە پەروەردگارتانەوە بۆهێناون)[١].

## * ئاماژەکانی پەیامبەر ﷺ بۆ جێنشینکردنی:

١. لە ئەبی موسای ئەشعەریەوە ﷛ دەڵێ: (پەیامبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت، کە حاڵی خراپ بوو، فەرمووی: ((مُرُوا أَبَابَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاس))، واتە: (بڵێن بە ئەبوبەکر با ئەو نوێژ بە خەڵکی بکات).

عائیشەوە وتی: (ئەی پەیامبەری خواﷺ ئەو پیاوێکی دڵنەرمە، کە بڕواتە شوێنەکەی تۆ ئیتر ناتوانێ نوێژ بە خەڵکی بکات).

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بڵێن بە ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵکی بکات)، عائیشەش هەمان قسەی دووبارە کردەوە، ئەویش فەرمووی: (بڵێن بە ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵکی بکات، بەڕاستی ئێوە هاوەڵەکانی یوسفن)، بۆیە کەسێك چوو بۆلای و هەواڵی پێدا، ئەوەبوو تا وەفاتی پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی بە خەڵکی دەکرد)[٢].

٢. لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە دەڵێ: (ئافرەتێك هاتە خزمەتی پەیامبەری خواﷺ، ئەویش فەرمانی پێکرد کە سەردانی بکاتەوە)، ئافرەتەکەش

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب قول النبي ﷺ ((لو كنت متخذا خليلا))، حديث (٣٦٧٨).

(٢) (متفق عليه ): (صحيح البخاري) كتاب الأذان، باب أهل العلم والفضل أحق بالإمامة، حديث (٦٧٨). ( صحيح مسلم) كتاب الصلاة، باب استخلاف الامام اذا عرض له عذر، حديث (٤٢٠).

وتی: (ئەی ئەگەر هاتم و تۆ نەبووی -مەبەستی مردن بوو- (فەرمووی ﷺ: ((إن لم تجديني فأتي أبابكر)) ئەگەر من نەبووم بڕۆ بۆلای ئەبوبەك[1]٣. لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: (پەیامبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا پێ وتم: (بانگی ئەبوبەکری باوکت و براکەتم بۆ بکە، تا نوسراوێك بۆ بنوسم ؛ ئەمن دەترسم خوازیاران ئاوات بخوازن و هەندێك بڵێن: ئە من شایستە ترم، وە خوا و باوەڕداران ڕازی نابن بە ئەبوبکر نەبێت[2]

## تایبەتمەندییەکانی ئەبوبەکر بە پەیامبەری خواوە ﷺ:

لە ڕاستیدا ئەبوبەکر چەندین تایبەتمەندی بە پەیامبەری خواوە ﷺ هەیە، کە پێویستی بە درێژە پێدان و قسە لەسەر کردنە، بەڵام ئێمە لەبەر کورتی لەم شەجەرەیەدا دەیگوشێرین[3]

---

(١) (متفق عليه): (صحيح البخاري)كتاب فضائل الصحابة، باب قول لو كنت متخذا خليلا، حديث(٣٦٥٩). (مسلم) كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل أبي بكر الصديق، حديث (٢٣٨٦).

(٢) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب المرض، باب ما رخص للمريض أن يقول اني وجع، حديث (٥٦٦٦). (صحيح مسلم)كتاب فضائل الصحابة، حديث (٢٣٨٧).

(٣) راجع في الكلام على خصائص أبي بكر ﷺ بالنبي ﷺ: (( الروض الأنيق في اثبات امامة أبي بكر الصديق)) لابن زنجويه، مخطوط، و أيضا: (فضائل الصحابة)للامام أحمد، و (فضائل أبي بكر الصديق) للعشاري، و (تحفة الصديق في فضائل أبي بكر الصديق) لأبي القاسم علي بن بلبان المقدسي.

*** وەفاتی ئەبوبەکرﷺ:**

لە مانگی جمادی دووەمی ساڵی سیازدەی کۆچی، ئەبوبەکر نەخۆش کەوت، نەخۆشی مردن، پاشان نارەحەتیەکانی مردن ڕوی تێکرد، جا (دایکی ئیمانداران) عائیشەی کچی لەلادا بوو ووتی:

لعمرك ما يغني الثراء عن الفتى إذا حشرجت يوما وضاق بها الصدر

پارە وماڵ قازانج بەکەس ناگەیەنێ

کە هەناسە سواردەبێ و سنگی تەسك دەبێ

ئەویش سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەی بۆ نالێی: ﴿وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ [ق:١٩].

پێیان ووت: (ئەی نەڕۆین پزیشك بێنین؟)

وتی: (پزیشکەکە بینیمی، پێی وتم: (إني فعال لما أريد) ویستم لە هەرچیەك بێ ئەنجامی دەدەم، (مەبەستی لە پزیشك: خوایە -سبحانه وتعالی-)[1]

پاشان ڕوحی تەسلیمی پەروەردگاری کرد، دونیای بەجێ هێشت بەرەو بەهەشتێك کە پانتاییەکەی پانتایی ئەرز و ئاسمانە، هەروەك پەیامبەری خوا ﷺ مژدەی پێدابوو، دواییش هەر لە تەنیشت ئەوەوە ﷺ ناشتیان.

* * *

(١) انظر: (الطبقات الكبرى) لابن سعد (١٩٨/٣) ذكر وصية أبي بكر.

# باسی سێیەم

## گرنگترین ڕووداوەکانی خیلافەتی ئەبوبەکری صیددیق رضي الله عنه:

پەیامبەری خوا ﷺ، سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی ڕێکخستبوو بۆ هێرش بردنە سەر ڕۆمەکان لەشام، بەڵام پێش ئەوەی سوپاکە بەڕێکەوێت، پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، هاوەڵان دوو دڵ بوون لە ناردنی سوپاکە، چونکە ترسی مەدینەیان هەبوو، بەتایبەت دوای هەواڵی پاشگەز بوونەوەی زۆرێکی عەرەبەکان، بەڵام ئەبوبەکر هەر سوور بوو لەسەر ناردنی سوپاکە، وتی: (سوێند بە خوا سوپایەك هەڵناوەشێنمەوە پەیامبەری خوا ﷺ گرێی دابێت، ئەگەر باڵندە بە سەرمانەوە بێ، دڕندە دەوری مەدینە بدا، تەنانەت ئەگەر سەگەکان قاچی دایکانی ئیمانداریش بگرن، هەر سوپاکەی ئوسامە دەنێرم، پاشان فەرمانی کرد با پاسەوانان لە دەوروبەری مەدینەدا بن). لە ڕاستی دا دەرکردنی ئەو سوپایە لەو ساتە وەختەدا بەرژەوەندی زۆری تێدابوو، ئەوەبوو سوپاکە بەلای هەر ناوچەیەك لە ناوچەی عەرەب نشینەکان تێدەپەڕی، ترس و بیم دایدەگرتن ودەیان ووت: (ئەمانە لە هەر قەومێکەوە دەرچووبێتن، دیارە تۆکمە و پشت قاین). ئەوەبوو بۆ ماوەی چل ڕۆژ مانەوە، هەندێ تر ئەڵێن: حەفتا ڕۆژ. پاشان بە دەست پڕی و سەلامەتی گەڕانەوە).

عائیشە دەڵێ: (هەر کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد دەغەڵی و نیفاق دەرکەوت، وعەرەب هەڵگەڕانەوە، جولەکە و گاورەکان سەریان بەرز بوویەوە، ئیتر موسڵمانان وەکو ڕانی خویسیاو لە باران لە شەوێکی پڕ سەرما و سۆڵەیان

لێ هاتبوو ! بە هۆی وەفاتی پەیامبەرەکەیانەوە ﷺ، تا ئەوەبوو خوای گەورە لەسەر ئەبوبەکر کۆیکردنەوە، بەڕاستی ئەوەی بەسەر ئەبوبەکر هات ئەگەر بەسەر ئەو کێوە تۆکمانە بهاتایە دەیڕوخانن، جا سوێند بێ بەخوا لە هیچ شتێکدا جیاوازیان نەدەبوو ئیللا باوکم ڕای پەسەند و بەهێز هی ئەو بوو، [پاشان باسی عومەری کردو وتی] وهەرکەسێك کوڕەکەی خەتابی ببینیایە دەیزانی کە هەر بۆ یارمەتی ئیسلام دروستکراوە ! سوێند بەخوا پیاوێکی پەلەکار بوو لە کاری دروست، بێ وێنە بوو، بۆ هەموو کارێك هاوکارێکی ئامادەکردبوو).

## ١. کوشتاری هەڵگەڕاوەکان و زەکات نەدەرەکان:

ئەبو بەکر سوور بوو لەسەر کوشتاری هەڵگەڕاوەکان و زەکات نەدەرەکان، لە ڕاستیدا لەم بارەیەوە هاوەڵان قسەیان لەگەڵ کرد و داوایان لێکرد دەستبەرداری کوشتاری هەڵگەڕاوەکان بێت لەبەر مەدینە و دانیشتوانەکەی، بەڵام قایل نەبوو، ئینجا لەبارەی زەکات نەدەرەکانیش قسەیان لەگەڵ کرد کە وازیان لێ بێنێ و بێ دەنگ بێ تا ئیمان لە دڵیان دامەزراو دەبێ، دوایی خۆیان زەکات دەدەن[1]، دیسان قایل نەبوو. لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێ عومەری کوڕی خەتاب بە ئەبوبەکری ووت: چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکە دەجەنگی لە کاتێکدا پەیامبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا دەڵێن: لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە الله نەبێ، و موحەمەد

---

(١) چونکە تازە موسڵمان بوو بوون، هێشتا ئیمان لە دڵیان نەچەسپا بوو، ئەوەندەی نەبرد پەیامبەری خوا ح وەفاتی کرد. (وەرگێڕ)

نێردراوی خوایە، ئەگەر ئەمەیان ووت ئەوا خوێن و ماڵیان لە من پارێزراو دەبێت، مەگەر بە مافی لا إله إلا الله)[١].

ئەبوبەکر وتی: (سوێند بەخوا بەرخۆڵەیەك، لە ڕیوایەتێکی تردا (عقال)ێك[٢] بە پەیامبەری خوایان ﷺ دابێت و بەمنی نەدەن لەگەڵیان دەجەنگم، بەڕاستی زەکات لە مافی ماڵ و سامانە، جا بەخوا هەرکەسێك جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە کوشتاری دەکەم، عومەر دەڵێ: ئیتر زانیم ئەبوبەکر لەسەر هەقە؛ خوا دڵی ئەبوبەکری ئارەزومەند کردوە بۆ جەنگین)[٣].

ئەڵێم: ئەوەتا خوا سبحانە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ [التوبة:٥]، واتە: (ئەگەر مانگە حەرامەکان[٤] تەواوبوون، ئەوا لە هەر شوێنێك ئەو موشریکانەتان دەستکەوت بیانکوژن، و (بەدیل) بیانگرن، دەوریان لێبگرن و لەهەموو شوێن و جێگایەك بۆسەیان بۆ

---

(١) واتە: مەگەر شتێك بکەن دەرچوون بێت لە مافەکانی لا إله إلا الله محمد رسول الله. لە گەورەترین مافەکانی لا اله الا الله ش، نوێژکردن و زەکات دانە..، هەروەك ئیبن قەییم لە کتێبی (الصلاة وحكم تاركها) دەفەرموێ، ئەمە سەرباری ئەوەی لە زیادەیەکدا کە لە بوخاری و موسیلمدا هاتووە لە حەدیسەکەی ئیبن عومەر دەفەرموێت: «...وأقاموا الصلاة واتوا الزاكاة». (وەرگێڕ)

(٢) ئەو پەتەیە وا حوشتری پێ دەبەسترێتەوە.

(٣) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب الاعتصام، باب الاقتداء بسنن رسول الله ﷺ، رقم (٧٢٨٤ — ٧٢٨٥). و(صحيح مسلم) كتاب الايمان، باب الأمر بقتال الناس حتى يقول لا إله الله محمد رسول الله..، حديث(٢٠).

(٤) مانگە حەرامەکان بریتین لە: ( زو القعده، زو الحيجه، موحەرەم، ڕەجەب).

دانێن و بۆیان دانیشن، جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەرپاکرد و زەکاتیان دەرهێنا، ئەوا ڕێیان بەرەڵلاّ کەن، بەڕاستی خوا لێ بووردەی میهرەبانە).

* جا زۆرێك لە عەرەب لەدوای وەفاتکردنی پەیامبەری خوا ﷺ هەڵگەڕانەوە:

- خێڵی ئەسەد و غەتەفان هەڵگەڕانەوە، بە ڕابەری تولەیحەی ئەسەدی.

- و کیندە و دەروبەری هەڵگەرانەوە، بە ڕابەری ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی.

- و بەهەمان شێوە مەزحەج و دەروبەری هەڵگەرانەوە، بە ڕابەری ئەسوەدی عونسی.

- هەروەها خێڵی حەنیفە هەڵگەڕانەوە، بە ڕابەرایەتی موسەیلەمەی درۆزن.

- وخێڵی سولەیم هەڵگەرانەوە، بە ڕابەری (فوجائەت).

- وخێڵی تەمیم لەگەڵ (سەجاحی تەغلبیە )دا هەڵگەڕانەوە.

وە هەشبوو هەڵنەگەڕابووەوە، تەنها زەکاتی نەدەدا، هەروەکو هەندێکیان ئەیووت :

أَطَعْنَا رَسُولَ اللهِ مَا كَانَ وَسْطَنَا فَيَا لِعِبَادِ اللهِ مَا بَالُ أَبِي بَكْرِ
أَيُورِثُهَا بَكْرًا إِذَا مَاتَ بَعْدَهُ وَتِلْكَ لَعَمْرُ اللهِ قَاصِمَةُ الظَّهْرِ
گوێڕایەڵ بووین تا بوو پەیامبەر بەس ئەی عالەم چێتی ئەبوبەکر
دوای مردنی ئەبوبەکرە میراتگر؟ دە بەخوا ئەمەیە شۆڕی سەر

پاشان ئەبوبەکر خالدی کرد بە سەرکردە و ئاڵاکەی دابەدەستیەوە، کە بڕوات بۆ تولەیحەی ئەسەدی، ئەگەر لەوێشەوە بۆی لوا بڕوات بۆ مالیکی کوڕی نوەیرە لە(بەتاح).

- ئینجا عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلیشی کرد بە فەرماندە، فەرمانی پێدا بڕوات بۆ موسەیلەمەی درۆزن، پاشان شورەحبیلی کوڕی حەسەنەشی بەدوادا نارد.

- هەروەها خالدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کرد بە فەرماندە، ڕەوانەی دەوروبەری شامی کرد.

- هەروەها عەمری کوڕی عاصی کرد بە فەرماندە، ڕەوانەی ناوچەکانی( قوزاعە و وەدیعەو حارس)ی کرد.

- عەلائی کوڕی حەزرەمیشی کرد بە فەرماندە، ڕەوانەی بەحرەینی کر[1]

- هەروەها حوزەیفەی کوڕی موحصینی غەتەفانی کرد بە فەرماندە، و ڕەوانەی خەڵکی (دبا) و (بەعرفجە)و ( هەرسمە)ی کرد.

- هەروەها تەرفەی کوڕی حاجیبی کرد بە فەرماندە و ڕەوانەی ( بەنی سولەیم و ئەوانەی لە دەوروبەریاندان لە هەوازن)کرد.

هەروەها سوەیدی کوڕی موقەرینیشی کرد بە فەرماندە، ڕەوانەی( تیهامە)ی کرد لە یەمەن.

---

(١) (البداية والنهاية) (٦/ ٣٢٠ - ٣٢١).




پاشان ئەبوبكری صدیق گەڕایەوە بۆ مەدینە، بۆ هەریەكێكیان نوسراوێكی نووسی، ئەمەش نوسخەكەیەتی:

(بسم الله الرحمن الرحیم، لە ئەبوبەكری جێنشینی پەیامبەرەوە ﷺ، بۆ ئەو كەسەی ئەم نوسراوەی بەدەست دەگات، لە خەواس و عەوام، لەسەر ئیسلامەكەی ماوەتەوە یان هەڵگەڕاوەتەوە، سەلام لەوەی شوێنی هیدایەت كەوتووە و لەدوای هیدایەت و هودا نەگەڕاوەتەوە بۆ گومڕایی و هەوا، ئەمن سوپاسی ئەو خوایە دەكەم كە هیچ خوایەك نیە تەنها ئەو نەبێت. شایەتی ئەدەم كەوا هیچ خوایەك بە هەق شایستەی پەرستن نیە تەنها الله نەبێت، تەنهایە و هیچ هاوەڵێكی نیە، وشایەتی ئەدەم موحەممەد بەندە و پەیامبەری خوایە، هەرچی هێنابێت دانی پیادەنێین، وهەركەسیش نەیەوێت بەكافری دەزانین و جیهادی لەگەڵ دەكەین، دوای ئەوە: بێگومان خوا لأ بەهەق لە لایەن خۆیەوە پەیامبەرێكی بۆ خەڵكی

ڕەوانە کرد، بە مژدەدەر و ترسێنەر و بانگەوازکار بۆلای خوا، بە چرایەکی ڕۆشنکەرەوە. بەڵکو ئاگاداری زیندوەکان بکاتەوەو هەقیش لەلای کافران ڕون و ئاشکرا بێتەوە، ئەوەبوو خوای گەورە ڕێنمونیی ئەوەی کرد کە وەلامی دایەوە، وپەیامبەری خواش ﷺ لەگەڵ ئەوە جەنگا کە پشتی لێکردو وەلامی نەدایەوە، تا هەموو هاتنە نێو ئیسلامەوە، بە خۆشی یا بە ناخۆشی. دوای ئەوە خوا لأ پەیامبەرەکەی ﷺ بردەوە، دوای ئەوەی بەجوانی فەرمانەکانی خوای بەجێهێنا و ئامۆژگاری ئوممەتەکەی کرد، ئەوەی لەسەری بوو بەجێی هێنا، خوا -سبحانە وتعالی- ئەو ڕاستیەی بۆ موسوڵمان ڕون کردۆتەوە لە قورئاندا، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ {الزمر:٣٠}. (بەڕاستی تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ﴾ {الأنبياء: ٣٤}. واتە: (ئێمە لە پێش تۆ بڕیاری ژیانی هەمیشەیی و نەمریمان بۆ کەس نەداوە، جا ئەگەر تۆ بمریت، ئەوە ئەوانە دوای تۆ ژیانی نەمری و هەمیشەیی بەسەر دەبەن (نەخێر). هەروەها خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ {آل عمران: ١٤٤}. جا بۆیە هەرکەس موحەممەدی ﷺ دەپەرست، ئەوا موحەممەد ﷺ بەڕاستی مردووەو، هەرکەس خوای دەپەرست ئەوە خوا هەمیشە زیندوە و نامرێت، نەوەز و خەو نایباتەوە کار و فەرمانەکانی خۆی دەپارێزێت، تۆڵەش لە دوژمنانی خۆی دەکاتەوە، ئەی خەڵکینە ئەمن ئامۆژگاریتان دەکەم بە تەقوای خوا، بەوەی خوا پێی بەخشیون، دەستگرتن بەوەی پەیامبەرەکەتان ﷺ بۆی هێناون، لەسەر ڕێنموویی ئەو بن و لا مەدەن هەروەها دەست بگرن بە دینی خواوە لأ چونکە بەڕاستی هەرکەس خوا ڕێنمویی نەکات گومڕایە، هەرکەس خوا یاوەری نەبێت بەڕاستی ئەوە سەرشۆڕە، هەرکەسیش غەیری خوای گەورە ڕێنویی بکا و ڕێی نیشاندا ئەوە گومڕایە. خوای

بەرز و پیرۆز دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾ {الكهف: ١٧}، واتە: (..ئەو کەسەی خوا ڕێنوویی بکات تەنها ئەوە ڕێنوویی کراوە، ئەوەشی گومڕا بکات هەرگیز هیچ کەس نیە ڕێنوویی کەر و پشتیوانی بێت). خوای گەورە کار و کردەوە لەم دونیایەدا لە هیچ کەسێك وەرناگرێ تا دان بە تەواوی ئیسلامدا نەهێنێت، لە قیامەتیشدا تەوبە و بریتی لە کەس وەرناگیرێ. جا پێم گەشتووە هەندێکتان دوای ئەوەی دانی بەئیسلام ناوە، کاری پێکردوە، لە دینەکەی هەڵگەڕاوەتەوە، بەهۆی فریو خواردنیان بە لێ بوردەیی خوا و نەزانین بەرانبەر بە فەرمان و شەریعەتەکەی و وەڵامدانەوەیان بۆ شەیتان. خوای بەرز و مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا﴾ {الكهف: ٥٠}، واتە: (وە کاتێك بە فریشتەکانمان ووت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، ئەوانیش هەموو سوژدەیان بۆ برد جگە لە ئیبلس نەبێت، کە لە پێسڕی (جنۆکەکان) بوو، بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو، دەی ئایا ئێوە شەیتان و نەوەی دەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من، لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ڕاستەقینەی ئێوەن [لە بەر باوکی ئێوە سەرپێچی منی کرد، ئێستا ئێوە گوێڕایەڵی ئەو دەکەن و سەرپێچی من؟!]، ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپ و ناڕەوایە بۆ ستەمکاران). هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ {فاطر: ٥}، واتە: (ئەی مەردوم دڵنیا بن کە بەڵێنی خوا ڕاستە، دەی با ژیانی ئەم دونیایە فریوتان نەدات و سەرتان لێبوەشێنێت و شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ بە (ستر و بەزەیی و ڕەحمی خوا). ئەوەتا سوپایەکم بۆتان ناردووە، لە کۆچبەران و پشتیوانان و شوێنکەوتووە چاکەکان، فەرمانم پێ کردووە، تەنها ئیمان بەخوا نەبێت هیچی تر لە کەس قبوڵ نەکات، کەسیش

نەکوژێ هەتا بانگی دەکات بۆلای خوا، جا ئەگەر وەلامی دایەوە و دانی پێدانا وکاری پێکرد، لێی وەردەگیرێ و بۆی ئاسان دەکرێ، گەر ڕازی نەبوو، لەگەڵیدا دەجەنگێ، تا دێتەوە ژێر سایەی فەرمانی خوا، پاشان کەسیان ناهێڵرێتەوە و لەناویان دەبات ئەگەر توانی، با بیان سوتێنێ و هەموویان بکوژێت، ئافرەتەکانیان بەدیل بگرێت و جگە لە ئیسلام هیچی تر لە کەس قبوڵ نەکات جا هەرکەس شوێنی بکەوێت بۆخۆی باشە، هەرکەسیش قایل نەبێ ئەوا لە دەسەڵاتی خوا قوتار نابێ، هەروەها فەرمانم کردووە بە نێرداراوەکەم لە هەر جێگایەك ئێوەی لێنیشتەجێن نوسراوەکەی بخوێنێتەوە، ئەگەر لەهەر جێگایەکیان بانگدەر بانگی فەرموو وازیان لێ بێنن، ئەگەر بانگیان نەفەرموو، ئەوا داوای ئەوەیان لێ بکەن کە لەسەریانە، ئەگەر بەجێیان نەهێنا، پەلەیان لێ بکەن، ئەگەریش دانیان پێدانا، ئەوەی کە پێویستە بۆیان دەکرێت)[1]

### ❊ ئەسوەدی عەنسی (عەبهەلەی کوڕی کەعب):

بانگەشەی پەیامبەرایەتی دەکرد، هێشتا پەیامبەری خوا ﷺ مابوو بە حەوت سەد سەربازەوە چوو بۆ (صەنعاء)و داگیری کرد، دواتر هەموو یەمەن بە تەواوەتی کەوتە ژێر ڕکێفیەوە، وای لێهات بڵێسەی دەهات وەکو بڵێسەی ئاگر، لە تەشەنە کردندا بوو، ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر لە یەمەن هەڵگەڕانەوە، ئەمەش هەر بەردەوام بوو هەتا وەفاتکردنی پەیامبەری خوا ﷺ.

تا ئەوەبوو (فەیروزی دەیلەمی) لەسەردەمی ئەبوبەکردا کوشتی، ئەو کاتەی ئەسوەد خەوتبوو سەرخۆش بوو، ئەمیش شمشێرێکی زۆر بە توندی پیاکێشا،

(١) (البداية والنهاية) (٦/٣٢٠).

بۆڕەیەکی زۆر توندی لێوە هات، ڕاستەوخۆ پاسەوانەکانی هاتن، وتیان: ئەوە چیە؟ ئەوە چیە؟ خێزانەکەی -جا ئافرەتێکی چاك بوو- وتی: (هیچ نییە پەیامبەر وەحی بۆ دێ) ئەوانیش گەڕانەوە، پاشان موسوڵمانەکان لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەی کە هێشتا بەیعەتیان پێ نەدابوو، لەدەوری کۆشکەکەی کۆبوونەوە، بانگەرێك لە موسوڵمان هاواری کرد، (شایەتی ئەدەم کەوا موحەممەد پەیامبەری خوایە و (عەبهەلە) درۆزنە، پاشان سەرەکەی بۆ هەوا دان، هاوەڵانی ئەوسوەد دۆڕان، وەخەڵکیش کۆڵان بە کۆڵان دەکەوتنە دوایان و دەیانگرتن)[1].

### * تولەیحەی ئەسەدی:

تولەیحەی ئەسەدی لەسەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ هەڵگەڕایەوە، دوای وەفاتی پەیامبەری خوا ﷺ عویەینەی کوڕی ئەسەدیش لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە وهەستا بە پشتیوانی کردنی و بە هۆزەکەی خوی ووت: (دە بەخوا پەیامبەرێکی خێڵی ئەسەدم پێ خۆشترە لە پەیامبەرێکی خێڵی هاشمی، ئەوەتا موحەممەد مردووە، ئەوەش تولەیحەیە شوێنی بکەون، ئەوەبوو هەموو ( بەنی فوزارە)ی هۆزی شوێنی کەوتن. جا کاتێك خالدی کوڕی وەلید شکستی پێ هێنان، تولەیحە لەگەڵ خێزانەکەی هەڵهات بۆ شام، بەڵام دوای ماوەیەك دووبارە گەڕایەوە بۆ ئیسلام. ولەسەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا لە بۆ عومرەکردن ڕۆیشتە مەککە، بەڵام هەمیشە بە درێژایی تەمەنی شەرمی دەکرد ئەبوبەکر ببینێ، پاشان هاتەوە و لەگەڵ خالد دا بەشداری شەڕی یەرموك و هەندێك شەڕی تری کرد.

(١) (البداية والنهاية) (٦/٣١٥).

ئەبوبەکر نامەیەکی بۆ خالد نوسی، کە پرس و ڕاوێژ لـە کاروبـاری جەنگـدا بـە تولەیحە بکات، بەڵام هەرگیز نەیکات بە فەرماندە[١].

* ئەسەد و غەتەفان:

کاتێك کە وەفدی ئەسەد و غەتەفان لە بۆ (سوڵح) گەشـتنە لای ئەبوبـەکر، ئەبویـەکر سەرپشـکی کـردن لـە نێـوان شـەڕێکی قارەمانانـەی مەردانـە، یـان وازهێنانێکی سەرشۆڕکەران[٢] ئەوانیش وتیان: ئەی خەلیفەی پەیامبەری خوا ﷺ! شەڕی قارەمانانە ئەوە ئەزانین، بەڵام وازهێنانی سەرشـۆڕکەرانە چـیە؟ ئـەویش: وتی: چەك (حلقة [٣] ماین (الكراع[٤]ـ ەکانتان لێوەر دەگـیرێ، هـەروەها واز لـە خەڵکانێکیش دێنن کە بەدوای کلکی وشترەکانی خۆیانەوەن، تا ئەو کاتەی خـوا شتێك پیشانی خەلیفەی پەیامبەرەکەی و ئیمانداران دەدات، دەیکەنـە عوزرێـك بۆتان، هەروەها هەرچیتان لە ئێمەوە دەستکەوتووە دەیدەنەوە وهەرچیشـمان لـە

---

(١) ئەم بۆچونەی ئەبوبەکر دانایی و ووردبینی زۆری تێدایە، چونکە ئەبوبەکر دەیزانی تولەیحە شارەزایی باشی لە هونەری جەنگدا هەیە، بەڵام بـەهۆی هەڵگەڕانەوەکـەی و دیسـان هاتنـەوەی= =نەدەکرا ببێت بە فەرماندە یان بەرپرسی سوپای موسوڵمانان، بۆیە تەنها بۆ ڕاوێـژ سـودی لێـوەر دەگیرێت.

(٢) عەرەبیەکەی (حرب مجلية أو حطة مخزيـة)، واتە: جەنگێگ کە لـەماڵ و حـاڵی خۆتـان وە دەرتان نێ (مەبەست شـەڕی مەردانـە و پیاوانـە ویەکلاکەرەوەیـە)، یـان خۆبەدەسـتەوە دانێکـی سەرشۆڕکەرانە و زەلیلانە. (بڕوانە فتح الباري). (وەرگێڕ).

(٣) الحلقـة: بەشـێوەیەکی گشـتی چـەکە، وتراویشـە: بـە تایبـەت قەڵغانـە. لسـان العـرب (١٠/٦٥).

(٤) الكراع: بە چەك ئەڵێن، ئەشڵێن: ناوێکـە چـەك و مـاینیش دەگرێتـەوە. لسـان العـرب (٨/٣٠٧).

ئێوە دەستکەوتبێت نادەینەوە، شایەتی ئەوەش دەدەن کە کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتە و کوژراوەکانی ئێوە لە ئاگردای[1] عومەر وتی: سەبارەت بەو ووتەیەت: (خوێنی کوژراوەکانمان دەبژێرن)، ئەوا کوژراوەکانی ئێمە لەسەر فەرمانی خوا کوژراون، خوێن باییان نیە.

## * سەجاح و بەنی تەمیم:

بەنو تەمیم لە کاتی هەڵگەڕاوەکاندا ڕا جیاواز بوون، هەندێکیان هەڵگەڕانەوە، هەندێکیان تەنها زەکاتی نەدەدا وهەندێکیان هەر لەسەر ئیسلام مایەوە وهەندێکیشیان هێشتا دوودڵ بوون، لە کاتێکدا ئەوان لەم حاڵەیاندا بوون، سەجاحی کچی حارسی تەغلبیە هات بۆلایان[2]، کە گاورێکی عەرەب بوو بانگەشەی پەیامبەرایەتی دەکرد و کۆمەڵێك سەربازی لە هۆزەکەی خۆی و لەوانەی دوای کەوتبوون لەگەڵدا بوو، ئەم ئافرەتە زۆر سوور بوو لەسەر هێرشکردنە سەر مەدینە، ڕۆیشت بۆلای بەنی تەمیم و بانگی کردن بۆ بڕوا هێنان پێی، زۆربەیان وەلامیاندایەوە، بۆیە لەگەڵیاندا ڕێککەوت کە شەڕ لە نێوانیاندا روونەدات، پاشان مالکی کوڕی نوەیرە لەسەر هێرشکردنە سەر مەدینە ساردی کردەوە و هانی دا شەڕ لەگەڵ (بەنی یەربوع) و ئینجا باقی خەڵکدا بکا، جارێ هێرشبردنە سەر مەدینە دوابخات. ئەوەبوو سەجاح لەگەڵ سەربازەکانی بەرەو یەمامە بەڕێکەوت بۆ ئەوەی لە موسەیلەمەی درۆزنی بسێنێتەوە، کە موسەیلەمە بیستی وا سەجاح بەڕێوەیە بۆلای ئەم دێ، ترسا، چونکە ئەوجارێ

(١) البداية والنهاية (٦/ ٣٢٣).

(٢) هەندێکیش ئەڵێن: لە بەنی تەمەیمە.

سەرقاڵی شەڕی موسوڵمانانە، ئەمەش لەکاتی وردە شەڕەکانی بوو لەگەڵ موسوڵمانان، لە پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەمامە، ئەوەبوو ناردی بە دوای سەجاحدا و داوای سوڵحی کرد ئەویش ڕازی بوو بە مەرجێ نیوەی زەوی پێ ببەخشێ.

دوای ئەوە جارێکی تر ناردی بە دوایدا و داوای شوکردنی لێکرد، پێی ووت: (ئەتوانی شووم پێ بکەی!؟ تا بە هۆزەکەی خۆم وخۆتەوە، هەموو عەرەب بخۆین) ئەویش وتی: بەڵێ. کاتێکیش بیستی خالد وا بەرێوەیە، گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، لەلای (بەنی تەغلب)دا مایەوە، ئەشڵێن: دووبارە موسوڵمان بووەتەوە[1]

**※ بەنی حەنیفە وجەنگی یەمامە:**

ئەبوبەکر خالدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ یەمامە لە بۆ کوشتاری بەنی حەنیفە، بەڵام ئەبوبەکر پێش ئەوەش عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل وشورەحبیلی کوڕی حەسەنەی بۆ ئەوێ ڕەوانە کردبوو، ژمارەی سوپاکەی بەنی حەنیفە چل هەزار دەبوون، کە خالد گەیشتە ئەوێ، لە پێشەوە شورەحبیلی کوڕی حەسەنە ولای ڕاست زەیدی کوڕی خەتتاب ولای چەپ ئەبو حوزەیفەی دانا.

موسوڵمان پێشکەوتن، تا بە فەرمانی خالد لەسەر گردێك کە دەیڕوانی بە سەر یەمامەوە دابەزین، ئا لەوێ خالد سوپاکەی ڕێکخست، ئاڵای کۆچبەرانی دا بەدەست سالمی مەولای ئەبو حوزەیفەوە و ئاڵای پشتیوانانیشی دا بە دەست سابیتی کوڕی قەیسەوە، دوای گەرم بوونی شەڕەکە، سابیتی کوڕی قەیس بۆنی

---

(١) البدايە والنهايە (٦/ ٣٢٤).

خۆشی لە خۆیدا وکفنی خۆی کرد تـا هـەردوو ئـەژنۆکانی زەویەکـەی هەڵکەنـد ڕۆیشتە نێویەوە، هەروا بە خۆڕاگری مایەوە هەتاوەکو کوشـتیا[١] وهەنـدێك لـە پشتیوانان بە سالمی مەولای حوزەیفەیان ووت: ناترسی لە لای تۆوە بێن بۆمـان؟ ئەویش وتی: (گەر وابێ ئەوە بەڕاستی قورئان خوێنێکی خراپم).

خالد ڕۆیشت هەتاوەکو لێیان تێپەڕ بوو پاشان گەڕایـەوە، لـەنێوان هـەردوو ڕیزەکەدا وەستا و داوای موبارەزەی لیکردن، جـا هەرکـەس موبـارەزەی دەکـرد مەگـەر دەیکوشـت، کـە شـەڕەکە گـەرم بـوو خالـد پشـتیوانان و کوچـبەران و ئەعرابیەکانی لە یەکتر جیاکردەوەو هەر هۆزێکی خستە ژێر ئالآی خۆیـەوە، بـۆ ئەوەی بزانن لە کوێیەوە دێن بۆیان، جا ئەو ڕۆژە موسوڵمانان سەبرێکیان گـرت، هەرگیز لە وێنەی نەبووە. هەر بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچوون بـۆ نێـو جەرگـەی دوژمن، تا پەروەردگار لەسەر دەستیان فەتحی کردن و بێ بـاوەڕانیش ڕایـان کـرد وپشتیان هەڵکرد، تا چونە شوێنێکەوە پێی دەووترا باخی مردن (حديقـة المـوت)، بەنی حەنیفە باخەکەیان لە خۆیان داخست، وهاولآنیش دەوری باخەکەیان دا.

بەڕائی کوڕی مالیك وتی: (ئەی موسوڵمانەکان هەڵم گرن و فڕێم دەنـە نێـو باخەکەوە ! ئەوانیش بە نوکی ڕمەکانیان هەڵیان گرت وبەسەر پەرژینی باخەکەوە خستیانە ناوباخەکە، ئەوەبوو بە بەردەوامی لە پێناوی دەرگـای باخەکـە جـەنگا

---

(١) ئەو وتەیەی خالدم بیر کەوتەوە کە بە پاشای بێ باوەڕەکانی ووت: دە بـەخوا ئێـوە چـۆن حەزتان لە ژیانی دونیایە ئاوهاش ئەمانە حەزیان لە مردنە، هـەر چـۆن ئێـوە ڕائەکـەن لـە مـردن ئەمانیش ئاوها ڕائەکەن لە ژیان. کێیە لە بۆ مردن خۆی بۆن خۆشکا؟ ئەمڕۆ کـەس پـێش وەخـت خۆی بۆن خۆش ناکا= چاوەڕێی دوای مردنە بۆنی خۆشی لێ بدرێت. هەروەك چون زۆر کـەس نوێـژ ناکا هەتا دەمرێت ئینجا نوێژی لەسەردەکرێت. (وەرگێڕ)

هەتا کردیەوە، ئیتر موسوڵمانان بەسەر دیوار ودەرگاکانەوە ڕۆیشتنە ژوورەوە بۆیان، هەرچی هەڵگەڕاوەی یەمامە بوو کوشتیان، تا گەیشتنە لای موسەیلەمە، وەحشی کوڕی حەرب لێی چووە پێشەوە وبە ڕمەکەی تێیگرت، پێکایی و کوشتی)[1].

ژمارەی کوژراوەکانیان نزیکەی دە هەزار دەبوو، لە موسوڵمانانیش شەسەد کەس کوژرا. بەڵام باقیەکەی تریان پەنایان بردە بەر قەڵاکە، ئەوانە خالد ئاشتی لەگەڵدا کردن وبانگی کردن بۆ ئیسلام ئەوانیش تا دوا دانەیان موسوڵمان بوون. هەندێکیانیشی بەدیل گرتن، ئەمەش پێش ئەوەی بڕۆنە نێو قەڵاکەوە، یەکێك لەو دیلانە ئەو ئافرەتە بوو کە عەلی کوڕی ئەبو تالب موحەممەدی لێ بوو، کە ناسراوە بە موحەممەدی کوڕی حەنەفی[2].

### ❊ هەڵگەڕانەوەی خەڵکی بەحرەین :

خەڵکی بەحرەین هەڵگەڕانەوە ومونزیری کوڕی نوعمانییان کرد بە گەورەی خۆیان، یەکێکیان دەیووت: ئەگەر موحەممەد پەیامبەر بوایە نەدەمرد. جا ئەم خێڵە کەسیان لەسەر ئیسلام نەمایەوە تەنها دێیەك نەبێت بە ناوی (جواثا) [3]، تاکە دێیەك بوون لە نێوان هەموو هەڵگەڕاوەکاندا جومعەیان کرد.

---

(١) بەو ڕمە وەحشی، شێری خواو پەیامبەرەکەی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پەیامبەریﷺ پێکوشت وە هەر بەو ڕمە سەرسەختترین دوژمنانی خوای پێکوشت کە موسەیلەمەی درۆزن بوو.

(٢) (الطبقات الكبرى) (١٢/٣)، ئافرەتەکە ناوی خەولەی کچی جەعفەری کچی قەیسە.

(٣) جواثاء حصن لعبد القيس بالبحرين، معجم البلدان(١٧٤/٢) ويقال جواثا و جؤاثا.

هەڵگەڕاوەکان گەمارۆی (جواثا)یاندا، زۆر نارەحەتیان کردن، تا ئەوەبوو برسیەتی زۆری بۆ هێنان، تا یەکێکیان -عەبدوڵڵای کوڕی حزەف- وتی:

أَلا أَبْلِـغْ أَبَـا بَكْـرٍ رَسُـولًا وَفِتْيَـانَ الْمَدِينَـةِ أَجْمَعِينَـا
فَهَـلْ لَكُـمْ إِلَـى قَـوْمٍ كِـرَامٍ قُعُـودٍ فِـي جُوَاثَـا مُحْصَـرِينَا
كَـأَنَّ دِمَـاءَهُمْ فِـي كُـلِّ فَـجٍّ شُعَاعُ الشَّـمْسِ يَغْشَـى النَّاظِرِينَـا
تَوَكَّلْنَـا عَلَـى الـرَّحْمَنِ إِنَّـا وَجَـدْنَا النَّصْـرَ لِلْمُتَوَكِّلِينَـا

پاشان پیاوێکیان کە ناوی جارودی کوڕی موعەللا بوو هەستا وتارێکی بۆدان، وتی: (ئەی خەڵکی عەبدولقەیس، پرسیارێکتان لێدەکەم ئەگەر زانیتان وەڵامم بدەنەوە و ئەگەرنا وەڵامم مەدەنەوە، ئەوانیش وتیان: بپرسە).

وتی: ئایا ئەزانن خوا پەیامبەرانی تری پێش موحەممەد ڕەوانە کردووە؟ وتیان: بەڵێ.

وتی: ئەیزانن، یا بینیوتانە؟ وتیان: ئەیزانین.

وتی: باشە چیان لێ هات؟ ئەوانیش وتیان: مردوون.

وتی: کەواتە موحەممەدیش مردووە هەروەك چۆن ئەوان مردوون، ئەمن شایەتی ئەدەم هیچ خوایەکی هەق نیە تەنها الله نەبێت وە موحەممەد نێردراوی خوایە.

ئەوانیش وتیان: نشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله، تۆ گەورە و باشترینی نێومانی وە ئەوەبوو هەموویان لەسەر ئیسلام مانەوە.

پاشان ئەبوبەکر عەلائی کوڕی حەزرەمی ڕەوانەی بەحرەین کرد، ئینجا سومامەی کوڕی ئەسالی بە دوادا نارد، کە لە سوپای هەڵگەڕاوەکان نزیک بوویەوە ئەم دابەزی و ئەوانیش دابەزین، کە شەو داهات، عەلا گوێی لە دەنگە دەنگێکی بەرز بوو لە نێو سوپای هەڵگەڕاوەکانەوە، وتی: کێ ئەڕوات هەواڵێکی ئەوانەمان بۆ بێنێت؟

پیاوێك هەستا وڕۆیشت، دەبینێ هەموویان مەست و سەرخۆشن، ئەوەندەیان خواردۆتەوە ئاگایان لە خۆیان نەماوە، پیاوەکە گەڕایەوە وبۆی باسکرد، دەست بەجێ عەلاء لەگەڵ سوپاکەیدا کەوتە ڕێ و هەموویانی کوشت، هەندێکیان نەبێ دەرچوون و ڕایان کرد[١]

## ٢. ناردنی خالد بۆ عێراق (جەنگی ذات السلاسل):

ئەبوبەکر نامەیەکی بۆ خالدی کوڕی وەلید نوسی کە بڕوا بەرەو عێراق، خالد بەرەو عێراق کەوتەڕێ، لەوێشەوە (هورمز) سوپایەکی زۆری بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمانان کۆکردبووەوە، ئەوەبوو خالد بەسوپاکەیەوە هات ولە بەرانبەری فارسەکان لە (کاظمة)[٢] ڕاوەستا.

دوای ئەوە خالد پیادە بوو ڕۆیشتە پێشەوە لە هورمز، هەندێك دەستیان بۆ یەکتر وەشاند، ئەوەبوو خالد گرتی، پاسەوانەکانی هورمز هاتن لە ترسی ئەوەی نەوەك خالد بیکوژێ، ئەوەبوو قەعقاعی کوڕی عەمر هاتە پێشەوە بۆیان و

(١) أنظر (تاريخ الطبري - ذكر خبر أهل البحرين) و (البداية والنهاية) أحداث ١١هـ، ذكر ردة أهل البحرين.

(٢)ـ کازمە: ئێستا شوێنێکە لە وڵاتی کوەیت.

هەموویانی کوشت، ئیتر فارسەکان دۆڕان و موسڵمانان سەرکەوتن، پاشان موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر چەك و تفاقیاندا.

### ٣. غەزای شام:

دوای ئەوەی ئەبوبەکری صدیق لە دوورگەی عەرەبی بوویەوە، ڕوویکردە عێراق و خالدی کوڕی وەلیدیشی بۆ ئامادەکرد و ڕەوانەکرد، پاشان نامەیەکی بۆ عەمری کۆڕی عاص نووسی: (ئەی ئەبو عەبدوڵلا لە ڕاستیدا پێم خۆشە لەم کارەت لابەرم وکارێکت پێ بسپێرم کە باشتر بێ بۆ دونیا وئاخیرەتت، ئەگەریش ئەمەی ئێستات بەلاوە باشترە ئەوە شتێکی ترە).

عەمری کوڕی عاص لە وەڵامدا نووسی: (ئە من تیرێکم لە تیرەکانی ئیسلام، تۆش نیشانگر و وەشێنەری، جا تەماشای ناڕەحەترین و ترسناکترینیان بکە ولە بۆ ئەوێم بوەشێنە).

لەوێوە ئەبوبەکر دەستی کرد بە بەستنی لیواکان و دانانی فەرماندەکان، بەم شێوەیە:

١. یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان، زۆربەی خەڵکی لەگەڵدا بوو (دیمەشق)ی خستە ئەستۆی.

٢. ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح، (حمص)ی خستە ئەستۆی.

٣. عەمری کوڕی عاص، (فەلەستین )ی خستە ئەستۆی.

پاشان چەند هێزێکی تری لە بۆ یارمەتی یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان ڕەوانەکرد، لەوانە شورەحبیلی کوڕی حەسەنە وعیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل.

*** ئەو گەورە هاوەڵانەی بەشداریان کرد لە جەنگی یەرموکدا:**

ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، زوبێری کوڕی عەوام، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود، ئەبو دەرداء، ئەبو هورەیرە، شورەحبیلی کوڕی حەسەنە، عەمری کوڕی عاص، ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب، یەزیدی کوڕی ئەبەسوفیان وە عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل.

*** جەنگی یەرموك:**

ژمارەی سوپای موسوڵمانان تەنها بیست و حەوت هەزاربوو، بەڵام ژمارەی سوپای گاورەکان سەد وبیست هەزار دەبوو، فەرماندەکانی موسوڵمانان نامەیان بۆ ئەبوبەکر نووسی وباسی ئەو ڕووداوە مەزنەیان بۆ کرد وداوای کۆمەك ڕەسیان لێکرد، ئەویش بۆی نووسین: کۆببنەوە و ببنە یەك سەرباز، بەڕاستی ئێوە سەرخەرانی خوان، خواش ئەوە سەردەخات کە ئەو سەر دەخات، ئەوەی کوفری بکات سەرشوڕی دەکات، بزانن و ئاگاداربن هەرگیز بەهۆی کەمیەوە لە نمونەی ئێوە نابڕێتەوە، بەڵکو لە دەرگای تاوانەکانتانەوە زەفەرتان پێدەبەن، بۆیە ئاگادار وپاسەوانی ئەو دەرگایە بن.

پاشان ئەبوبەکر ﷺ وتی: دە بەخوا ئەبێت ئەو گاورانە بە خالدی کوڕی وەلید سەرقاڵ کەم لە وەسوەسەکانی شەیتان، جا لە عێراقدا بوو ناردی بەدوایدا کە بگاتە شام هەر کە گەیشتە شام ئەو ئەمیری هەموویانە.

خالدیش (موسەنناى کوڕی حاریسە )ی لە جێی خۆی دانا وبە نۆ هەزار وپێنج سەد سەربازەوە بەخێرایی بەرەو شام کەوتەڕێ. جا لەبەر کورت بڕی

ڕێگەی وای گرتە بەر، هیچ کەس پێش ئەو پێیدا نەڕۆیشتبوو، ئەو دەشتە وشکانی وبێ ئاوەی گرتەبەر و بەنێو ئەو دۆڵ وشیوانەدا دەڕۆیشت، ڕێنیشاندەرێکی لەگەڵدا بوو ناوی( نافیعی کوڕی عومەیری تائی) بوو.

لەبەر ئەوەی ئەو دەشتانە زەویەکی کەم ئاوبوون، ئاویان پێ نەما، ئەوەبوو دەستیان کرد بە سەربڕینی وشترەکانیان وئەو ئاوەی لەگەدەیدا بوو دەیاندایە ماینەکانیان، تا لە ماوەی پێنج ڕۆژدا گەیشتن. پێش ڕۆیشتنەکەی ئەعرابیەك پێی وت: (ئەگەر لە ڕۆژی ئەوەندەدا گەیشتیتە لای فلاَنە دار، خۆت وئەوەشی لەگەڵتدایە ڕزگارتان بووە، وەگەرنا لەوکاتەدا نەگەی ئەوە خۆت وئەوەشی لەگەڵتدایە لە ناودەچن)، ئەوەبوو لە بەرەبەیانی ئەو کاتەدا گەیشتن، کە گەیشتن وتی: (لە بەیانیدا دەستخۆشی لە شەوڕەوان دەکرێ)[١]، دواجاریش ئەو ووتەیە بوو بە پەندێك.

پیاوێك لە عەرەبە گاورەکان دەرچوو، بەمەبەستی سیخوڕی کردن بەسەر هاوەڵانەوە، ڕۆیشتەوە لای سەرۆکەکەیان وتی: (ئەمن خەڵکێکانێکم بینی عابدی شەون وسوارچاکی ڕۆژن، سوێند بەخوا ئەگەر کوڕی پاشاکەیان دزی بکا دەستی دەبڕن، ئەگەر زینا بکا ڕەجمی دەکەن، سەرۆکی ڕۆمەکان پێی ووت: (دە بەخوا ئەگەر ڕاست کەی، هەناوی زەوی لە سەر زەوی باشترە[٢].

کاتێکیش خالد کەوتەڕێ، یەکێك لە عەرەبە گاورەکان پێی ووت: (ژمارەی ڕۆمەکان زۆر زۆرن وموسوڵمانەکان کەمن)، خالد پێی ووت: (خوا بتکوژێ بە

(١) هەروەکو ئەوەی بڵێی: (لە قیامەتدا دەستخۆشی لە خواپەرستان دەکرێ). (وەرگێڕ)

(٢) واتە مردن لە ژیان باشترە. (وەرگێڕ)

ڕۆمەکان دەمترسێنی؟ لە ڕاستیدا سەربازەکان بە سەرکەوتن زۆر دەبن وبە دۆڕان کەم دەبن، نەك بە ژمارەی سەربازەکان، سوێند بەخوا حەزم دەکرد ئەشقەر چاك بوایەتەوە، ئیتر با ژمارەی سەربازەکانیش کەم بوایە(١).

هەروەها کاتێك (هامان)ی سەرۆکی سوپای ڕۆمەکان، داوای کرد چاوێکی بە خالدی کوڕی وەلید بکەوێ، خالد ڕۆیشت بۆلای، ( هامان ) پێی ووت: (ئێمە دەزانین سەختی ژیان وبرسێتی ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە، وەرن با بڕۆین هەریەکە ودە دینارتان پێدەدەم لەگەڵ جل و بەرگ وخواردەمەنیدا، بەمەرجێك بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، ساڵی داهاتووش بەهەمان شێوە ئەوەندەی ترتان بۆ دەنێرین. خالد پێی ووت: (نەخێر ئەوەی تۆ باسی دەکەی نەیهێناوین بۆ ئێرە، بەڵکو ئێمە خەڵکێکین خوێن دەخۆین، جا بیستوومانە لە خوێنی ڕۆم خۆشتر نیە، جا بۆ ئا ئەوە هاتووین. [ئیبن کەسیر ڕیوایەتی کردووە و سەنەدەکەی ضعیفی تێدایە].

دوای ئەوە لێك جودا بوونەوە، وداوای موبارەزەیان کرد، ئەوەبو پاڵەوانان دابەزینە مەیدان، پاشان شەڕ دەستی پێکرد. ڕۆمەکان لێشاویان هێنا، خاچەکانیان بەرز کردبووەوە ودەنگێکی یئزعاجیان لێوە دەهات وەك هەورەگرمە، قەشە وبەتریقەکانیا(٢)هانیان دەدان بۆ شەڕکردن، جا ژمارە وهێزێکەیان ئەوندە زۆر بوو هەرگیز شتی وا نەبینرابوو. موسوڵمانان هێرشێکی یەك نەفەرەیان کردە

---

(١) ئەشقەر: ناوی ئەسپەکەیەتی، کاتێك لە عێراقەوە هاتن توشی نارەحەتی وئازاری زۆر بوو.

(٢) بەتریق: واتە پیاوی بەڕێز وگەورە، ئەمیر، وەزیر، بەرزترین پلەی سەربازیە لە نێو ڕۆمەکاندا، بە کوردی دەتوانی (سەرۆك) یشی پێ بڵێی، هەروەکو چۆن بە عەرەبی دەتوانی (قائد)ی پێ بڵێی، بەڵام لێرەدا بە مانای فەرماندەی جەنگ هاتووە. (وەرگێڕ)

سەر ڕۆمەکان، ڕۆمەکان خۆیان پێنەگیرا وپەرش وبڵاوبوونەوە وڕایان کرد، شەڕەکە کۆتایی هات بە سەرکەوتنی موسوڵمانان و سەرکوتکردنی ڕۆمەکان.

### * چەند هەڵوێستێکی جوامێرانە

عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل لە شەڕی یەرموکدا هەستا و وتی: (ئەمن چەندین جار لە دژی ئەو پەیامبەری خوایە ﷺ وەستاوم وشەڕم کردووە، ئەمڕۆ لەترسی ئێوە ڕائەکەم؟! پاشان هاواری کرد: (کێ لەسەر مردن بەیعەتم پێدەدا ؟!)، ئەوەبوو حارسی کوڕی هیشامی مامی و ضیراري کوڕی ئەزور، لەگەڵ چوار سەد سوارچاك کە لە گەڵیاندابوو بەیعەتیان پێدا، زۆر بە غیرەتەوە جەنگان ئەوەبوو زۆربەیان کوژران.

مێژوو نووسان باسی ئەوە دەکەن کە کاتێك زامدار کراون، داوای ئاویان کردووە، ئەوانیش هەندێك ئاویان هێناو، ئەوەبوو هەر یەکەیان لە خۆی دەگرتەوە ونەیدەخوارد و دەیدا بە براکەی تری، تا هەموویان وەفاتیان کرد وکەسیان ئاوەکەیان نەخواردوەوە[1].

---

(١) ئەوەی شایەنی ئاماژە پێکردن بێت لەم جەنگەدا ئافرەتانی موسوڵمان بەشداریان کرد و ڕۆڵێکی جوامێرانەیان نواند و ژمارەیەکی باشیان لە ڕۆمەکان کوشت، تەنانەت هەرکەسێك لە موسڵمانان ڕای بکردایە بەرپەرچیان دەدایەوە ودەیانگوت: ئێمە بەجێ دێڵن بۆ ئەم علوجانە *؟ کە ئاوهایان دەکرد، ئەوانیش خۆیان پێ نەدەگیرا ودەگەڕانەوە بۆ شەڕەکە. لەوانەی بەشداریان کرد: خەولەی کچی ئەزور وخەولەی کچی سەعلەبەی ئەنساری وکەعوبی کچی مالکی کوڕی عاصم وسەلمای کچی هاشم ونیعەی کچی فەیاز وهیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ولەبنای کچی جەریری حومەیریە و عوفەیرەی کچی غیفار وسەعیدەی کچی عاصمی خەوەلانی... هتد، ئەمەش مشتێکە لە خەرمانی هەڵوێستە جوامێرانەکانی ئافرەتانی موسوڵمان.

* علوجیش: بە بێ باوەڕی غەیرە عەرەب دەوترێ. (وەرگێڕ)

هەروەها موسوڵمانان کەنیسەی (یوحەننا)یان کرد بە دوویەشەوە، بەشێکیان کرد بە(مزگەوت)و بەشەکەی تریان کرد بە (کەنیسە)، ئـەو مزگەوتـەش ئـەمڕۆ پێی دەوترێ(مزگەوتی دیمەشق).

* * *

# بەشی دووەم

## خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ لە ساڵی ١٣ بۆ ٢٣ک

## ڕێخۆشکار

خیلافەتی ئەبوبەکر ﵁ دوو ساڵ وسێ مانگ درێژەی کێشا، پاشان وەفاتی کرد و عومەری کوڕی خەتابی کرد بە جێنشینی خۆیی وخەڵکیش بەیعەتیان پێدا.

ئەبوبەکر، عومەری بە شیاوترین کەس دەزانی بۆ ئەو جێگایە، بۆیە ئەو کارەی پێ سپارد، ئینجا موسڵمانان بەیعەتیان پێدا و بوو بە خەلیفەی خەلیفەی پەیامبەری خوا ﷺ، ئەمەش بۆ ماوەی دە ساڵ بەردەوام بوو.

* خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب ﵁ بە جوانترین ساڵەکانی تەمەنی ئیسلام دادەنرێ، لە دوای ژیانی پەیامبەر ﷺ و ئەبوبەکر ﵁.

* عومەر لە ڕۆژانی ئەو شەڕە قورسەی کە لەشامدا ڕویدا خیلافەتی گرتە دەست، ئەو کاتەی کە موسوڵمانان لە یەرموك بەرانبەر ئەو هێزە سامناکەی ڕۆم ڕاوەستابوون، موسوڵمانان لەو شەڕەدا سەرکەوتن، فەتحی هەریەك لە دیمەشق وحیمص وقینەسرین وئەجنادەین کرا، پاشان فەتحە مەزنەکەی (بیت المقدس)یشی بە دوادا هات.

* وای لێهات موسوڵمانان بە کەیفی خۆیان بێ هیچ مەترسیەك لە زەوی ڕۆمەکاندا دەسوڕانەوە، پاشان بەدوای ئەوە عەمری کوڕی عاص بەرەو میسر کەوتە ڕێ وفەتحی کرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیش بەرەو ڕۆژهەلات لە

ناوچەكانی (هەرێمی فارس) ڕۆیشت، ئەوەبوو لـەوێش سـەركەوتنیان بـە دەست هێنا وفارسەكانی تووشی زەرەر و زیانێكی زۆر كرد.

* دوای ئەوە جەنگی( قادسیە)ی مەزن ڕویدا بە فەرماندەیی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص، كە یەكێك بـوو لـە جەنگـە هـەرە گرنگـەكان، پاشـان خوراسـان ڕزگاركرا، جا فتوحات لە سەردەمی عومەردا گەلێك زۆر بوو.

* هەروەها عومەر زۆر بە توندی چاودێری سەرجەم والیـەكانی دەكـرد لـە ناوچـە جیاجیاكانـدا، پرسـیاریانی لـە خـەڵك دەكـرد، هـەواڵیانی دەپرسـی وە موحەممەدی كوڕی مەسلمەی كردبـووە نوێنـەری خـۆی وهـەواڵی والیـەكانی بـۆ دەهێنا.

* هەروەها یەكێكی تر لە سیاسەتەكانی ئەوەبوو بە شەو پاسەوانی دەكرد، (چادوێری دەكرد وخەڵكانی جێی گومانی ئاشكرا دەكرد)، دەگەڕا وزۆر بایـەخی بە ئەمن و ئاسایشی مەدینە دەدا، هەرگیز ڕێگای بە هاوەڵە گـەورەكان نـەدەدا بڕۆنە دەرەوەی شاری مەدینە، چونكە بەردەوام لە كاروبارەكانیدا پرس و ڕاوێـژی پێ دەكردن(١).

* هەروەها دادپەروەری بڵاوكردەوە، تا ئەوەبوو كاتێك نێرداراوەكەی كیسرا بینی وا ئەمە ئەمیری ئیماندارانە و لە ژێر ئـەم دارە خـەوتووە، وتـی: «حكمـت

---

(١) التاريخ الاسلامي (٣/٢١)، وما بعدها.

فعدلت فأمنت فنمت»، (فەرمانڕەواییت کرد دادپـەروەر بـووی بۆیـە وا بۆخـۆت مورتاحی و لێی خەوتووی).

لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە ئەڵێ: (لە لای عومەر دانیشبووین).

- وتی: کامتان فەرمودەیەکی پەیامبەریﷺ لەبەرە لەسەر فیتنە.

- حوزەیفە وتی: فیتنەی مرۆڤ لە خێزان وسامان ومنـاڵ ودراوسـێکەیدایە، ئەمانەش نوێژ وصەدەقە و فەرمان بەچاکە و جڵەوگیری لە خراپە دەیانسڕێتەوە.

- وتی: نا مەبەستم ئەوە نییە، مەبەستم ئەو فیتنەیەیە کە شەپۆل ئەدا وەك شەپۆلی دەریا؟

- حوزەیفە وتی: خەمت نەبێ ئەی ئەمیری بڕواداران، لە نێـوان تـۆ وئـەودا دەرگایەکی داخراو هەیە.

- عومەر وتی: ئەو دەرگایە دەشکێ یا دەکرێتەوە؟

- حوزەیفە وتی: نا، بەڵکو دەشکێ.

- عومەر وتی: دە کەوابوو هەتا هەتایە داناخرێتەوە؟!

- منیش [واتە حوزەیفە] وتم: بەڵێ.

بە حوزەیفـەیان ووت: ئایـا عومـەر ئـەو دەرگایـەی ئـەزانی؟ وتـی: بـەڵێ دەیزانی، هەروەك چۆن دەزانێ دوای ڕۆژ شەوە، چونکە ئەمن فەرموودەیـەکم بـۆ

گێڕاوەتەوە هەڵەی تێدا نیە، جا ئێمە نەمان وێرا بپرسین کێ ئەو دەرگایەیە، ئەوەبوو وتمانە (مەسروق) پرسیاری لێ کرد، ئەو دەرگایە کێیە؟ وتی: عومەرە)[1]

ئەو دەرگایەش خودی عومەرە، شکاندنی دەرگاکەش بریتیە لە کوشتنی عومەر ئەو کاتەی ئەبو لوئلوئەی مەجوسی کوشتی، خوا لە ڕەحمەتی خۆی بە دوری خا.

❊ ❊ ❊

(١) (متفق عليه): (صحيح البخاري)كتاب الفتن، باب الفتنة التي تموج كموج البحر، ح(٧٠٩٦)، (صحيح مسلم) كتاب الايمان، باب رفع الأمانة والايمان من بعض القلوب..، ح(١٤٤/٢٣١).

# باسی یەکەم

## ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه

## لە چەند دێڕێکدا

*** نەسەبی:**

ناوی عومەری کومەڕی خەتتابی کوڕی نوفەیلی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ریاحی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی قورگـــی کـوڕی ڕەزاحـی کـوڕی عــەدی کـوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالبی کوڕی فەهر[١]، فەهریش قوڕەیشە.

*** خێزانەکانی :**

١.زەینەبی کچی مەظـعون.

٢.ملیکەی کچی جەروەل.

٣.ئوم حەکیمی کچی حارس.

٤.عاتیکەی کچی زەید.

٥.ئوم کەلسومی کچی عەلی کوڕی ئەبو تالب.

٦.جەمیلەی کچی عاصم.

٧.قەریبەی کچی ئەبو ئومەییە.

---

(١) (معرفة الصحابة) لأبي نُعيم (١/١٩٠).

*** منداڵەکانی:**

کوڕەکان: زەیدی گەورە - زەیدی بچوك ـ عاصم ـ عەبدوڵڵا ـ عەبدولڕەحمانی گەورە- عەبدولڕەحمانی ناوەڕاست - عەبدولڕەحمانی بچوك ـ عوبەیدوڵڵا ـ عیاض.

کچەکان: حەفصە - ڕوقەییە - زەینەب - فاتیمە.

*** مسوڵمان بوونی:**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: ( لەو کاتەوەی عومەر موسوڵمان بووە ئێمە سەبەرزین [1] عومەر لە ساڵی شەشەمی پەیامبەرایەتیدا دوای چل پیاو و بیست و یەك ژن بوو بە موسوڵمان.

*** پەیوەستی بە پەیامبەرەوە ﷺ:**

لە ئیبن عەباسەوە ﷺ دەڵێت: (دوای ئەوەی عومەر خرایە سەر جێگاکە[2] خەڵك دەوریان لێدا ودوعایای خێریان دەکرد، منیش لەوێ بووم وهێشتا وەفاتی نەکردبوو، هیچ سەرنجی بە ئەندازەی ئەو پیاوە ڕانەکێشام کە دەستی خستە سەر شانم، بینیم عەلی یە، دوعای خێری بۆ عومەر کرد و وتی: (بەڕاستی جگە لە تۆ نەبێ هیچ کەسێك نیە پێم خۆش بێت بە کردەوەکانیەوە بگەمە لیقای خوای گەورە، جا سوێند بەخوا، ئەمن ئومێدم هەیە خوا بتخات لەگەڵ دوو هاوڕێکەتدا، چونکە من زۆر جار گوێم لەپەیامبەری خوا ﷺ دەبوو ئەیفەرموو:

(١) (صحيح البخاري)كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حديث (٣٦٨٤)، كتاب مناقب الأنصار باب اسلام عمر(٣٨٦٣).

(٢) دوای ئەوەی ئەبو لوئلوئەی مەجوسی لێیدا.

(من و ئەبوبەکرو عومەر ڕۆیشتین، من و ئەبوبەکر وعومەر چووینە ژورەوە، من وئەبوبەکر وعومەر دەرچووین)[١]. ئەوە عەلی کوڕی ئەبو تالبە.

* فەزڵەکانی :

١. لە ئەبی هورەیرەوە ﷜ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بێگومان لە ئوممەتەکانی پێش ئێوەدا خەڵکانێك هەبوون (مُحَدَّث)[٢] بوون، جا ئەگەر یەکێك لە ئوممەتی مندا هەبێت ئەوە عومەرە)[٣].

٢. لە ئەبی هورەیرەوە ﷜ دەڵێ: لە خزمەتی پەیامبەری خوا بووین ﷺ فەرمووی: ( کاتێك خەوتبووم، بەهەشتم پیشاندرا، بینیم ئافرەتێك لە تەنیشت کۆشکێکدا دەست نوێژ دەگرێت، وتم: ئەو کۆشکە هی کێیە؟ وتیان: هی عومەرە. کە بیرم لە غیرەتی عومەر کردەوە پشتم هەڵکرد، عومەر دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: غیرە لە تۆ دەکەم ئەی پەیامبەری خوا ﷺ؟!)[٤].

٣. لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷜ دەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر و عوسماندا، سەرکەوتە سەر کێوی ئوحود، کێوەکە هاتە

---

(١) (متفق علیه): (صحیح البخاري)کتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حدیث (٣٦٨٥).(صحیح مسلم)کتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل عمر، حدیث (٢٣٨٩).

(٢) مُحَدَّثون واتة مُلهِمون: ئەوانەی ئیلهامیان پێدراوە و هەق خراوەتە سەر زمانیان... (وەرگێڕ).

(٣) (صحیح البخاري) کتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حدیث (٣٦٨٩). ولمسلم نحوه من حدیث عائشة (٢٣٩٨).

(٤) (متفق علیه): (صحیح البخاري) کتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حدیث (٣٦٨٠). (صحیح مسلم) فضائل الصحابة، باب من فضائل عمر، حدیث (٢٣٩٤ ـ ٢٣٩٥).

لەرزین، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ڕاوەستە، جێگیربە ئەی ئوحود، تەنها پەیامبەرێك وصدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە)[١].

٤. لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمەری خوا ﷺ بە عومەری فەرموو: (ئەی کوڕی خەتاب واز بێنە، سوێند بەوەی نەفسی منی بە دەستە! هەرگیز شەیتان ناگا پێت و ڕێگا (الفج)یەکت[٢]، گرتبێ ئیللا ڕێگایەکی تر دەگرێتە بەر)[٣].

### * عومەری ئیلهام پێدراو:

عومەر ئەڵێ: (ووتەم لە سێ شوێندا دەقاو دەق بووە لەگەڵ ووتەی پەروەردگارمدا:

١. وتم: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ خۆزگە (مەقامی ئیبراهیم)ت بکردایە بە شوێنی نوێژ (مصلی)، ئەوەبوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ﴾[٤] [البقرة:١٢٥].

٢. هەروەها ئایەتی حیجابیش، وتم: (ئەی پەیامبەری خوا ﷺ! چاك و خراپ سەر دەکات بە ماڵەکەتدا، خۆزگە فەرمانت بە خێزانەکانت بکردایە بە حیجاب کردن، ئەوەبوو ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە.

---

(١) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حديث (٣٦٩٧). (صحيح مسلم) فضائل الصحابة، باب من فضائل عمر، حديث (٢٣٩٤).

(٢) الفج: ڕێگایەکی فراوانە لە نێوان دوو شاخدا. لسان العرب (٢/٣٣٨).

(٣) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عمر، حديث (٣٦٨٣). (صحيح مسلم) فضائل الصحابة، باب من فضائل عمر، حديث (٢٣٩٦).

(٤) واتە: (وشوێنی ئیبراهیم -مقام ابراهيم- بکەنە جێگای نوێژ).

٣. هــەروەها خێزانــەکانی پەیامبــەرﷺ لای پەیامبــەرﷺ کۆبوونــەوە وهەریەکەیان دەیویست خێزانەکانی تری تەڵاق بدات، منیش پێم ووتن: دڵنیا بــن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات ئەوا پەروەردگاری لە ئێوە باشتری پــێ دەدات، ئــەوەبوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەو[1]: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا..﴾[2].

### * شەهید بوونی عومەر رضي الله عنه:

ئەمیری ئیمانداران عومــەری کــوڕی خــەتاب بــە دەســت ئــەبو لوئولوئــەی مەجوسی کوژرا، کاتێك نوێژی بەیانی دەکرد، زەفەری پێ برد و بــە شمشــێرێکی ژەهراوی دوو جار لێیدا.

کاتێك عومەر بکوژەکــەی خــۆی ناســیەوە، فــەرمووی: (ســوپاس بــۆ ئــەو خوایەی کە بکوژەکەم کەسێك نییە تەنها سوژدەیەکیشی هــەبێ، پێــی ڕویــەروم بووەستێتەوە لەلای خوا -سبحانه-)[3].

* * *

---

(١) (متفق عليه): (صحيح البخاري)كتاب الصلاة، باب ما جاء في القبلة، حديث (٤٠٢). (صحيح مسلم) مختصرا، كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل عمر، حديث (٢٣٩٩).

(٢) واتە: (دڵنیا بن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات ئەوا پەروەردگاری لە ئێوە باشتری پێ دەدات).

(٣) (مصنف ابن أبي شيبة) (٣٧٠٧٤) كتاب المغازي، باب ما جاء في خلافة عمر بن الخطاب.

# باسی دووەم

## گرنگترین ڕووداوەکانی سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁:

### * ڕوداوی «قادسیە»ی موحەڕەمی ١٤ ك:

عومەر بڕیاری دا خۆی هێرش بکاتە سەر عێراق، ئەوەبوو لە جێی خۆی عەلی کوڕی ئەبو تالبی دانا بەسەر مەدینەوە، بەڵام عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف پێی ووت: (ئە من دەترسم ئەگەر بشکێی موسوڵمانان لە هەموو سەر زەوی دا لاواز بن، جا وا بەباش ئەزانم کەسێکی تر بنێری و خۆت بگەڕێیتەوە بۆ مەدینە).

ئەوەبوو عومەر وباقی هاوەڵەکانیش بۆچونەکەیان پەسەند کرد، بەڵام عومەر وتی: ئەی کێ بە باش دەزانی ڕەوانەی کەین؟ وتی: شێر لە چنگ و هەڵمەتیا، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، ئەویش ڕازی بوو، پاشان سەعد بە چوار هەزار سەرباز وە گوتوشیانە: شەش هەزار سەربازەوە بەرەو عێراق کەوتە ڕێ.

لەم سوپایەدا نزیکەی سێ سەد وچەند هاوەڵێکی تێدا بوو، حەفتایان لە ئەهلی بەدر بوون، لەگەڵ زیاتر لە حەوت سەد منداڵ لە منداڵانی سەحابە. فارسەکانیش لەسەر ڕۆستەم ڕێککەوتن و بە هەشتا هەزار سەربازەوە کەوتە ڕێ، هەندێك ئەڵێن زیاتریش، لەگەڵ سی وسێ فیلدا.

سەعد (ریبعی کوڕی عامر)ی وەکو نێردراو نارد بۆلای ڕۆستەم، چووە لای ڕۆستەم، دەبینێ ژورەکەیان بە قالّی و ڕاخەری زێڕین و سەرین و پشتی ئاوریشمین ڕازاندۆتەوە، لەگەڵ هەڵواسینی دوڕر و گەوهەر، وخشڵی زۆر بەنرخدا

لەگەڵ زۆر شتی تری گرانبەهادا، تاجەکەشی لەسەر نا بوو، لـە سـەر ڕەختێکـی زێڕین دانیشتبوو، ئەوەبوو ریبعی بە جلوبەرگە شڕەکەیی و شمشێرێك و قەڵغانێك و کورتە ماینێکدا خۆی کردە ژورەوە، دانەبەزی تا ماینەکەی بردە سەر قاڵیەکە، پاشان دابەزی و هەر لەو ژورەدا بەستیەوە، ئینجا هاتە پێشەوە و هێشتا شمشـێر وقەڵغان و کڵاوەکەی سەری هەر پێوە بوون و لە خۆی نەکردبووەوە.

وتیان: شمشێرەکەت دابنێ؟

ئەویش وتی: ئە من لە خۆمەوە نەهاتووم، ئێوە بانگهێشتی منتان کردووە، جا ئەگەر لێدەگەڕێن ئاوهانە ئەوە چاکە ! وەگەرنا دەگەڕێمەوە؟ !

ڕۆستەم وتی: لێی گەڕێن ! ئەمیش ڕمەکەی دەکردە سـەرینەکان و زۆربـەی دڕاند ! وتیان پێی: چی ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە؟ !

وتی: «الله بعثنا لنخرج من شاء مـن عبـادة العبـاد إلى عبـادة الله، ومـن ضيق الدنيا إلى سعتها، ومـن جـور الأديـان إلى عـدل الإسـلام»، خـوا ڕەوانـەی کردووین بۆ ئەوەی بەندەکان لە بەندایەتی کردنی بەندەکان دەربێنین بۆ بەندایـەتی کردنی خوای بەندەکان وە لە تەسکی دونیا بۆ فراوانیەکەی وە لە زوڵمی دینەکان بۆ دادپەروەری ئیسلام. ئێمەی بە دینەکەی خۆی ڕەوانە کردووە بـۆ خـەڵکی بـۆ ئەوەی بانگیان کەین، جا هەرکەس قبوڵی کرد ئێمـەش لێـی وەردەگـرین و وازی لێدێنین، گەرنا لە گەڵیدا دەجەنگین تا دەگەینـە ئـەوەی خـوا بـەڵێنی پیـداوین. ئەوانیش وتیان: بەڵێنەکەی خوا چیە؟

وتی: بەهەشتە بۆ ئەوەی لەسەر جەنگی نەیاران دەکوژرێ ! و سەرکەوتنە بۆ ئەوەی دەمێنێ.

ڕۆستەم وتی: من گوێم لە قسەی ئێوە بوو؟ جا دەتوانن جارێ ئەمە دوابخەن، تا ئێمە تەماشایەك دەكەین و بزانین چی بكەین و ئێوەش هەروەها؟!

وتی: باشە ! چەند ڕۆژتان پێ خۆشە؟ ! ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ؟

ڕۆستەم وتی: نا، بەڵكو تا ئەوكاتەی پرس و ڕاوێژ بە خاوەن ڕەئی و گەورە ودەم سپیەكانی خۆمان ئەكەین!

ئەویش وتی: پەیامبەری خوا ﷺ بۆی داناوین لەكاتی بەیەك گەیشتنمان لەگەڵ دوژمندا لە سێ ڕۆژ زیاتر چاوەڕێ نەكەین. جا بزانە بۆخۆت و بۆ ئەوانیش بڕیاری چی دەدەیت، دوای ئەو مەوعیدە یەكێك لەو سیانە هەڵبژێرە؟!

ڕۆستەم وتی: ئەتو گەورەیانی؟

وتی: نەخێر! بەڵام موسوڵمانان وەكو یەك جەستە وان! بچوكیان پارێزەر و ڕزگاركەری گەورەیانە.

دوای ئەوە ڕۆستەم، سەرۆك و كاربەدەستانی لای خۆی كۆكردەوە و وتی: ئایا قەت پیاو لەمە جوامێرتر وقسە ڕاستترتان بینیوە؟! ئەوانیش وتیان: پەنا بەخوا كە مەیلت بۆلای شتی وا بڕوا و واز لە دینی خۆت بێنی بۆ ئەو سەگە، ئەتۆ تەماشای جل وبەرگەكانیت نەكرد؟!

ئەویش وتی: خوا بتانكوژێ ! تەماشای جل و بەرگ مەكەن، بەڵكو تەماشای بۆچون و قسە وهەڵس وكەوت بكەن، عەرەب هەر ئاوهان بایەخ بە جل و بەرگ و خواردن نادەن، بەڵام ڕەسەن و ڕەچەڵەك دەپارێزن و ڕێزی لێدەگرن.

ئیبن کەسیر: دەڵێ: (ڕوداوی قادسیە ڕوداوێکی مەزن بوو، هەرگیز شتی وا لە عێراقدا ڕوی نەداوە، کاتێك هەردوولا بەیەك گەیشتن سەعد تووشی نەخۆشی دەردە دەلاقە بوبوو، دومەڵێش لەلاشەی بەدەرکەوت، بۆیە نەیدەتوانی سواری بکات، تەنها لە کۆشکێکدا لەسەر سنگ لەسەر ڕاخەرێك ڕاکشابوو تەماشای سوپاکەی دەکردو ڕێکی دەخستن و پێشەوایەتی جەنگەکەی دابووە دەست خالدی کوڕی عورفوتە (عُرفُطة)[1].

شەڕ دەستی پێکرد، فەرماندەکان دەستیانکرد بە هاندانی سەربازەکان لە بۆ شەڕ، هەردوولا زۆر بەتوندی گیرانە یەك و شەڕو پێکادانێکی زۆر توند ڕویدا، کۆمەڵێك لە پاڵەوانانی جەنگەکە دەستی باشیان وەشان لەوانە: عەمری کوڕی مەعدی کەریب، قەعقاعی کوڕی عەمر، جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلی، خالدی کوڕی عورفوتە، زوراری کوڕی خەتاب و توڵەیحەی ئەسەدی، شەڕەکە سێ شەو وسێ ڕۆژ درێژەی کێشا، موسوڵمانەکان فیلەکان وئەوانەشی بەسەریانەوە بوون هەموویان تەفروتونا کردن، هەروەها بایەکی توند هەڵیکرد، خێمەی فارسەکانی لەبن دەرهێنا، ئەوەبوو موسوڵمانان سەرکەوتن، ڕۆستەم کەوتە خۆی و ویستی ڕابکات، بەڵام موسوڵمانان پێی گەیشتن و کوشتیان[2].

(١) (البداية والنهاية) (٧/٤٤) أحداث سنة ١٤ هـ.
(٢) (تاريخ الطبري) أحداث سنة ١٤ هـ. و (البداية والنهاية) أحداث سنة ١٤ هـ.

*** جەنگی ئەجنادەین (١٥ ك):**

یەکێکە لە جەنگە یەکلاییی کەرەوەکان لەگەڵ ڕۆمدا. عەمری کوری عـاص بـە سـوپاکەیەوە بـەرەو ئـەجنادەین کەوتـە ڕێ و سـوپای ڕۆمـەکانیش بـە سەرکردایەتی ئەرتبۆن دەرچوون.

عەمر هەر لـە ئـەجنادەین مایـەوە لـە هـیچ لایەکـەوە توانـای نەدەشـکا بەسەر(ئەرتبۆن)دا، هەواڵی نێردراوەکانیشی دڵئارامی نـەدەکرد، بۆیـە بڕیاریـدا خۆی بڕوات، ئەوەبوو ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای ئەرتەبوون و خۆی وا پیشـاندا کـە نێردراوی عەمری کوڕی عاصە، تاکو تەماشایەکی حاڵ و بـاری ئـەرتبوون بکـا، عەمر قسەی خۆی کرد و گوێی لە قسەی ئەویش گرت، پاشان ئەوەی مەبەستی بوو دەستی کەوت و هاتە دەرەوە، بەڵام ئەرتبۆن کەوتە گومانەوە لێـی و بـانگی یەکێك لە پاسەوانەکانی کردو چپەیەکی بۆ کرد، عەمری کوڕی عاص وای زانـی ئاشکرابووە و فەرماندەکا بە کوشتنی، بۆیە بە ئەرتبۆنی ووت:

ئەی ئەمیر! من گوێم لە تۆ بوو و تۆش گوێت لە من بوو، جا مـن یـەکێکم لەو دە کەسەی کە عومەری کوڕی خەتاب ناردوونی تا چاومان بە کاروبارەکـانی عەمری کوری عاصەوە بێ، جا پێم خۆشە بیانهێنم و گوێت لێ بگـرن و گوێیـان لێبگری، ئەرتبۆنیش وتی: باشە، بڕۆ بیانهێنە، دووبارە بـانگێکی پاسـەوانەکەی کردەوە و چپەیەکی بۆ کرد، ئەوەبوو عەمر بە بێوەی ڕزگاری بوو، بەڵام ئـەرتبۆن دوای زانی عەمری کوڕی کوڕی عاص بووە، بۆیە وتی: ئەم پیاوە فێڵـی لێکـردم وسوێند بە خوا ئەمە فێڵبازترین و بلیمەت ترین عەرەبە.

پاشان شەڕ لە ناوچەی ئەجنادەین دەستی پێکرد و خوای گەورە سەرکەوتنی بۆ موسوڵمانان نوسی، ئەرتبۆنیش چوو بۆ (ئیلیاء) و لەوێندەرێ خۆی قایم کرد، (ئیلیاء)یش بە (بیت المقدس) ئەڵێن[(١)].

## * فەتح کردنی بیت المقدس ( ١٦ ك ):

ئەبو عوبەیدە بە سوپای ئیسلامەوە کەوتە ڕێ و گەمارۆی( بیت المقدس)ی دا، ئەوەندە زۆری بۆ هێنان تا ئەوەبوو ڕازی بوون بە ئاشتەوایی بەو مەرجەی ئەمیری ئیمانداران ؓ خۆی تەشریف ببات بۆ لایان[(٢)].

عومەر تەشریفی گەیشتە شام، ئەبو عوبەیدە و ئەمیرەکانی تر، وەك خالیدی کوڕی وەلید و یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان چوونە پێشوازیەوە، ئەبو عوبەیدە دابەزی، عومەریش دابەزی، ئەبو عوبەیدە ویستی دەستی عومەر ماچ بکات، عومەریش ویستی پێیەکانی ئەو ماچ بکات، ئەبو عوبەیدە وازی هێنا، عومەریش وازی هێنا و کشایەوە.

پاشان کەوتنەڕێ، ئەوەبوو گاورەکان دەست بەرداری (بیت المقدس) بوون، مەرجی ئەوەشی لەگەڵدا کردن کە ئەبێت لە ماوەی سێ ڕۆژدا ڕۆم نەمێنێ و چۆڵی بکەن، پاشان عومەر ڕۆیشتە (بیت المقدس)ەوە، لەو دەرگایەوە ڕۆیشتە ژوورەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی ئیسرا و میعراج دا لێوەی ڕۆیشتە ژوورەوە، ئەڵێن: کاتێك ڕۆشتۆتە ژوورەوە تەلبیەی کردووە و دوو ڕکات نوێژی

---

(١) (البداية والنهاية) أحداث سنة ١٥ هـ وقعة أجنادين.

(٢) (البداية والنهاية) (٤٤/٧).

(تحيه المسجد)ی لە میحرابەکەی پێغەمبەرداود کردووە. هەروەها تێیدا نوێژی بەیانی بە موسوڵمانان کردووە، لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (ص)ی خوێندووە و خۆیی و موسڵمانانیش سوجدەیان تیا بردووە، لە ڕکاتی دووەمیشدا سورەتی (بنی إسرائیل)[١]ی خوێندووە، دوای ئەوە هات بۆلای بەرد (الصخره) کە و داوای لە کەعبی ئەحبار کرد شوێنەکەی پیشان بدا، کەعب وتی: مزگەوتەکە بخەرە پشتەوە، ئەویش پێی وت: وەك جولەکەت کرد (چاوت لە جولەکە بڕی)، ئەوەبوو مزگەوتەکەی خستە پێشەوەی (بيت المقدس)ـەوە -کە ئەمڕۆ عومەریی پێ ئەڵێن- پاشان بە عەبا و کەواکەی دەستیکرد بە لابردنی خۆڵی سەر صەخرەکە و موسوڵمانانیش یارمەتیاندا و ئەرکی گواستنەوەی باقیەکەشی سپاردە خەڵکی ئوردن.

جا ڕۆمەکان ئەو صەخرەیەیان کردبووە زبڵدان چونکە قیبلەی جولەکەکان بووە، بە ڕادەیەك ئافرەتانیان پارچە پەڕۆی بێنوێژیان لە نێو سەرئاوی ماڵەکانەوە دەنارد بۆ ئەوەی فڕێ بدرێتە نێو صەخرەکەوە وەکو پاداشتێك بۆ ئەو کارەی جولەکە بە زبڵدان (القمامه)ـەکەیان کرد، ئێرەش ئەو شوێنەیە وا جولەکە لە خاچدراوەکەیان تێیدا لە خاچدا لە جیاتی عیسا عليه السلام، جا لەبەر ئەوە دەهاتن و زبڵیان دەکردە سەر گۆڕەکەی، بەو هۆیەوە ئەم شوێنە ناونرا: (القمامة)، تەنانەت دوایی ئەم ناوە بڕایە سەر ئەو کەنیسەیەی کە خاچپەرستان لەوێندەر دروستیان کرد[١]

---

(١) واتە: سورەتی ئیسرا.

(١) (البداية والنهاية) أحداث سنة ١٦ هـ فتح بيت المقدس.

*** فەتح کردنی ((تستر وسوس)) وبە دیل گرتنی هورمزان ساڵی ١٧ ك:**

هۆکاری شەڕەکە (یەزگورد) بوو کە هانی فارسەکانی دەدا لە دژی عەرەب، هەتا وای لێهات فارسەکان ئەو پەیمانانەیانە شکاند کە لەگەڵ موسوڵمانەکان بەستبوویان لە دوای شەڕی (قادسیە)و شەرە بچوکەکانی تر، بڕیاریاندا لەگەڵ موسوڵمانەکاندا بجەنگن، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە عومەری کوڕی خەتاب، فەرمانیدا بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص سوپایەك بنێرێت بۆ ئەهواز لە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هورموزان، سەعدیش نوعمانی کوڕی موقەرینی هەڵبژارد، جا کاتێك نوعمان گەیشتە ڕامەهورمز، هورمزان لێی دەرپەڕی و لەگەڵیا جەنگا، ئەوەبوو هورموزان شکاو بەرەو(تستر) ڕایکرد و هەڵهات، موسوڵمانان بەدووی کەوتن هەتا لەوێندەر گەمارۆیاندا، شەڕ گەرم بوو و کوشتاری هەردوولاش زۆربوو، موسوڵمانان بە بەڕائیان ووت -جا دوعا گیرابوو-[1] : ئەی بەڕاء ! سوێند لەسەر پەروەردگارت بخۆ، کە بیانـدۆڕێنێت وسەرمان بخات بەسەریانا، ئەویش وتی: خوایەگیان سەرمانخە بەسەریاناو منیش شەهیدبکە.

ئەوەبوو بەڕاء لەو ڕۆژەدا زیاتر لە سەد کەسی کوشت و پاشان خوای گەورە هورموزان و سوپاکەی سەرشۆڕ کرد، بەڕادەیەك لە شارەکەی خۆشیاندا جێگەیان نەبوویەوە، جا یەکێك لە فارسەکان داوای ئەمانی لە ئەبو موسای ئەشعەری کرد

---

(١) بە هۆی فەرموودەکەی ئەنەسەوە زانراوە کە دوعای گیرایە کە ئەڵێ: (پەیامبەری خوا فەرمووی: چەندین قژ گڤ گڤینی تۆزاوی لە نێو دوو جل و بەرگی شڕ، کە گوێی پێ نادرێ و حیسابی بۆ ناکرێ، ئەگەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات بۆی جێ بەجێ دەکا (أخرجه الترمذي (٣٨٥٤) وقال: (حسن).

و ئەویش ئەمانیدا، ئەوەبوو شوێنێکی بە موسوڵمانان پیشاندا کە ڕێگای چوونە ژورەوەی ئاو بوو بۆ ناو شارەکە، فەرماندەکان هانی خەڵکیاندا بۆ ئەو شوێنە، ئەوەبوو کۆمەڵێك پیاوی ئازا و جوامێر وەڵامیان دایەوە و لەگەڵ ئاوەکەدا ڕۆیشتنە ژورەوە، ئەمەش هێشتا شەوە، دوایی هاتن و دەرگاوانەکانیان کوشت و دەرگاکەیان کردەوە، موسوڵمانەکان دەستیان کرد بە الله أکبر و ڕۆیشتنە ژوورەوە، کاتەکە نزیك نوێژی بەیانی بوویەوە، موسڵمانانیش سەرقاڵی شەڕکردن بوون هەتا خۆر هەڵهات و هێشتا نوێژی بەیانیان نەکردبوو.

ئەنەس ئەڵێ: لە فەتحی (تستر)دا بەشداریم کرد لە کاتی نوێژی بەیانی بوو، بە هۆی گەرمی شەڕەکەوە خەڵك نەیانتوانی نوێژەکانیان بکەن، کەس نوێژی نەکرد هەتا خۆر هەڵهات، دوایی لەگەڵ ئەبو موسادا کردمان، ئەنەس ئەڵێ: (ئەگەر دونیا و ئەوەشی تێیدایە پێم بدرێ بە قەدەر ئەو نوێژە دڵخۆشم ناکا)[1].

هورموزان ڕایکرد بەرەو ناو (قەڵاکە)، کۆمەڵێ پیاوی پاڵەوان دوای کەوتن، ئەویش دەستیکرد بە تیر هاویشتن، تا ئەوەبوو بەڕاء و مەجزەئەی کوڕی سەور تیریان بەر کەوت و کوشتیان، هورموزان پێی ووتن: ئە من سەد تیرم پێیە، هەر کامێکتان بێتە پێشەوە لێی دەدەم، ئەگەر من سەد پیاوتان لێ بکوژم ئیتر سودی دیل گرتنم چی بێت، وتیان: باشە چیت ئەوێ؟ وتی: ئەمانم بدەنێ، تا دەستم دەخەمە نێو دەستتان و دەمبەن بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب، ئەو هەر بڕیارێکیدا باشە، ئەوانیش ڕازی بوون. کاتێك ڕۆشتن بۆ مەدینە، چوون بۆ ماڵ

---

(١) رواه البخاري معلقا، كتاب الخوف، باب الصلاة عند مناهضة الحصون، قبيل الحديث(٩٤٥).

عومەر لە ماڵ نەبوو، پێیانیان ووت: لە مزگەوتدایە، کاتێك چوون بۆ مزگەوت بینیان لە گۆشەیەکی مزگەوتەکەدا بۆ خۆی نووستووە.

هورموزان وتی: عومەر کوا؟ ئەوانیش ئاماژەیان بۆ کرد و دەنگیان نزمکردەوە نەوەك بە خەبەر بێتەوە.

هورموزان وتی: ئەدی کوا دەرگاوان؟ کوا پاسەوان؟!

ئەوانیش وتیان: ئەم نە پەردەی هەیە و نە پاسەوان. ئەوەبوو عومەر بەهۆی دەنگیانەوە بە خەبەر هات و دانیشت. وتیان: ئەمە هورمزانە.

ئەویش وتی: چ بەڵگەیەك و چ پاساوێك دێنیتەوە بۆ ئەو پەیمان شکاندنە یەك لە دوای یەکانەت؟ هورموزان وتی: ئەترسم پێش ئەوەی وەڵامت بدەمەوە بمکوژی.

وتی: نا لەوە مەترسە.

هورموزان داوای ئاوی کرد بیخواتەوە، ئاویان بۆ هێنا، ئەویش بە دەستە لەرزە وەریگرت، وتی: دەترسم لە کاتێکا ئاو دەخۆمەوە بمکوژی، عومەر وتی: ترست نەبێ تا ئاوەکەت ئەخۆیتەوە. کە وای ووت پەرداخەکەی هەوادا و نەیخواردەوە. عومەر وتی: ئاوی بۆ بێنن، تینوێتی و کوشتنی لەسەر کۆمەکەنەوە. ئەویش وتی ئاو ناخۆمەوە. عومەر وتی: دەتکوژم. هورموزان وتی: تۆ منت ئەمین کرد لە کوشتن هەتا ئاوەکە دەخۆمەوە کەچی هێشتا ئاوەکەم نەخواردۆتەوە. ئەنەسی کوڕی مالك وتی: ڕاست دەکات ئەی ئەمیری ئیمانداران.

عومەر وتی: بە بەلآبی ئەی ئەنەس! ئە من ئەمانی کەسێك دەدەم کە بەڕاو و مەجزەئەی کوشتبێ؟! پاشان ڕوویکردە هورموزان و پێی ووت: هەڵمت خەڵەتاند، دە بەخوا من فریو ناخۆم مەگەر موسوڵمان بیت، ئەوەبوو ڕاستەوخۆ هورموزان موسوڵمان بوو. کە پێیان ووت: پێشتر بۆ موسوڵمان نەبووی؟! وتی: ترسام بڵێن: لە ترسی شمشێردا موسوڵمان بووە[1].

## * ساڵی خۆڵە مێشەکە «عام الرمادة» ساڵی ١٨ ك:

ئەم ساڵە ناونرا بە ساڵی خۆڵە مێشەکە، چونکە بەهۆی کەمی باران بارینەوە زەوی ڕەش هەڵگەڕا، تاوای لێهات وەك خۆڵە مێشی لێهات، ئەمەش بۆ ماوەی نۆ مانگ هەر بەردەوام بوو، ئەوەبوو ئیمامی عومەر نوسراوێکی نووسی بۆ ئەبو موسا لە بەصرە و عەمری کوڕی عاص، ئەیووت: (هاوار و فریاد بۆ ئوممەتی موحوممەد).

خەڵك هەموو دەرچوون بۆ نوێژە بارانە، عومەر عەباسی مامی پێغەمبەری لەگەڵ خۆی هێنا، بۆ ئەوەی ئەو نوێژە بارانە بەخەڵکی بکا، عەباس هەستا و وتارێکی بەکورتی خوێند و نوێژیکرد و پاشان کەوتە سەر ئەژنۆکانیا ووتی: «اللهم إياك نعبد و إياك نستعين، اللهم اغفرلنا وارحمنا وارض عنا»، واتە: (خوایە گیان تەنها و تەنها تۆ دەپەرستین و جگە لە تۆ ناپەرستین، تەنها و تەنها داوای کۆمەك و مەدەد لە تۆ دەکەین جگە لە تۆ داوا لە کەسی تر ناکەین،

(١) (تاريخ الطبري) أحداث سنة ١٧هـ، وانظر (تاريخ الاسلام) للذهبي، أحداث سنة ٢٠ هـ، غزوة تستر.

خوایەگیان لێمان خۆشبە و بەزەییت پێماندا بێتەوە و لێمان ڕازی بە ( پاشان ڕۆیشت، کە گەڕانەوە نە گەیشتنە ماڵ (چۆڕەی ئاویان دەهات)[1].

لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ئەڵێ: کاتێك تووشی بێ بارانی ببوایەن، عومەری کوڕی خەتاب دەیووت: ئەی خوایە ئێمە بە پێغەمبەرەکەت لێت دەپاڕاینەوە بارانت بۆ دەبارانىدین، وا ئێستا بە مامی پێغەمبەرەکەت لێت دەپاڕێینەوە[2]، بارانمان بۆ ببارێنە، ئەڵێ: ئیتر باران دەباری)[3].

### ❊ جەنگی نەهاوەند ٢١ ك:

موسوڵمانان سی هەزارن و نوعمانی کوڕی موقەرین سەرکردەیانە، بەڵام فارسەکان خۆیان قایم کردووە و دەرناچن لە بۆ جەنگ. توڵەیحەی ئەسەدی وتی: من وا بە باش ئەزانم کە کۆمەلا سەرباز بنێرین چاوبڕنە چاویان و داوای ڕووبەڕوو بوونەوەیان لێ بکەن و تووڕەیانکەن، کە ئەوان هاتنە دەر و پەلاماریاندا

---

(١) (البداية والنهاية) أحداث سنة ١٨هـ.

(٢) ئەم جۆرە تەوەسولە مەشروعە وهیچی تێدا نییە ئەوەی کە جائیزنییە ئەوەتا هاوار بکەیت بە ئامادە نەبوویەکی بێ توانا، ئاخر هەندێك لە سۆفیەکان ئەمە دەکەنە بەڵگە کەوا جائیزە هاوار بکرێتە پیاوچاکان، ئێمەش ئەڵێین: ئەگەر مەبەستان ئەوەیە: جائیزە هاوار بە پیاوچاکێکی مردو بکرێت، ئەوا ئەڵێین: ئەی بۆ هاواری نەکردە باشترین پیاوچاك کە پەیامبەری خوایەﷺ، ئەگەریش مەبەستان گۆڕی پیاوچاکە و هاواری لا بکەی، دیسانەوە ئەڵێین: باشترین و پیرۆزترین گۆڕ گۆڕی پەیامبەری خوایەﷺ، ئەی بۆ عومەر نەڕۆیشت بۆلای ئەو گۆڕە پیرۆزە؟! کە زۆریش لێوەی دوور نەبووە و لە پاڵ دەستی بووە! بەڵکو ڕۆیشت بۆلای پیاوچاکیکی زیندو کە عەباسی مامی پەیامبەرەﷺ، خۆ ئەگەر وتیان: نا مەبەستمان پیاوچاکێکی زیندووە، ئەوا ئێمەش هەر وامان ووتوە و پێچەوانەی ئەوەمان نەگوتووە. (وەرگێڕ).

(٣) رواه البخاري، كتاب الاستسقاء، باب سؤال الامام الاستسقاء، حديث (١٠١٠).

با ئەمان زوو ڕابکەن و بەرەو لای ئێمە بێن، کە بە دوای ئەماندا هاتن و گەیشتنە ئێمە خۆمانیش هەر هەموومان ڕائەکەین، ئیتر ئەو کاتە دڵنیا ئەبن کە دۆڕاوین، ئیتر لە پڕێکدا ئەوەندەی پێ ناچێ هەر هەموویان دێنە دەر، دوای ئەوەی کە لە حەشارگەکانیان بە تەواوەتی هاتنە دەر بۆیان دەگەڕێینەوە و بە شمشێرەوە دەکەوینە ناویان، تا بزانین خوای گەورە چی ئەکات.

خەڵك بۆچونەکەیان بە باش زانی، ئەوەبوو نوعمان، قەعقاعی کوڕی عەمری کرد بەئەمیری هێرشبەران و فەرمانی پێکردن کە بڕۆن بۆ شارەکە و دەوریان بدەن و هەر کە هاتنە دەر لە دەستیان ڕابکەن و هەڵبێن. قەعقاعیش چوو ئەوەی کرد، ئەوەبوو لە حەشارگەکانیان هاتنە دەرەوە، ئیتر قەعقاع و ئەوەشی لەگەڵیدا بوو ڕایانکرد و کشانەوە، فارسەکان ئەمەیان قۆستەوە و کەوتنە دوایان، ئیتر ئەوەی تولەیحە گومانی بردبوو هاتە دی، وتیان: خۆیەتی خۆیەتی، ئیتر هەر هەموویان دەرچوون یەك جەنگاوەر لە شاردا نەمایەوە، تەنیا دەرگاوانەکان نەبێ، تا گەیشتنە لای سوپاکە، نوعمانیش لە ئامادە باشیدایە، ئەمەش لەبەرە بەیانی ڕۆژی هەینیە.

خەڵك ویستیان بچن بە گژیاندا و شەڕ دەست پێبکا، بەڵام نوعمان نەیهێشت و فەرمانی کرد شەڕنەکەن هەتا خۆر ئاوا دەبێ، دەرونەکان هێور دبنەوە، ئەو کات سەرکەوتن لەلایەن خواوە دادەبەزێت هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد، بەڵام هەر پێداگیریان کرد بەشکو ڕازی بێ و هێرشیان بکەنە سەر، نوعمان قایل نەبوو -جا پیاوێکی زۆر خۆڕاگر و چەسپاو بوو-، هەر کە خۆر ئاوابوو نوێژی بە موسوڵمانان کرد و پاشان سواری ئەسپەکەی بوو- کە ڕەنگێکی سوری مەیلەو ڕەشی هەبوو- بە لای هەر ئاڵایەکدا تێدەپەڕی دەوەستا و هانی دەدا کە خۆڕاگر و چەسپاو بێ، هەروەها ئەو دەڕواتە پێشەوە تەکبیرێك دەکا

هەموو ئامادەباش دەبن بۆ هێرش، تەکبیرێکی تر دەکاتەوە ئەبێ هەموو بە تەواوەتی ئامادەبن، کە تەکبیری سێیەمی کرد ئەوکات لەگەڵیا هێرش دەست پێدەکات، پاشان گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی. فارسەکانیش لە ئامادە باشییەکی تەواودا بوون و ڕیزیان بەستبوو بە شێوەیەکی زۆر سامناك کە هەرگیز وەکو ئەوەیان نەدیبوو، زۆربەیان وەکو زنجیر ڕۆیشتبوونە نێو یەکەوە، دڕکی ئاسنینیان لە دوای خۆیانەوە دانابوو بۆ ئەوەی نەتوانن بگەڕێنەوە یا ڕا بکەن.

پاشان نوعمانی کوڕی موقەرین الله أکبری یەکەمی کرد و ئاڵاکەی لەراندەوە خەڵك هەمو ئامادە باش بوون، جارێکی تر الله أکبری کرد و ئاڵاکەی لەراندەوە خەڵکیش جارێکی تر ئامادە باش بوونەوە پاشان تەکبیری سێیەمی کرد و هێرشی کرد و موسڵمانانیش لەگەڵیا هێرشیان برد، ئاڵاکەی نوعمان دەلەریەوە وەکو لەرینەوەی (العُقاب)[1] لەسەر نێچیرەکەی، تا گەیشتنە یەك و شەڕ دەستی پێکرد، شەڕێك کە هەرگیز لەو شەڕانەی پێشووتر شتی وا ڕووی نەداوە، ڕوداوی وەك ئەمە نەبیستراوە. پاشان خوای تەعالا سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان نووسی.

## * وەفاتکردنی خالدی کوڕی وەلید ﷺ ٢١ ك:

خالد لەسەر جێگەی مردن بوو، ئەیووت: (دە بەخوا بەشداری ئەوەندە و ئەوەندە جەنگم کردوە لە پێشەنگی سوپاوە بووم، بستێك نییە لە جەستەمدا مەگەر شوێنی شیرێك یان ڕمێك یان تیرێکی پێوەیە، کەچی ئا ئەوەتا دەبینن وەکو وشتر چۆن دەمرێ لوتم بشکێ لەسەر جێگاکەم دەمرم، دەك چاوی ترسنۆکان قەت نەخەوێ).

(١) (العُقاب): داڵاش: مەلێکی گۆشت خۆری بەناوبانگە.

هەروەها ئەڵێ: (شەوێك کە تێیدا بڕۆمە لای بوکێك یان مژدەی منـداڵێکم پێبدرێت، پێم خۆشتر نییە لەوەی کە لەشـەوێکی پـڕ سـەرما و سـۆڵەدا لەگـەڵ موهاجیریندا بەیانیان لە نێو دوژمن پێ بکەمەوە)[1].

(١) (البداية والنهاية) ذكر من مات سنة ٢١ هـ.

# بەشی سێیەم

## خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لە ساڵی ٢٣ بۆ ٣٥ك

# باسی یەکەم

## عوسمان چۆن خیلافەتی گرتە دەست؟

*** چیرۆکی شورا :**

کاتێك لـە عومـەر ﷺ درا، خیلافـەتی خسـتە ئەسـتۆی شـەش کەسـەوە: عوسمانی کوڕی عەففان، عەلی کوری ئەبی تالـب، تەڵحـەی کـوڕی عوبەیـدوڵا، زوبەیری کوڕی عـەوام، عەبـدولڕەحمانی کـوڕی عـەوف، سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەقـاص، ئـەم چـیرۆکی شـورایە ئیمـامی بوخـاری لـە صـەحیحەکەی خۆیـدا گێراویەتیەوە (تا بزانین مێژوو زایە نابێت )، ئەوەتا دەبینی ئیمامی بوخـاری دوو قەزیەمان بۆ ڕیوایەت دەکات کە مشت ومڕی زۆریان لەسەر کراوە.

بوخاری چیرۆکێکی دورو و درێژ لە بارەی کوشتنی عومەرەوە ﷺ ڕیوایـەت دەکات، تا دەگاتە ئەوەی کە بە عومەر ﷺ گوتراوە: وەسیەت بکە ئەی ئەمیری ئیمانداران، جێنشینێك دابنێ.

ئەویش وتی: من کەس لەو کۆمەڵە بە شیاوتر نازانم کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کردو لە دەستیان ڕازی بوو، پاشـان نـاوی عـەلی و عوسمـان و زوبـەیر و تەڵحە و سەعد و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی هێنا.

وتی: (ئەوە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەبێتە شاهید بە سەرتانەوە، هیچیشی بە دەست نییە، ئەگەر هاتوو سـەعد بـوو بـە ئـەمیر، ئـەوە چـاکە، وەئەگـەرنا هەرکامتان بوو بە ئەمیر با پشتی پێ ببەسـتێ، ئـە مـن لەبـەر بـێ توانـایی و ناپاکی لەکارم لانەبردووە)[1].

---

(١) چونکە عومەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی لە کاربەدەستیی کوفە لابرد.

دوای ئەوەی لە ئەسپاردنی بوونەوە، هەموویان کۆبوونەوە، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: (کارەکەتان بدەن بە دەست سیانتانەوە).

زوبەیر وتی: من کارەکەم دایە دەست عەلی[1] تەڵحە وتی: من کارەکەم دایە دەست عوسمان.

سەعد وتی: من کارەکەم دایە دەست عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف.

ئا بەو شێوەیە سیان دەستیان هەڵگرت: زوبەیر و تەڵحە و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص.

کەواتە پاڵێوراوەکان مانەوە سیان: عەلی کوڕی ئەبو تالب و عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف.

(عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: کامتان دەست هەڵدەگرێت، تابیدەین بەوەکەی تر؟ پاشان وتی: ئەیدەنە دەستی من، سوێند بەخوا باشەکەتان هەڵدەبژێرم؟)

هەردووکیان وتیان: قبوڵمانە. ئەوەبوو دەستی یەکێکیانی گرت و پێی وت: تۆ فەزڵی خزمایەتی لەگەڵ پیغەمبەر و ﷺ زوومووسڵمان بوونت هەیە، جا سوێندت ئەدەم بەخوا ئەگەر تۆم کرد بە ئەمیر دادپەروەر ئەبی، ئەگەر عوسمانم کرد بە ئەمیر گوێڕایەڵ ئەبی و بەقسەی ئەکەیت.

---

(١) ئەم ڕیوایەتە ڕاستی مەسەلەکەمان بە تەواوەتی بۆ ڕوون دەکاتەوە کەوا زوبەیری کوڕی عەوام ڕقی لە عەلی نەبووە، ئاخر چۆن ڕقی لێ دەبێ لە کاتێکدا زوبەیر کوڕی صەفیەی پورێتی (خوشکی باوکی)، هەروەها هەڵیبژاردووە بۆ خیلافەت هەروەك لە ڕیوایەتەکەدا ڕوون و ئاشکرایە.

پاشان ڕووی کردە ئەوەکەی تریان -کە عوسمان بوو- هەمان شتی پێ ووت.

جا کاتێك پەیمانەکەی لێ وەرگرتن وتی: ئەی عوسمان دەستم بەرێ، بەیعەتی پێ داو، عەلیش بەیعەتی پێدا و هەموو ئەوانە لەماڵەکەدابون و هاتنە ژوورەوە و بەیعەتیان پێدا[١].

ئەمە ڕیوایەتی بەیعەت پێدانەکەی عوسمانە هەروەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە.

لێرەدا هەندێك ووردەکاری تر هەیە لە الصحیحدا[٢]دا هاتووە کەوا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف سێ ڕۆژ دانیشتووە و چاوەڕێی کردووە و پرسی بە موهاجیرین و ئەنسارِ کردووە. تا ئەڵێ: (سوێند بەخوا یەك ماڵم نەهێشتەوە لە ماڵەکانی موهاجرین و ئەنسار مەگەر پرسیارم لێکردون، نەمبینی کەس بە عوسمان هاوتابکەن )[٣].

کەوابوو بەیعەت وەرگرتنەکە ڕاستەوخۆ و لە خۆوە نەبووە، بەڵکو دوای ئەوەی پەیمانی لە هەردووکیان وەرگرتووە، سێ ڕۆژ دانیشتووە و پرس و ڕاوێژی کردووە، پاشان عوسمانی هەڵبژاردووە.

**ئەوەی جێی داخە، دەبینین کتێبە مێژووییەکانی سەردەم، کە باس لە ژیانی هاوەڵان دەکەن، پشت لە ریوایەتەکەی بوخاری دەکەن و ڕیوایەتە**

---

(١) (صحیح البخاری) کتاب فچائل الصحابه، باب قصه البیعه، حدیپ (٣٧٠٠).

(٢) لە زاراوەی ئەهلی عیلمدا هەرکات ئەم ئەلیفو لامەیان بە ووشەی (صحیح) ـەوە نا، ئەوا بە زۆری مەبەستیان صەحیحی بوخاریە یا موسلیم. (وەرگێڕ)

(٣) (صحیح البخاري) کتاب الأحکام، باب کیف یبایع الامام الناس، حدیث (٧٢٠٧).

**درۆینەکەی ئەبو میخنەف وەردەگرن کە لە مێژوەکەی تەبەریدا هاتووە. ئەمەش دەقەکەیەتی:**

کاتێك کە درا لە عومەری کوڕی خەتاب، پێی گوترا: ئەی ئەمیری ئیمانداران جێنشینێك دیاری بکە؟ وتی: کێ دەست نیشان بکەم؟ ئەگەر ئەبوعبیدەی کوڕی جەڕاح زیندوو بوایە هەڵم دەبژارد، ئەگەریش پەروەدگارم لێی پرسیم ئەڵێم: گوێم لە پەیامبەرەکەت بووە فەرموویەتی: ئەمینی ئەم ئومەتەیە. هەروەها ئەگەر سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە زیندو بوایە دەمکرد بەئەمیر، خۆ ئەگەر پەروەردگارم لێی پرسیم، ئەڵێم: گوێم لە پەیامبەرەکەت بووەﷺ فەرمویەتی: بەڕاستی سالم خوای زۆر خۆش دەوێ. پیاوێك پێی ووت: من پێت دەڵێم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دابنێ، ئەویش فەرموی: خوا بتکوژێ، بەخوا لەم قسەیەدا مەبەستت خوا نەبوو، تیا بچی، چۆن کەسێك بکەم بە خەلیفە نەیتوانی خێزانەکەی تەڵاق بدا، پێویستیمان بەکاروبارتان نییە، ستایشی خیلافەتم نەکردووە تا هانی یەکێك لە ماڵ ومناڵمی بۆ بدەم، ئەگەر خیلافەت چاك بێ، ئەوابەشی خۆمان لێ برد، ئەگەریش خراپ بێ، خۆ ئەمە خراپەیەکە و خاوخێزانی عومەری لێ دوور دەخرێتەوە و دەدرێتە مل عومەر، با خانەوادەی عومەر یەکێکیان موحاسەبەی لەگەڵ بکرێت لەسەر کاروباری ئومەتی موحەممەد ﷺ.

بەراستی خۆمم ماندوکرد و ماڵ و منداڵیشم مەحروم کرد، خۆ ئەگەر رزگاریشم بێ، بێ چاکە و بێ خراپە، ئەوە بەڕاستی دڵشادم، جا سەیر ئەکەم، ئەگەر خەلیفەم دانا، خۆ ئەوە لە من باشتر خەلیفەی داناوە -مەبەستی

ئەبویەکرە-، ئەگەریش وازم لێهێنا و کەسم دەست نیشان نەکرد، ئەوا لە من باشتر وازی لێهێنا -مەبەستی پەیامبەری خوایە ﷺ-، بە دڵنیاییەوە هەرگیز خوا دینی خۆی زایە ناکا.

ئیتر رۆیشتنە دەرەوە، پاشان گەڕانەوە، وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەگەر ڕاسپاردەیەك بەجێ بهێڵی؟ ئەویش فەرموی: لە ڕاستیدا دوای ئەو قسانەم، دامنابو تەماشایەك بکەم تا یەکێکتان بکەم بە ئەمیر، **کە لەبارترینتانە بۆ ئەوەی بەرەو هەقتان بەرێت و ئاماژەی کرد بۆ عەلی،** جا لە خۆچونێك دایگرتم و ماندوی کردم، بینیم پیاوێك رۆیشتە باخەکەیەوە و دەستی کرد بە ڕنینەوەی هەرچی سەوز و پێگەیشتووە و لە زەوی دەنا، لەمەوە تێگەیشتم کە خوای گەورە دەسەڵاتی بە سەر کاری خۆیدا دەشکێت و منیش دەمرم، بۆیە نامەوێ بە مردوی و بە زیندوی ئەمە بکێشم، من ئەو کۆمەڵە پیاوەتان لە ناو بەجێ دێڵم، کە پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ئەهلی بەهەشتن: سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل یەکێکە لەوانە بەڵام من نایخەمە ڕیزی ئەو شەشەوە، شەش کەسەکە بریتین لە: عەلی و عوسمان هەردوو کوڕەکەی عەبد مەناف، عەبدولڕەحمان و سەعد هەردوو لالۆکەی پەیامبەری خوا ﷺ، زوبەیری کوڕی عەوام کوڕی پوری و حەواری پەیامبەر ﷺ، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا، جا خەڵك با یەکێك لەوانە هەڵبژێرێت، هەرکامیانتان دەستنیشان کرد ئەوا چاك بن لەگەڵیدا و پشتی بگرن و سەری بخەن، هەر شتێکیان بە هەر کەسێکتان ڕاسپارد با بەجێی بهێنێ.

دیسانەوە رۆیشتنە دەرەوە، عەبباس بە عەلی ووت: لەگەڵیان مەڕۆ.

عەلی وتی: حەزم لە دووبەرەکی و جیاوازی نییە، ئەویش وتی: کەواتە ئەوەی حەزت پێی نییە دەیبینیت.

کاتێك بەیانی بووەوە عومەر بانگی عەلی و عوسمان و سەعد و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوامی کرد، پێیانی ووت: هەرچی چاوم گێڕا بینیم ئێوەن پێشەوا و دەم سپی خەڵك، خەلیفەش هەر لە ئێوە دەبێت، پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و لێتان رازی بوو، من لە هەڵوێستی خەڵك دڵنیام لە ئاست ئێوە ئەگەر بە چەسپاوی بمێننەوە، بەڵام لە ئێوە دڵنیانیم، لەوەی جیاوازی و دووبەرەکی لە نێوانتاندا ڕوویدات، بەهۆی ئێوەشەوە دووبەرەکی بکەوێتە نێو خەڵکەوە، هەستن بڕۆن بۆ ژورەکەی عائیشە و ڕوخسەتی لێ بخوازن و پاشان ڕاوێژبکەن و یەکێکتان هەڵبژێرن.

دوای ئەوە وتی: نا، مەڕۆنە ژوورەکەی عائیشەوە، بەڵام نزیك بن، پاشان سەری لە زەوی دانا و خوێن بە لاشەیدا دەچۆڕا و تەواو لاوازی کردبوو.

ئەوانیش ڕۆیشتنە ژوورەوە و دەستیان کرد بە ورتە ورت لەگەڵ یەکتردا، تا دەنگیان بەرز بوویەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر- دای بەگوێی عومەردا و- وتی: سبحان الله، هێشتا ئەمیری ئیمانداران نەمردووە، ئەویش بە ئاگا هاتەوە وفەرموی: هەر هەمووتان واز لەمە بێنن، ئەگەر مردم ئەوا سێ ڕۆژ ڕاوێژ لە گەڵ یەکتردا بکەن، با صوهەیب نوێژ بە خەڵکی بکات، ڕۆژی چوارەم نەهاتووە ئەبێ ئەمیرێکتان دەست نیشان کردبێ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وەکو ڕاوێژکار ئامادە دەبێت، بەڵام هیچ بەدەستە، تەڵحەشتان لەگەڵ دایە، ئەگەر لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا تەشریفی گەیشت بهێننە لای خۆتان، بەڵام ئەگەر سێ ڕۆژەکە تێپەڕی و

نەگەیشت، ئەوا ئێوە ئیشی خۆتان بکەن. کێ ئەڕواتە شوێن تەڵحە بۆم؟ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص وتی: مـن دەڕۆم، -إن شاء الله- دێتە خزمەت. عومەر فەرمووی: ئومێدم هەیە -إن شاء الله- ئامادەبێت. واشنازانم کەس ئەم کارە بەدەست بگرێت مەگەر یەکێك لەم دوو پیاوە نەبێت: عەلی یان عوسمان.

ئەگەر عوسمان بوو بە خەلیفە، ئەو نەرمونیانە، ئەگەریش عەلی بوو بە خەلیفە ئەو گەمەچییە، شایستە ترینتانە کە بەرەو ڕێگەی هەقتان بەرێت.

گەر هاتوو سەعدیان دانا، ئەوە بەڕاستی شایستەیە و هەر بۆخۆی کراوە، گەرنا با ئەوەی دادەنرێت پشتی پێ ببەستێت، لە ڕاستیدا من لەبەر ناپاکی ولاوازی لە کارم نەخستووە، ئەگەریش پیاوێکی خاوەن ڕەئی هەبێت عەبدولڕحمانی کوڕی عەوفە، یاریدەرێکی ڕێنیشاندەرە لەلایەن خواوە، گوێی بۆ بگرن.

پاشان بە ئەبو تەڵحەی ئەنساری ووت: ئەی ئەبو تەڵحە خوای بەرز و بڵند ئیسلامی بە ئێوە سەر بەرزکرد، جا پەنجا پیاو لە ئەنسارِ هەڵبژێرە، هانیان بدە تاکو یەکێك لە خۆیان هەڵبژێرن.

بە میقدادی کوڕی ئەسوەدی ووت: ئەگەر منتان خستە نێو گۆڕەوە ئەو شەش کەسە کۆ بکەرەوە، تا یەکێکیان هەڵبژێرن.

ئینجا بە سوهەیبی ووت: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تۆ نوێژ بەخەڵکی بکە، هەرکام لە عەلی و عوسمان و زوبەیر و سەعد و عەبولڕحمانی کوڕی عەوف و تەڵحە هاتنە پێشەوە، پێشیانخە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش بێنە، بەڵام هیچی بەدەست نییە، لەسەر سەریان ڕاوەستە، ئەگەر پێنجیان کۆبونەوە و لە سەر یەکێکیان کۆك بوون و یەکێکیان ڕازی نەبوو، **ملی بشکێنە** یان بە شمشێر لە ملیدە.

ئەگەر چواریان لەسەر یەکێکیان کۆك بوون و دووانیان ڕازی نەبوو، **لە ملی ئەو دوانەش بدە**، ئەگەر سیانیان بە یەکێکیان ڕازی بوون و سیانەکەی تریان بە یەکێکی تریان ڕازی بوون و عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان کرد بە دادوەر، ئەو لایەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێی ڕازیە، با یەکێك لە خۆیان هەڵبژێرن، بەڵام ئەگەر بە دادوەری عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕازی نەبوون، ئەوا لەگەڵ ئەو لایەنە بن کە عەبدولڕحمانی کوڕی عەوفی تێدایە، **هەرچی مایەوە لەوانەی ڕازینابن بەوانەی خەڵك لە سەری کۆکن بیانکوژن**[1].

منیش ئەڵێم: ئەمە ڕیوایەتەکەی ئەبو میخنەفە، کە چەندین شتی پێچەوانەی ڕیوایەتەکەی بوخاری تێدایە، هەروەها سەرباری چەندین زیادەی نەشیاو و نابەجێ، لەوانە: حەڵاڵ کردنی خوێنی ئەوانەی خودی عومەر لەبارەیانەوە دەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کردوە و لێیان ڕازی بووە !!

سبحان الله! عومەر رضي الله عنه چۆن کوشتنی ئەو هاوەڵە بەرز و بەڕێزانە، عوسمان و عەلی و تەڵحەو زوبەیر و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سعد کوڕی ئەبی وەقاص، بە حەڵاڵ دەزانێ، لە کاتێکدا خۆی ئەڵێ: ئەمانە ئەو کەسانەن، کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە و لێیان ڕازی بووە، ئا ئەمە ناڕاستی و پوچی ئەم ریوایەتە پیشان دەدات، دوای ئەوەش ئەمە کێیە جورئەت ئەکات ئەو بڕیارە تەنفیز بکات؟ ! ئەی باشە ئەکرێت جێ بە جێش نەکرێت؟ ! لە ڕاستیدا تەنها درۆیەکی هەڵبەستراوە و هیچی تر، پاشانیش بە ئاماژە بەڵکو بە ڕاشکاوی لە پێشتری عەلی تێدایە بۆ خیلافەت.

---

(١) (تاريخ الطبري) (٣/٢٩٢).

*** عوسمان شایستەترە بۆ خیلافەت:**

دوای ئەوە خەڵك لەسەر عوسمان کۆك بوون و بەیعەتیان پێدا، کە باشترین هاوەڵی پەیامبەرەﷺ لە دوای ئەبوبەکر و عومەر، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەرؓ کە دەڵێ: لە دوای پەیامبەری خواﷺ کەسمان بەهاوتا و هاوشانی ئەبوبەکر نەدەزانی، دوای ئەو عومەر و ئینجا عوسمان، ئیتر فەزڵی کەسمان بە سەر کەسدا نەدەدا[1] لە ریوایەتێکی تردا ئەڵێ: جا پەیامبەری خوایشﷺ گوێی لێمان دەبوو و ئینکاری لێ نەدەکردی[2]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە بارەی بەیعەت پێدانەکەی عوسمانەوە ئەڵێ: (باشترینی کەسێکی نێومان کرا بە خەلیفە، کە لە سەرووی هەمومانەوە بوو)[3] هەربۆیە ئیمامی ئەبو ئەیوبی کوڕی ئەبو تەیمیەی سەختیانی و ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی دارەلقوتنی دەڵێن: هەرکەس عەلی بخاتە پێش عوسمانەوە، ناماقوڵی وبێ ڕێزی بەرانبەر موهاجیرین و ئەنسار کردووە، چونکە عەبدولڕحمانی کوڕی عەوف ئەڵێ: بەخوا یەك ماڵم نەهێشتەوە لە ماڵەکانی موهاجرین و ئەنسار مەگەر پرسیارم لێکردون، جا نەمبینی کەس بە عوسمان هاوتابکەن، هەمویان عوسمانیان بە باشتر دەزانی.

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب عثمان، حديث (٣٦٩٧).

(٢) (المعجم الكبير) للطبراني (١٣١٣٢/١٢).و (السنة) للخلال ص (٣٩٨). و (السنة) لابن أبي عاصم (٥٥٣). وقال محققه العلامة الألباني: (إسناده صحيح).

(٣) (السنة) للخلال، ص (٣٢٠).

ئەوەبوو بە بەیعەتپێدانێکی گشتی بەیعەتی خیلافەت درا بە عوسمانی کوڕی عەففان.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: ئەڵێت: هیچ کام لە خەلیفەکان بەیعەتەکەیان بە ئەندازەی بەیعەتەکەی عوسمان جەخت لەسەرکراو نەبوو، لەبەر ئەوەی بەیعەت پێدانەکەی بە کۆڕای دەنگی خەڵك بوو[1].

**ئەوەشی کە ئەهلی سوننەی لەسەرە ئەوەیە:** هەرکەس عەلی بخاتە پێش ئەبوبەکر و عومەرەوە ئەوا گومڕا و موبتەدیعە، بەڵام هەرکەس عەلی بخاتە پێش عوسمانەوە ئەوا بە هەڵەدا چووە، نە بە گومڕا و نە بە موبتەدیعی نازانن، ئەمە ئەگەر چی هەندێك لە زانایان هەر لەمەڕ ئەو مەسەلەیە زۆر توندن چونکە ئەڵێن:

(هەرکەس عەلی بخاتە پێش عوسمانەوە، وەکو ئەوە وایە بڵێت هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ناپاکیان لە ئەمانەتەکە کردووە، بەوەی ڕۆیشتوون عوسمانیان پێش عەلی خستووە -ڕەزای خوا لە هەموویان بێت-).

❋ ❋ ❋

(١) (السنة)للخلال، ص (٣٢٠).

# باسی دووەم
## عوسمانی کوڕی عەففان لە چەند دێڕێکدا

*** ناو ورەچەڵەکی:**

ناوی عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەبد شەمسی کوڕی عەبدولمەنافە، لە عەبدولمەنافدا لەگەڵ پەیامبەری خوا ﷺ بەیەك دەگەن.

دایکی ئەڕوای کچی کوڕەیزی کچی ڕەبیعەیە.

داپیرەشی ئوم حەکیمی کچی عەبدولموتەلیبە پوری پەیامبەرە ﷺ[1].

*** نازناو وکونیەکەی :**

نازناوی (ذو النورين)ی لێنرا، چونکە ڕوقەییەی کچی پەیامبەری خوا ﷺ خێزانی بووە، کە ئەویش وەفاتی کردوە ئوم کەلسومیشی مارە کردوە[2].

کونیەکەی ئەبوعەبدوڵلا وئەبو عەمرە، هەر زوو لەسەر دەستی ئەبوبەکری صدیق موسڵمان بووە[3]. کۆچی بۆ حەبەشە کردوە و پاشانیش بۆ مەدینە.

*** خێزانەکانی و منداڵەکانی:**

خێزانەکانی عوسمان بریتین لە:

---

(١) (معرفة الصحابة) (١/٢٣٥).
(٢) (معرفة الصحابة) (٢/٢٤٥).
(٣) (الإصابة) (٢/٤٥٥).

١. ڕوقه‌ییه‌ی كچی په‌یامبه‌ری خواﷺ.

٢. ئوم كه‌لسومی كچی په‌یامبه‌ری خواﷺ.

٣. فاخیته‌ی كچی غه‌زوان.

٤. ئوم عه‌مری كچی جوندوب.

٥. فاتیمه‌ی كچی وه‌لیدی كوڕی عه‌بد شه‌مس.

٦. ئوم به‌نینی كچی عویه‌ینه.

٧. ڕه‌مله‌ی كچی شه‌یبه‌ی كوڕی ڕه‌بیعه.

٨. نائیله‌ی كچی فرافصه.

* منداڵه‌كانی :

كوڕه‌كان: عه‌بدوڵلا - عه‌بدوڵلای بچوك - خالد - ئه‌بان - عومه‌ر - سه‌عید - عه‌بدولمه‌لیك - عه‌مر - عه‌نبه‌سه.

كچه‌كان: مه‌ریه‌م - ئوم سه‌عید - عائیشه - مه‌ریه‌م (یه‌كێكی تر) - ئوم به‌نین.

* فه‌زڵه‌كانی :

له عه‌بدولڕه‌حمانی كوڕی سه‌موره‌وه ئه‌ڵێ: كاتێك په‌یامبه‌ری خوا ﷺ سوپای ته‌نگانه (جیش العسرة)ی ئاماده‌كرد، عوسمان هات بۆلای په‌یامبه‌ری خوا ﷺ و هه‌زار دیناری له نێو كراسه‌كه‌ی بوو، ڕژاندییه چاكی په‌یامبه‌ری خوا ﷺ، په‌یامبه‌ری خواش ﷺ ئه‌م دیو و ئه‌ودیوی به پاره‌كه ده‌كرد و ئه‌یفه‌رموو:

«ماضر عثمان ما عمل بعد يوم»[١]، لە مـرۆوە عوسمـان هەرچـی بکـات زیـانی لێنادات، ئەمەی هەر دووبارە دەکردەوە[٢].

لە ئەبی موسای ئەشعەریەوەﷺ ئـەڵێ: (عوسمـان دای لـە دەرگـای مـاڵی پەیامبەرﷺ، پەیامبەری خواﷺ فەرمووی: بیکـەرەوە و مـژدەی بەهەشتیشـی بدەرێ، دوای بەلا و موسیبەتێك کە دێتە ڕێی)[٣].

١. لە ئەنەسەوەﷺ ئەڵێ: (پەیامبەری خواﷺ لەگەڵ ئەبوبکر و عومـەر و عوسمانـدا ڕۆیشـتنە سـەر کێـوی ئوحـد، کێوەکـە لەریـەوە، پەیامبـەری خـوا ﷺفەرموی: ڕاوەستە ئەی ئوحد، تـۆ تـەنها پەیامبـەرێك و ڕاسـتگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە)[٤].

٢. لە ئیبن عومەرەوەﷺ وتی: (ڕۆژێ پەیامبەری خـواﷺ هـات بۆلامـان پێی وتین: کـە خـەوتبووم بینـیم وەکـو ئـەوەی (المقاليـد) و (المـوازين)م پێـدرا،

(١) لەبەر ئەمەیە هەندێك لە شیعە ئەڵێن -گەر بیستبێتت-: خوایەك ئەوەندە پولەکی بـێ!! لە تاوانبارێکی وەك عوسمان خۆش بێ بەهۆی پارەوە.. ئەوە خوای ئێمە نیە و نامانەوێ.

(٢) أخرجه أحمد في ( المسند) (٦٣/٥) ڕیوایەتەکە کەسیری کوڕی ئەبی کەسیری خزمەتکاری عەبدولرەحمانی کوڕی سەمورەی تێدایە کە: حاڵی مجهولە، بەڵام ئـەلبانی لـە(مشـكاة المصـابيح)دا (٦٠٦٤) بە حەسەنی داناوە.

(٣) (متفق عليه): (صحيح البخاري )كتاب المناقب، باب مناقب عثمـان، حـديث (٣٦٥٩)، و (وصحيح مسلم)كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل عثمان بن عفان، حديث (٢٤٠٣).

(٤) (متفق عليه): (صحيح البخارى) كتاب فضائل الصحابه، باب قول النبى ﷺ ((لو كنت متخذا خليلا))، حديث(٣٦٧٥). و أخرجه مسلم فى(صحيحه) كتاب فضـائل الصحابه، باب مـن فضائل طلحة والزبير، من حديث أبى هريره(٢٤١٧).

(المقاليد) بريتيە لە کليلەکان، [(الموازين)يش بريتيە لەوەی شتی پێدەپێون][(١)]، خرامە نێو يەکێك لە تای تەرازووەکە وئوممەتەکەشم خرايە نێو تاکەی تر، من لە ئوممەتەکەم سەنگين تر بووم، ئينجا ئەبوبەکريان هێنا، ئەويش لەوان سەنگين تربوو، ئينجا عومەريان هێنا ئەويش لەوان سەنگين تربوو، ئينجا عوسمانيان هێنا ئەويش لەوان سەنگين تربوو، پاشان بەرزکرايەوە، پياوێك وتی: ئەی ئێمە لەکوێين؟! ئەويش فەرمووی : (لەوێن کە خۆتان هەڵتان بژاردووە [(٢)].

## * لە نيشانەکانی پەيامبەرايەتی :

لە مووڕەی کوڕی کەعبەوە ﷺ ئەڵێ: گوێم لە پەيامبەری خوا بووﷺ باسی فيتنەی دەکرد، زۆر نزيکی کردەوە، (وەکو ئەوەی هاتنی ئەو سەردەمە زۆری نەمابێ)، لەو کاتەدا پياوێك بەوێدا تێپەڕی و دەم وچاوی هەڵپێچابوو، پەيامبەرﷺ فەرمووی: (ئەمە لەو ڕۆژەدا لەسەر هەق و هيدايەتە)، مووڕەی کوڕی کەعب ئەڵێ: بە دوايدا ڕۆيشتم بينيم عوسمانە[(٣)].

لە عائيشەوە -ڕەزای خوای لێبێ- ئەڵێ: (پەيامبەری خوا ﷺ فەرمويەتی: ئەی عوسمان ئەگەر هاتو ڕۆژێك خوای گەورە تۆی کرد بەکاربەدەست و

---

(١) ئەوەی لە نێوان ئەم دوو کەوانەدايە [] زيادەی ترن لە ڕيوايەتی تردا هاتووە، بەڵام نوسەر نەيهێناون، بۆيەش هێنام زياتر مەبەست ڕوون دەکەنەوە. (وەرگێڕ).

(٢) أخرجه أحمد في ( المسند)(٧٦/٢): عوبەيدوڵلای کوڕی مەڕوانی تێدايە: کە مەجهولە، بەڵام فەرمودەکە شێخ أحمد شاکر بە صحيحی داناوە، فەرمودەی (٥٤٦٩).

(٣) أخرجه الترمذي، کتاب: المناقب، باب مناقب عثمان، حديث (٣٧٠٤) باسناد صحيح.

موونافیقەکان ویستیان ئەو کراسەی کە خوای گـەورە لەبـەرتی کـردوە، لەبـەرتی داکەنن، نەکەی بە گوێیان بکەی!)[١].

سەرباری ئەو تەم و مژیەی کە لەلایەن نەزان و درۆزن و گومڕاکانەوە دروست کراوە، بـەڵام لەڕاسـتیدا سـەردەمی خیلافـەتی عوسمـان بـە سـەردەمی زێـڕین دادەنرێت لە ماوەی هەموو خەلیفە راشدیەکاندا، لە سەردەمی ئەمدا بوو سنوری دەوڵەتی ئیسلامی فراوانی بە خۆوە بینی، لە سەردەمی ئەمدا باکوری ئەفریقیا و ئەسکەندەریە فەتح کران و یەکەمین کەشـتی گـەلی ئیسـلامیش دروسـت کـرا، هەروەها ئەرمینیا و ئازەربایجان فەتح کـرا، هـەروەها فـەتحکردنی هەرێمـەکانی فارس لە سەردەمی ئەمدا گەیشتە کۆتایی وە خۆشگوزەرانی و هەرزانی و ئـەمن و ئاسایش و بەخشین باڵی بەسەر سەرانسەری دەوڵەتی ئیسلامیدا کێشا.

جا ئەم خۆشگوزەرانی و فتوحاتە بەردەوام بـون بـە بـەردەوامی خیلافـەتی عوسمان، بۆ ماوەی دوازدە ساڵ، پاشان فیتنە لە ساڵی ٣٥ ك سەری هەڵـدا، کـە کۆمەڵێك موجریم و ستەمکار دەرچوون و بەستەم و ناهەقی هەر لە ماڵەکەی کە بەڕۆژوو بوو و خەریکی قورئان خوێندن بوو کوشتیان.

*** 

(١) سنن بن ماجة المقدمة، باب فضائل أصحاب النبي ﷺ حديث (١١٢).

# باسی سێیەم

## گرنگترین ڕوداوەکانی خیلافەتی عوسمان رضي الله عنه

بەڕاستی سەردەمی عوسمان پڕ بوو لە فتوحات، ئەمەش بۆ ماوەی دە ساڵ درێژەی کێشا، بە شێوەیەك لە ماوەی ئەم ساڵانەدا توانرا سنوری دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بکرێت، هەر لەو سەردەمی ویدا موعاویە قوبرسی ڕزگار کرد، سەرەتا عومەر جەنگی لە ڕێگەی دەریاوە قەدەغە کردبوو، بەڵام عوسمان ڕێگەی دا، بەو هۆیەوە ئازەر بایجان و ئەرمەنیە و کابول و سەجستان و.. گەلێ ناوچەی تریش فەتح کران، هێرشە مەزنەکەی (ذات الصواری) یش هەر لەسەردەمی ئەمدا بوو.

هەروەها گەورەترین فراوانبوونێك کە ئیسلام لە دەمەکانی خەلیفە ڕاشدیەکاندا بە خۆوە دیتبێتی، سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان بووە رضي الله عنه، هەروەها هەستا بە فراوانکردنی هەردوو مزگەوتی پەیامبەر و ماڵی خوا.

❊ ❊ ❊

### ١. جەنگی ئەفریقیا ساڵی ٢٧ ك[1].

عوسمان ﷺ فەرمانی کرد بە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح، غەزای ئیفریقیە بکات، ئەگەریش هاتوو خوا ئەو دەرگایەی بۆ کردەوە و فەتحی کرد، ئەوا پێنج یەکی پێنج یەکەکەی پێ دەبەخشێ (خُمس الخمس).

ئەویش بە دە هەزار تێکۆشەرەوەوە بەڕێکەوت، ئەوەبوو بە دەشت وچیاوە فەتحی کرد، خەڵکەکەیشی هەموو هاتنە نێو ئیسلامەوە، ئیتر عەبدوڵڵا پێنج یەکی پێنج یەکەکەی بردوو و چوار بەشی پێنجیەکەکەی بۆ عوسمان ڕەوانە کردەوە، ئەویش لە دەستەکەوتەکە چوار بەشی پێنجیەکەکەی دابەشکردە سەر سوپاکە، هەر سوارێ سێ هەزاری بەر کەوت، هەزاری بۆ خۆی و دوو هەزاریشی بۆ ولاخەکەی، پیادەکانیش هەزار دیناریان بەرکەوت.

### ٢. ڕوداوی جرجیر و بەربەر لەگەڵ موسوڵمانان‌دا ساڵی ٢٧ ك:

دوای ئەوەی موسڵمانان بە بیست هەزارەوە بەرەو ئەفریقیا بەڕێکەوتن، بە فەرماندەیی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح، جا ئەم سوپایە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێری تێدابوو، ئەوەبوو پادشای بەربەر (جرجیر) بە سەد و بیست هەزار سەربازەوە بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی موسوڵمانان کەوتنە ڕێ، هەندێك ووتویانە: دوو سەد هەزار، هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن، ئەوەبوو بە فەرمانی (جرجیر) دەوری موسوڵمانان گیرا وەك خەرمانەی مانگ، ئەو ڕۆژە سوپای موسوڵمانان کەوتە حاڵەتێکی زۆر سامناك و ترسناکی واوە، کە هەرگیز هاوشێوەیان نەدیبوو، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر دەڵێ: لە پشت ڕیزەکانەوە

(١) (البداية و النهاية) (٧/١٥٧).

تەماشای پاشاکەیان (جەرجیر)م دەکرد لەسەر ئەسپێك بوو، دوو کەنیزەك بۆ سێبەر پەڕی تاوسیان لە بۆی هەڵدابوو. ڕۆیشتم بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح و داوام لێ کرد کە چەند کەسێکم لەگەڵدا بنێرێت و لە پشتەوە بمپارێزن، نیازی کوشتنی پاشاکەیانم هەیە، ئەوەبوو چەند پیاوێکی ئازای لەگەڵ ڕەوانە کردم و فەرمانی پێکردن کە لە پشتەوە بمپارێزن، ئەوانیش لە پشتەوە پارێزگاریان لێکردم. بەرەو لای پاشا بەڕێکەوتم، بە نێو ڕیزەکاندا دەڕۆیشتم و لێکم دەترانزاندن ـ وایان دەزانی پەیامێکم پێیە لە بۆ پاشا-، کە نزیك بوومەوە زانی نیازی کوشتنیم هەیە بە ئەسپەکەوە هەڵهات، منیش شوێنی کەوتم و ڕمێکم لێدا و پاشان بە شمشێرەکەمەوە هەڵم کوتایە سەری و کوشتم، ئینجا سەریم هەڵگرت و خستمە سەر نوکی ڕمەکە و ألله أکبرم کرد، بەربەریەکان هەرکە ئەوەیان بینی، ترسان و هەڵهاتن، وەکو کوڕکور[1] ڕایان دەکرد، ئەمانیش دوایان دەکەوتن و بەدیلیان دەگرتن، ئەوەبو موسوڵمانەکان غەنیمە و پارەیەکی زۆریان دەست کەوت، لەگەڵ دیلێکی زۆردا، ئەمانە هەمووی لە ناوچەیەك بوون پێی دەگوترا(سبیطلە)- بە دووری دوو ڕۆژ لە قەیرەوانەوە-، جا ئەمە یەکەمین ڕووداو بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بە هۆیەوە ناسرا[2].

---

(١) کەڕەواڵە، بە عەرەبی (القطا) ی پێ دەوترێ، هەندێکیش هەر بە ناوە عەرەبیەکەیەوە (قەتێ) و (قتك) یشی پێ دەڵێن. (وەرگێڕ).

(٢) (البداية والنهاية) أحداث سنة سبع وعشرين، وقعة جرجير والبربر. وانظر: (تاريخ خليفة بن خياط ) ١ /٣٤).

### ٣. جەنگی «ذات الصواری»ساڵی ٣١ ك:

قوستەنتینی کوڕی هیرقل لەگەڵ بەربەریەکاندا ڕۆمی کۆکردەوە بۆ بەگژا چونەوەی موسوڵمانان، ئەمەش لە ژمارەیەکی بێ وێنەدا، بەرەو لای عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح و هاوەڵەکانی لە شاری مەغرب بەڕێکەوتن.

هەردوولا بەیەك گەیشتن، ئەو شەوە ڕۆمەکان تا بەیانی سەرگەرمی خاچپەرستی بوون، موسوڵمانانیش تا بەیانی هەر خەریکی نوێژکردن و قورئان خوێندن بوون، کە رۆژ بوویەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح تێکۆشەرەکانی ڕیز کرد و ئامۆژگاری کردن بە یادکردنی خوای پەروەردگار و قورئان خوێندن.

لە سەرەتادا باکە لەگەڵ رۆمی و بەربەریەکاندا بوو، بەڵام دواجار باکەش نەما، موسڵمانەکان بە رۆم و بەربەریەکانیان ووت: گەر دەتانەوێ دائەبەزینە خوارێ بۆ وشکاییەکە، وتیان نا! شەڕ دەستی پێکرد، ئەوەبوو خوای گەورە سەرکەوتنی دابەزاند بۆ موسوڵمانان، قوستەنتین و سوپاکەی لەترسان هەڵهاتن، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرحی ماوەیەك هەر لە (ژات الصواری)دا مایەوە، پاشان بە سەر بەرزی و دەست پڕی گەڕایەوە[1].

### ٤. فراوان کردنی مزگەوتی پەیامبەر ﷺ.

### ٥. دروستکردنی یەکەمین کەشتی گەلی دەریایی.

### ٦. دووبارە کۆکردنەوەی قورئان.

---

(١) (البداية والنهاية) أحداث سنة ٣١ هـ.

بۆ ئەم کارە چوار کەسی ڕاسپارد: سێ قورەیشی و ئەنساریەك.

قورەیشیەکان بریتی بوون لە: عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر وسەعیدی کوڕی عاص وعەبدولڕەحمانی کوڕی حارس.

ئەنساریەکە زەیدی کوڕی سابت بوو.

کە پەڕاو ( مصحف )ـەکان تەواو بوون و نوسرانەوە ڕەوانەی شارەکانی تر کرا، عوسمان بە تەنها ڕەوانەکردنی ئەو موصحەفانە وازی نەهێنا، کە ئیتر ببنە مەرجەع بۆ خەڵکی و تەواو، بەڵکو لەگەڵ هەر موصحەفێکدا زانایەکی قورئانی خوێنی ڕەوانە دەکرد، کەوا لەسەر ئەو موصحەفە خەڵك فێری قورئان خوێندن بکات.

ئەوەبوو زەیدی کوڕی سابتی لە مەدینە دانا، عەبدوڵلای کوڕی سائبی ڕەوانەی مەککە کرد، موغیرەی کوڕی هیشامی بۆ شام و عامری کوڕی قەیس بۆ بەسرە و ئەبو عەبدولڕەحمانی سولەمی بۆ کوفە، موصحەفی شەشەمی لە مەدینە لە لای خۆی هێشتەوە، ئەمەش ئەو موصحەفەیە کە پێی دەوترێت (موصحەفی ئیمام).

❊ ❊ ❊

# باسی چوارەم

## دەستپێکردنی فیتنە

لەساڵی ٣٤ی کۆچیدا فیتنە دەستی پێکرد، لەوکاتەی کە هەندێك خەڵکی نەزان و بێ ئەرزش ویستیان لە عوسمانی کوڕی عەففان دەرپەڕن، عوسمان گرتنی و لەو کارەخراپەیان ئاگاداری کردنەوە و پاشان بەرەڵای کردن، بەڵام ئارامیان نەبوو، زیاتر خۆیان ئامادەکرد، جارێکی تر لە ساڵی ٣٥ کۆچی بە نیازی حەجەوە کەوتنە ڕێ و هاتنە مەدینە و ئەمیری ئیماندارانیان لە ماڵەکەی خۆیدا گەمارۆدا، پاشان دوای چل ڕۆژ لە گەمارۆدان شەهیدیان کرد، لەم ماوەیەدا لە هەموو شتێك بێ بەشیان کرد بوو تەنانەت لە نوێژی جەماعەتیش.

**هۆکارەکانی فتنەکە:**

**هۆکاری یەکەم: کە هۆکارێکی سەرەکییە، بریتیە لە پیاوێکی یەهودی بە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء[1].**

لە ڕاستیدا ئەوانەی پێشوو لە کۆندا یەکلا بوون لەوەی کە ئەم کەسایەتیە بوونی هەبووە، تەنانەت تاقمێکیان بەو ناوەوە ناو ناوە (سەبەئیەکان)، کە کۆمەڵێ دید و بۆچونی تایبەت بەخۆیان هەبووە و باسیان کردووە، بەڵام لەوانەی ئینکاری ئەم مەسەلەیان کردووە[1]، پیاوێکە بەناوی مورتەزا عەسکەری، لە کتێبی (عبدالله بن سبأ، وأساطير أخرى).

---

(١) بڕوانە کتێبی: (عبدالله بن سبأ هل هو حقيقة أم خيال).

(١) لەوەی کە ئیبن سەبەء ئەسڵ وئەساسی نییە و بوونی نەبووە بەڵکو دروستکراوە. (وەرگێڕ)

هەروەها لەو کەسانەی کە ئینکاری بوونی ئیبن سەبەئیان کردوە (تەها حوسێن)ـە، لە کتێبی (علی و بنوه)، هەروەها خەڵکی تریش، سەبارەت بە (تەها حسین) ئەوە هەر لەسەر ڕێبازە خوو گرتووەکەی خۆی هیچی زیاد نەکردووە، لە ئینکاردکردنی شتە یەقینی و حاشا هەڵنەگرەکان، هەروەك لە کتێبەکەیدا (في الشعر الجاهلي)[1] هاتووە، ئینکاری ئەوە دەکات کە ئیبراهیم و ئیسماعیل ﵄ کەعبەیان دروست کردبێت و ئەڵێت: (**قورئان بۆی هەیە باسی ئەمەمان بۆ بکات، بەڵام مەرج نییە ڕووی دابێ**)، ئەو هەر لەسەر ڕێبازی بە گومان بوون لە هەمو شتێك دەڕۆیشت.

سەبارەت بە عەسکەری، ئەو هەوڵی زۆری داوە لە خەڵکی بشێوێنێ، وا دەرئەبڕێ کە ڕێگایەکی زانستی گرتۆتەبەر بۆ ڕونکردنەوەی مەسەلەکە و کە هەستاوە بە کۆکردنەوەی هەرچی حەدیس و ڕیوایەت هەیە باسی ئیبن سەبەء دەکات، پاشان لای جێگیر بووە کە هەموو ڕیوایەتەکان لە ڕێگەی سەیفی کوڕی عومەرەوەیە، ئەم سەیفەش درۆزنە، کەواتە عەبدوڵلای کوڕی سەبە بوونی نییە، **بەڵام ئەم بۆ چونەش هەڵە و پوچە لەچەند ڕویەکەوە:**

١. لە لای ئیبن عەساکر هاتووە لە ڕێگەی عەمماری دهنیەوە لە ئەبی توفەیلەوە، هەروەها لە ڕێگەی شوعبەوە لە سەلەمەوە لە زەیدی کوڕی وەهبەوە باسی ئیبن سەبەئی کردووە کاتێك هێناویانە بۆلای عەلی، ئەمەش لە ڕێگەی سەیفی کوڕی عومەرەوە نییە[1].

---

(١) بڕوانە لاپەڕە ٣٤.

(١) (تاريخ دمشق) (٦/٢٩) في ترجمة عبدالله بن سبأ.

٢. زۆربەی مێژوونوس و فەرمودەناس و نووسەرەکانی شیعە، لە کتێبەکانی خۆیاندا ئیسپاتی ئەم کەسایەتیەیان کردووە.

- ئەوە ( نۆبەختیە ) لە کتێبی ( فرق الشیعة )دا، دوای ئەوەی باسی قسەکانی ئیبن سەبەء دەکات، ئەڵێت: ئەم تاقمە ناودەبرێن بە گروپی (سەبەئیەکان) کە بریتین لە شوێنکەوتوانی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء[(١)].

ئەم نۆبەختیەش لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا مردووە.

- ( الكشّي ) لە کتێبی ( رجال الشیعة )دا لە ئەبی جەعفەرەوە ڕیوایەت دەکات، کە ووتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء بانگەشەی پەیامبەرایەتی ئەکرد و ئەیوت ئەمیری ئیمانداران؛ خوایە[(٢)]. پاشان چەندین ڕیوایەتی تر لە بارەی ئیبن سەبەئەوە لە ئەبی جەعفەری صادقەوە؛ دەگێڕێتەوە، تەنانەت زیاد لە پێنج ڕیوایەت باس دەکات.

- (الصدوق) لە کتێبی (من لايحضره الفقية)[(١)].

- (الطوسي) کە ناسراوە بە (شيخ الطائفة )[(٢)].

- (المجليسي) زۆرزان لە زانستی ئیمامەکان لای ئەوان( باقر علوم الأئمة)[(٣)].

---

(١) (فرق الشيعة) (ص٢٢).
(٢) (فرق الشيعة) (ص٢٢).
(١) ڕیوایەتی ژمارە ٩٥٥. [ یەکێکە لە چوار کتێبە باوەڕپێکراوەکەی لای شیعەکان ]
(٢) في كتابه (رجال الطواسي) (ص١).
(٣) في كتابه ( بحار الأنوار) (٥١/٢١٠) و (١٤٦/٤٢).

- (النوری الطبرسي)[١].

- جگە لەوانەی کە نــاوم هێنــاون، هــی تــریش زۆن، لەبــەر کــورتبڕی وازم لێهێنان.

**٣. سەبارەت بە ئەهلی سوننەت:** هەرکامێکیان باسی ئەو دەمەی کردبــێ، ئەوە ناوی ئیبن سەبەء و کاریگەریەکانی لەسەر ئەو دەمە ڕوونکردۆتــەوە، کــەس ئینکاری بوونی ئیبن سەبەئی نەکردووە، تەنها نووسەرە شــیعەکانی ئــەم دواییــە نەبێ، لەگەڵ هەندێك نووسەری سوننیش، کە نەزانن بەوەی ئەوان چیان مەرامــە لە پشت ئینکارکردنی ئەو کەسەوە.

جا ئەم عەبدوڵلای کوڕی سەبەئە، یەمەنیەکی یەهودیە، سەرەتا خــۆی کــرد بــە موســوڵمان، پاشــان لایــەنگریکردنی عــەلی ﷺ هێنــا کایــەوە، تــاقمی سەبەئیەکان دەدەرێنە پاڵی ئەوانەی کە بڕوایــان بــە خوایــەتی عــەلی هــەبوو ا، هەروەها هەرئەوانە بوون کە هاتن بۆلای عەلی کوڕی ئەبو تالب و پێیان وت: تــۆ ئەوی. ئەویش وتی: ئــەو کێیــە؟! وتیــان: تــۆ خــوای. ئــەویش فــەرمانی دا بــە (قەنبەر)ی خزمەتکاری چاڵێ بکەنێ و ئاگری تیا بەردا، پاشان فەرمووی :

لَمَّــا رَأَيْــتُ الأَمْــرَ أَمْــرًا مُنْكَــرا     أَجَّجْــتُ نَــارِي وَدَعَــوْتُ قَنْبَــرَا[١]

کاتێك کە بینیم ئەم کارە کــارێ گەنــە     ئاگرم کردۆو وتم قەنبەر چاڵیان بۆبکەنە

(١) في كتابه (بحار الأنوار) (٥١/٢١٠) و (٤٢/١٤٦).

هەروەها وتی: هەركەسێ لەو وتەیەی پاشگەز نەبێتەوە بەئاگر دەیسوتێنم، ئەوەبوو زۆرێكیانی سوتاند، ئەوەشی كە ڕایكرد ڕایكرد، عەبدوڵڵای كوڕی سەبەئیش یەكێك بوو لەوانەی ڕایكرد، هەندێكیش ووتویانە: كوژراوە، خوای پەروەدگاریش زاناترە.

ئیبن سەبەء هەندێ لە دید و بۆچونی یەهودی بڵاوكردەوە، وەكو گەڕانەوە (الرجعة)[٢] و (الوصي)[٣] و (ئیمامەت لە یەك خێزاندا دەبێ) و.. هی تریش.

ودەشتەكیەكانی بەكاردەهێنا، ئەرۆیشت درۆ و دەلەسەی بڵاودەكردەوە، كە عوسمان واو وایكردوە. هەروەها خۆی و هاودەستەكانی نوسراوی ساختە (موزەوەر) یان بەناوی هاوەڵەكانی پەیامبەرەوە ﷺ دەنوسی، وەكو زوبەیر و تەڵحە و عەلی و عائیشە و... هتر، هەموویان بە مۆری ساختە مۆر دەكرد، ئەو نوسراوانەش بریتی بوون لە قسەكردن بە عوسمان و بێزاری دەربڕین لە خۆی و سیاسەتەكەی. لە كۆنیشدا ئامێرەكانی گەیاندن نەبوونە وەكو ئێستا هەن، ئەو دەشتەكیانە هەر كە ئەو هەواڵانەیان پێ دەگەیشت بڕوایان دەكرد، تا ئەوەبوو

---

(١) ئەسڵەكەی لە (صحیحی بوخاری) دا هاتووە، كتاب استتابة المرتدين، باب حكم المرتد و المرتدة واستتابتهم، حديث (٦٩٢٢)، بەڵام درێژەی چیرۆكەكە ئیبن حەجەر: لە ڕاڤەی ئەو فەرمودەیەدا باسی كردووە، ئینجا ئەڵێ: (لەبەشی سێ یەمدا ئەمەمان ڕیوایەت كردوە لە فەرمودەكەی (ئەبو تاهیری المخلص)ـەوە، وسەنەدەكەی (حسن)ـە.

(٢) بریتیە لە زیندوو بونەوەی هەندێك لە مردوان لە ئاخرزەماندا بۆ سزادانی ستەمكاران..(وەرگێڕ)

(٣) بەوەی هەموو پەیامبەرێ وەصی (وەسیەت بۆكراو- ڕاسپێردراو) یەكی هەبووە ، وەصی پەیامبەریش ﷺ عەلی كوڕی ئەبوتالیبە ﷜. (وەرگێڕ)

چەندین ئاژاوە گێڕ و دەغەڵ چوونە ڕیزیەوە. بە کەم تەمەن و بێ تەجروبەکانی دەگوت: (پێم سەیرە! خەڵکانێك بڕوایان بە گەڕانەوەی عیسا هەیە لە ئاخرزەماندا، بەڵام بڕوایان بە گەڕانەوەی موحەمەد نییە، کەچی خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ {القصص: ٨٥}، کەواتە موحەممەد لەپێشترە بۆ گەڕانەوە وەك لە عیسا). هەروەها ئەیوت: ( هەزار پەیامبەر لەپێش ئێمەوە هاتوون، هەر هەموویان وەصی یەکیان هەبووە، وەصی موحەممەدیش عەلی یە).

ئەوەبوو لە سەرجەم چین و توێژەکاندا خەڵکانێك وەڵامیان دایەوە، هەندێکیان دوای ئەوەی تێگەیشتن لە مەبستە چەپەڵەکانی ئیبن سەبە عوون بە بانگەوازکار بۆی، بەڵام هێندێکی تریان هەر بە کوێرانە دەستیان کرد بە بانگەواز کردن.

**لەو بانگەوازکەرانەی دەستیان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیدا:**

غافقی کوڕی حەرب - عەبدولڕەحمانی کوڕی عەدیس ئەلبەلەوی - کینانەی کوڕی بەشیر - سەودانی کوڕی حیمڕان - عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی کوڕی وەرقاء - عەمری کوڕی حەمقی خوزاعی - حەرقوصی کوڕی زوهەیر - حەکیمی کوڕی جەبەلە - قەتیرەی سکونی... هتر[1].

سەبارەت بە ساختە کردنی نوسراوەکان، مەسروق ئەڵێ: عائیشە وتی: لێی گەڕان(واتە عوسمان) وەکو جلی پاك لە پیسیدا بەجێیان هێشت، پاشان وەك بەران سەریان بڕی.

(١) (مختصر التحفة الاثني العشرية) (ص ٣١٨).

مەسروق پێی ووت: ئەمە کاری تۆ بوو! تۆ بۆ خەڵکت ئەنوسی و فەرمانت پێ دەکردن لە فەرمانی عوسمان دەرچن.

عائیشە وتی: نە بەو خوایەی بڕواداران بڕوایان پێ هێناوە و بێ باوەڕان باوەڕیان پێ نەهێناوە، ڕەشم لەسەر سپی بۆ نەنووسیوون، هەتا ئەم ساتەی کە دانیشتووم.

ئەعمەش ئەڵێ: جا خەڵك وای ئەزانی نوسراوەکان لەسەر قسەی عائیشە نوسراون[١] کەواتە کۆمەڵێك نوسراوی ساختەی زۆر، لەسەر زمانی هاوەڵانی پەیامبەرﷺ هەڵدەبەستران، بێ ئەوەی ئاگایان لێ بێت، هەرهەموو ئەو نوسراوانە، گازندە و زەمی عوسمانی کوڕی عەففانی دەکرد. ئەم عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئە، شوێنکەوتوی لە سەرجەم ویلایەتەکاندا هەبوو، بۆیە بەردەوام نامەیان بۆ دەنارد و ئەمیش نامەی بۆ دەناردن. هەندێکیان نامەیان بۆ هەندێکی تریان دەنارد و دەیاننوسی: والیەکەمان بە فەرمانی عوسمان واو وای لێ کردین، والیەکەمان بە فەرمانی عوسمان واو وای لێ کردین، ڕۆیشتین بۆ مەدینە و عوسمان واو وای بەسەرهێناین، عوسمان واو وای عێنا بە سەر هاوەڵەکانی پەیامبەردا، نامەیەکمان لەزوبێری کوڕی عەوامەوە بۆ هاتووە، ڕاسپاردەیەکمان لە عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە پێگەیشتووە، نوسراوێکمان لە عائیشەوە بۆ هاتووە، چی و چیمان بۆ هاتووە، ئیتر ئەو دەشتەکیانە کە هیچ دەربارەی دینەکەی خوا نازانن - شتێکی کەم نەبێ- ئەم قسانە کاری تێ دەکردن و دڵیان پڕی ئەبوو لە شت لە ئاست عوسمانی کوڕی عەففانرضي الله عنه.

---

(١) (البداية و النهاية) (٧/٢٠٤) قال ابن كثير: ( اسناده صحيح).

**هۆکاری دووەم: ئەو خۆشگوزەرانی و هەرزانی و نازونیعمەتەی کە ئومەتی ئیسلامی لەسەردەمی عوسماندا بەخۆوە بینی:**

حەسەنی بەصری: دەڵێ: کەمجار نەبێ وەگەرنا ڕۆژ نەبوو خێر و خێرات بەسەر خەڵکدا دابەش نەکرێت، هەتا وای لێهات بانگدەر بانکی دەکرد: ئەی خەڵکینە وەرن هەنگوینەکەتان ببەن، ئەی خەڵکینە وەرن بەشەماڵەکەتان (پارەکەتان) ببەن[1] ئەمەش لەبەر ئەوەی جیهاد کردن لە سەردەمی عوسماندا بەرفراوان بوو بوو، سەرەڕای ئەمەش لە عادەتی خۆشگوزەرانی و هەرزانیە، کە ئەم جۆرە شتانەی لێبکەوێتەوە وەکو گازندە و بۆڵەبۆڵ و ڕازی نەبوون، ئەمەش بە هۆی پێنەزانینی خەڵك و سوپاس نەکردنیان.

**هۆکاری سێ یەم: جیاوازی نێوانی سروشتی عوسمان و سروشتی عومەر:**

عومەر رضي الله عنه توند بوو، بەڵام عوسمان زۆر نەرمونیان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لاواز نەبووە هەروەکو زۆرێك لە خەڵك گومان ئەبەن، بەڵکو نەرمونیان بووە، هەر بۆیە دەبینی کاتێك کە لە ماڵەکەی خۆیدا ئابلۆقەیان دا، وتی: دەزانن چی وای لێکردن جورئەت بکەن و هەستن بەم کارانە؟ هیچ وای لێنەکردن نەرم ونیانی خۆم نەبێ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: سوێند بەخوا کۆمەڵە شتێکیان لە عوسمان ئەگرت، ئەگەر عومەر بیکردبایە کەس هیچی نەدەگوت.

کەوابوو بۆچی لە عوسمانیان گرت؟

---

(١)ـ(تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة) (١/ ٣٦٠).

لەبەرئەوەی عوسمان لە خەڵك خۆش دەبوو، لێی نەدەگرتن، چاوپۆشی دەكردن، لە هەڵە و كەم و كورتی خۆش دەبوو، عەفوی دەكردن.

**هۆكاری چوارەم: پێ قورس بوونی هەندێك لە خێڵەكان بە سەركردایەتی كردنی قورەیش:**

ئەو خێڵە عەرەبانەی كە هاتنە نێو ئیسلامەوە، بەتایبەت ئەو خێڵانەی كە هەندێكیان لە دین هەڵگەڕانەوە و پاشان بە زۆری شمشێر و دوای شەڕكردن گەڕانەوە، هەندێكیان بە قەناعەتەوە و هەندێكی تریشیان بێ قەناعەت، هەندێ شتیان هەر لە دڵ مابوو، ئا ئەوانە قورس بوو بە سەریانەوە كە سەركردایەتی كردن هەر لە قورەیش بێ، باشە بۆ هەر قورەیش؟ بۆیە ئیبن خەلدون دەڵێ: ( هەندێك لە خێڵە عەرەبەكان سەركردایەتی كردنی قورەیش ببوە شتێك لایاندا و نەفسیان پێی ڕازی نەدەبوو، بۆیە دەستیان كرد بەتانە و تەشەردان لە والی و دەسەڵاتدارەكان[1] بۆ ئەو مەبەستە نەرم ونیانی عوسمانیان قۆستەوە.

ئەمانە گرنگترین هۆكارەكان بوون.

هۆكاری تریش هەن بوونەتە هۆی نانەوەی ئەم فیتنەیە بەڵام لەبەر كورتبڕی باسم نەكردن.

*** 

(١) ـ(تحقيق مواقف الصحابه فی الفتنه) (١/٣٦٥).

# باسی پێنجەم

## ئەو شتانەی کە لە عوسمانیان گرت رضي الله عنه

بە کورتی باسی ئەو شتانە دەکەم کە لە عوسمانیان وەردەگرت و پاشان بە درێژی باسی لێوە دەکەم ـ إن شاء الله- :

**یەکەم:** خزمەکانی کردووە بە والی و دەسەڵاتدار.

**دووەم:** نەفی کردنی ئەبوزەڕ بۆ ڕەبزە[1].

**سێیەم:** پێدانی پێنج یەکی ئەفریقە بە مەڕوانی کوڕی حەکەم.

**چوارەم:** سوتاندنی سەرجەم موصحەفەکان و کۆکردنەوەی خەڵکی لەسەر یەك موصحەف.

**پێنجەم:** لێدانی ئیبن مسعود تا ڕیخۆڵەی تەقاندوە و لێدانی عەمماری کوڕی یاسر تا پەراسوەکانی شکاندوە.

**شەشەم:** فراوانکردنی جێ لەوەڕی قەدەغە (الحِمَى).

**حەوتەم:** تەواو کردنی نوێژ لە سەفەر.

**هەشتەم:** دواکەوتنی لە جەنگی بەدردا.

**نۆیەم:** ڕاکردن لە جەنگی ئوحد دا.

**دەیەم:** ئامادەنەبوونی لە بەیعەتی ڕیزواندا.

---

(١) ڕەبزە سێ ڕۆژە ڕێ لە مەدینەوە دوورە، لەسەر ڕێگەی مەککەیە. (معجم البلدان ٣/٢٤).

**یازدەیەم:** نەكوشتنی عوبەیدوڵڵای كوڕی عومەر لە خوێن بابی (قصاصی) هورموزان.

**دوازدەیەم:** زیادكردنی بانگی دووەم لە ڕۆژی جومعەدا، ئەمەش نە لە سەردەمی پەیامبەری خوا ﷺ و نە لە سەردەمی ئەبوبەكر و نە لە سەردەمی عومەردا نەبوە، بەڵكو ئەوان تەنها یەك بانگیان داوە.

**سیازدەیەم:** گێڕانەوەی حەكەم -باوكی مەڕوان-، لە كاتێكدا پەیامبەری خوا ﷺ نەفی كردبوو.

شتی تریش هەن باسم نەكردون، وەكو ئەوەی ئەڵێن: سەركەوتۆتە سەر پلەكانەكەی پەیامبەر ﷺ ، چونكە پەیامبەر ﷺ لەسەر مینبەر لە پلەی یەكەمدا وتاری ئەدایەوە، كە ئەبوبەكر هات دابەزیە سەر پلەی دووەم، كە عومەریش هات دابەزیە سەر سێیەمیان، بەڵام عوسمان هات سەركەوتە سەر یەكەم پلەیان، ئەمەش هەروامایەوە هەتا ئەمڕۆ، هەروەها ئەڵێن: عومەر بە (دوڕڕە) لە خەڵكی ئەدا، كەچی ئەم بە عەسا و گاڵۆك، هەروەها ئەڵێن: ئازاری ئەبو دەردائی داوە كە یەكێكە لە هاوەڵەكانی پەیامبەر ﷺ، لەگەڵ هەندێ شتی تریش كە زۆربەیان درۆ و دەلەسەن و ئەسڵیان نییە، وا لە خوارەوە درێژەی ئەم شتانە ڕوون دەكەینەوە :

**یەکەمیان: خزمەکانی کردووە بە والی و دەسەڵاتدار**

ئەو خزمانەی عوسمان ﷺ کێن کە کردبوونی بە والی؟

ئەو خزمانەی عوسمان ﷺ کە کردبوونی بە والی :

یەکەمیان: موعاویە یە.

دووەم: عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرحە.

سێیەم: وەلیدی کوڕی عوقبەیە.

چوارەم: سەعیدی کوڕی عاصە.

پێنجەم: عەبدوڵڵای کوڕی عامرە.

ئەم پێنجە عوسمان کردنی بە والی، هەمووشیان خزمی عوسمانن، ئەوان پێیان وایە ئەم کارە جێگای تانە و نەنگی یە بۆ عوسمان، کەوابوو با تەماشایەکی باقی والی یەکانی تری عوسمان بکەین ﷺ.

ئەبو موسای ئەشعەری، قەعقاعی کوڕی عەمر، جابری موزەنی، حەبیبی کوڕی مەسلەمە، عەبدولڕەحمانی کوڕی خالدی کوڕی وەلید، ئەبو ئەعوەری سوللەمی، حەکیمی کوڕی سەلامە، ئەشعەسی کوڕی قەیس، جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی، عوتەیبەی کوڕی نەهھاس، مالکی کوڕی حەبیب، نەسیری عەجەلیی، سائیبی کوڕی ئەقرەع، سەعیدی کوڕی قەیس، سەلمانی کوڕی ڕەبیعە، خونەیسی کوڕی خوبەیش.

ئا ئەمانە والیەکانی عوسمانن، ئەگەر هەر بەخێراییەکیش بێت تەماشایەکی والیەکان بکەین، دەبینین خزمەکانی عوسمان زۆر زۆر کەمترن لە چاو ئەوەکانی تر، بە تایبەت ئەگەر بزانین کە پەیامبەری خوا ﷺ خێڵی ئومەییەی زیاتر لە هۆزەکانی تر دەکردن بە کاربەدەست و والی.

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە: ئەڵێ: (هیچ هۆزێك لە هۆزەکانی قورەیش نیناسین بە ئەندازەی بەنی ئومەییە پەیامبەری خوا ﷺ بەکاری هێنابن وبە کاربەدەستی دانابێتن، ئەمەش لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆربووە و لەگەڵ ئەوەشدا دەم سپی و پایەدار بوون لە نێو خەڵکدا)[1].

لەوانەی کە پەیامبەری خوا ﷺ بەکاری هێنان وکردنی بەوالی و لەبەنی ئومەییەش بون: عەتتابی کوڕی ئوسەید، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، خالدی کوڕی سەعید، عوسمانی کوڕی سەعید، ئەبانی کوڕی سەعید. پێنج کەس بە ژمارەی ئەوانەی کە عوسمان ﷺ کردنی بەوالی.

**دوای ئەوەش ئەڵێین:** ئەمانە هەر هەمویان لەیەك کاتدا نەکراون بەوالی، سەرەتا وەلیدی کوڕی عوقبەی دانا، بەڵام دواجار لایدا و سەعیدی کوڕی عاصی لە شوێنی دانا، کەوابو لەیەك کاتدا پێنج نەبوون.

سەرباری ئەوەش، عوسمان پێش ئەوەی وەفات بکات سەعیدی کوڕی عاصیشی لادا[1]، کەواتە کاتێك عوسمان وەفاتی کردوە لە هەموو بەنی ئومەیە تەنها سێ والی مابون، کە بریتین لە: موعاویە و عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی

(١) (منهاج السنة) (٦/١٩٢).

(١) (تاريخ الطبری) (٣/٤٤٥).

ئەبی سەرح و عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیز، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عامریش پێش وەفاتکردنی عوسمان دەستی لە کار کێشایەوە[1].

**ئا لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ**، ئەویش ئەوەیە: وەلیدی کوڕی عوقبە و سەعیدی کوڕی عاص کە عوسمان لایبردن والی بوون بەسەر کوفەوە! ئەو کوفەیەی کە عومەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی تێدا دەرکرد!

هەروەها عوسمان ئەبو موسا و وەلید و هی تریشی تێدا دەرکرد

ئەو کوفەیەی کە عەلی دوعای لە خەڵکەکەی کردووە.

ئەو کوفەیەی کە خەڵکەکەی غەدریان لە حوسەینی کوڕی عەلی کرد.

ئەو کوفەیەی کە خەڵکەکەی پەیمانەکەیان شکاند لەگەڵ موسلمی کوڕی عەقیل دا.

لە کۆتاییدا و نەك کۆتاهەمین، ئەو کوفەیەی کە خەڵکەکەی حوسەینی کوڕی عەلیان کوشت!

ئەو کوفەیەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هیچ والیەك ڕازی نەبووە.

کەوابوو لە کارلابردنی ئەو والیانە لەلایەن عوسمانەوە نابێتە جێگای تانە بۆ ئەو والیانە، بەڵکو جێگای تانە و عەیبەیە بۆ ئەو شارەی کە تێیدا والی بوون، دوای ئەوەش: ئایا ئەو والیانە شیاویی خۆیان ئیسپات کرد یا نا؟ -إن شاء الله- دوایی شایەتی زانایان لەسەر ئەو والیانەی عوسمان دێنینەوە.

---

(١) (تاريخ الطبري) (٣/٤٤٥).

**هەروەها ئەڵێین:** بە هەمان شێوە عەلی کوڕی ئەبو تالبیش خزمەکانی خۆی کردووە بە والی[(١)]، کەسیش ڕەخنەی لێ نەگرتوە، ئێمەش ڕەخنەمان لێ نەگرتووە و لێشی ناگرین.

جا ئەو کەسەی کە ئەم ڕەخنەیە دەگرێت -بە والی دانانی خزمەکانی عوسمان-، یان ئەوەتا سوننیە یا شیعیە[(٢)].

* **ئەگەر شیعیەك بوو، بەوە وەڵامی دەدەینەوە کە:** عەلی کوڕی ئەبی تالبیش بە هەمان شێوە خزمەکانی خۆی کردوە بەوالی، کەواتە هەردووکیان لە مەسەلەکەدا یەکسانن، ئەگەر بە والی دانانی خزم بکەیتە ڕەخنە و گازندە بەسەر عوسمانەوە، ئەوا بەهەمان شێوە بە والی دانانی خزمەکانی عەلی لەلایەن خودی عەلی یەوە، ئەبێ ببێتە ڕەخنە و گازندە بەسەریەوە، خۆ ئەگەر ئەم کارە هیچی تێدا نییە بۆ عەلی، ئەوا بەهەمان شێوە بۆ عوسمانیش هیچی تێدا نییە، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە عوسمان کردنی بە والی، باشتر بوون لە وانەی کە عەلی کردنی بە والی، جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس نەبێت.

---

(١) (عەبدوڵلا) و (عوبەیدوڵلا) و (قیثم)و(تەمام)... کە هەر چواریان کوڕی عەباسن کردونی بەوالی، هەروەها زڕ کوڕەکەی خۆشی: موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر. هەروەها عەبدولڕەحمانی کوڕی هوبەیرەی کوڕی ئوم هانیئی خوشکیشی. بڕوانە: (تاريخ خليفة بن الخياط) (ص٢٠٠-٢٠١).

(٢) ئەمە ڕاستە نەك ئەوەی بڵێی (یان سوننەیە یان شیعە)، چونکە ئەوان لە پەیڕەوانی سوننەن نەك خودی سوننە کە بریتییە لە کۆمەڵێك بیروبۆچوون.. و شیعیش بە هەمان شێوە نەك شیعە..، ئەو (ی) یائە یائی نەسەبە، نیسبەتەن بۆ ئەو شتە، هەروەك چۆن دەڵێی ئیسلامی، واتە پابەند بە بنەماکانی ئاینی ئیسلام، جا خەڵکێکی زۆر گەن تێکەیشتوون، تا وای لێهاتووە ئێستا دەڵێی ئیسلامی خەڵکانێکی تایبەت دەگرێتەوە، وەگەرنا لە بنچینەدا هەموو موسڵمانێك ئیسلامی یە، نەك کۆمەڵێ موسوڵمان بگرێتەوە بە بێ ئەوانی تر.(وەرگێڕ)

* بەڵام ئەگەر هاتوو کابرا سوننی بوو، ئەوا **پێی ئەڵێین:** تۆ دوو ڕێگات لە پێشە :

**یەکەمیان:** ئەوەتە بڵێی عوسمان بە هۆی خۆشەویستی و خزمایەتیەوە کردونی بە فەرمان ڕوا، بەڵام شایانی فەرمانڕەوایەتی نەبوون.

**دووەمیان:** ئەوەتە بڵێی: عوسمان ﷺ وای ئەزانی ئەوان شایستەی ئەو کارەن بۆیە ئەو کارەی پێ سپاردن. جا ئەسڵیش وایە گومانی چاکە ببرێ بە ئەمسالی عوسمان ﷺ، دوای ئەمانەش با تەماشایەکی ژیان و ڕەوشتی ئەو والیانە بکەین کە عوسمان ﷺ داینان.

ئەمانەش شایەتی زانایانن بۆ ئەو والیانە:

**یەکەم: موعاویەی کوڕی ئەبو سفیان.**

هیچ موسوڵمانێك گومانی لەوەدا نییە کە موعاویەی کوڕی ئەبو سفیان ﷺ یەکێك بووە لە باشترین والییەکان، تەنانەت خەڵکی شام زۆر زۆریشیان خۆشویستوە، عومەری کوڕی خەتتاب کردبووی بە والی بە سەر شامەوە، تەنها کارێك کە عوسمان کردبێتی ئەوە بووە، موعاویەی هەر لەو شوێنەی خۆی هێشتۆتەوە لەگەڵ زیادکردنی هەندێ ناوچەی تر بۆ سەر ویلایەتەکەی.

دوای ئەوەش لە سەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ موعاویە نوسەری وەحی بووە، هەروەها یەکێك بووە لە باشترینی والیەکان، لە کاتێکدا پەیامبەری خوا ﷺ ئەڵێت: «خیار أئمتكم من تحبونهم و يحبونكم و تصلون عليهم و يصلون عليكم»[1]، واتە: (باشترین فەرمان ڕەواکانتان ئەوانەن کە خۆشیان ئەوێن و

---

(١) (صحيح مسلم)كتاب الامارة، باب خيار الأئمة وشرارهم، حديث (١٨٥٥).

ئەوانیش ئێوەیان خۆش ئەوێ، وە ڕەحمەتیان لێ دەکەن و ئەوانیش ڕەحمتان لێ دەکەن). موعاویەش ﷺ ئاوها بووە.

## دووەم: عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح.

یەکێك بوو لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ، پاشان لە دین هەڵگەڕایەوە، بەڵام دوای ئەوە دووبارە تەوبەی کرد و گەڕایەوە و هات بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ بەڵکو بەیعەتی لێوەربگرێت، عوسمان وتی: ئەی پەیامبەری خوا بەیعەتی لێوەرگرە، ئەو تەوبەی کردووە، بەڵام پەیامبەری خوا ﷺ نەیکرد، عوسمانیش هەر ڕەجای لە پەیامبەری خوا ﷺ دەکرد وهەر وازی نەهێنا، تا ئەوەی پەیامبەری خوا ﷺ دەستی درێژکرد و بەیعەتی پێدا(١). ئەویش لە هەموو ئەوانەی پێشووی تەوبەی کرد، هەروەها یەکێك بووە لە والیە باشەکان، لەسەر دەستی ئەم فەتحی ئیفریقیا کرا.

زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێ: هیچ سنورێکی نەبەزاندوە، لە دوای موسوڵمان بوونیەوە لە ساڵی فەتحدا هیچ کارێکی وا گەنی نەکردووە کە ببێتە گلەیی و گازندە بەسەریەوە، هەروەها پیاوێکی زۆر ژیرو چاك بووە(١). و ئەو هەموو فتوحاتە زۆرەی لە ئیفریقیە کرا، هەمووی لەسەر دەستی ئەمدا بوو ﷺ.

(١) أخرجه أبو داود، كتاب الحدود، باب الحكم فى من ارتد (٤٣٥٩).
(١) (سير أعلام النبلاء)(٣/٣٤).

## سێیەم: سەعیدی کوڕی عاص:

یەکێك بووە لە هاوەڵە باشەکانی پەیامبەر ﷺ، زەهبی لە بارەیەوە دەڵێ: (ئەمیرێکی بەڕێز و زۆر چاك و نەرم و نیان و بەویقار بووە، خۆڕاگر و ژیر بووە، شیاوی خیلافەت بووە)[١].

## چوارەم: عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی کوڕەیز.

ئەم بوو فەتحی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کیسرا و خۆراسانی کرد، لەسەر دەستی ئەم لە سەردەمی عوسماندا کۆتایی بە دەوڵەتی فارس هێنرا، هەروەها فەتحی سەجستان و کرمان و چەند ناوچەیەکی تریشی کردووە، زەهەبی لە بارەیەوە ئەڵێ: (یەکێك بووە لە گەورە فەرمانڕەوا و جوامێر و لێهاتووەکانی عەرەب)[٢].

## پێنجەم: وەلیدی کوڕی عوقبە.

لەلای (شەعبی) باسی حەبیبی کوڕی مەسلەمە و جیهاد و فتوحاتەکانی کرا، ئەویش وتی: ئەی ئەگەر وەلید و غەزا و ویلایەتەکەیتان ئەبینی؟[١].

وەلید پێنج ساڵی ڕەبەق ئەمیری کوفە بوو هێشتا ماڵەکەی دەرگایەکی پێوەنەبوو، هەرکەس بیویستایە دەهات و قسەی لەگەڵدا دەکرد، خەڵکیش خۆشیان ئەویست، بەڵام ئیتر هەروەکو ووتراوە: خەڵکی کوفەیە ئیتر...

(١) (سير أعلام النبلاء) (٣/٤٤٥).
(٢) (سير أعلام النبلاء)(٣/٢١).
(١) (تاريخ الطبري) سنة ٣٠ هـ (٢/٦١٠).

**ئەوەی لە وەلید گیرا ئەم دوو شتە بوو:**

**یەکەم:** ئەڵێن ئەم ئایەتە لەسەر ئەو دابەزیوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ﴾. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر فاسق و تاونکارێك هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، پەلەمەکەن و سەرنج بدەن و لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەك بە نەزانی زیان بگەیەنن بە خەڵکێك، جا دوای پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەستاون).

ئەوەی کە مەشهورە لە کتێبەکانی تەفسیردا ئەم ئایەتە کاتێك دابەزی کە پەیامبەری خوا ﷺ وەلیدی کوڕی عوقبەی نارد بۆ لای بەنی موستەلیق (بني المصطلق) بە مەبەستی هێنانی زەکاتەکانیان، جا کاتێ گەیشتە لایان خەڵکەکە بەرەو ڕووی هاتن[1]، ئەویش ترساو گەڕایەوە[1] بۆلای پەیامبەر ﷺ، وتی ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ویستیان بمکوژن، پەیامبەری خوا ﷺ تورەبوو و خالدی کوڕی وەلیدی ڕەوانەیان کرد، بەڵام دوای دابەزاندنی ئایەتەکە، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لێکۆڵینەوە بکرێت تا مەسەلەکە ڕوون دەبێتەوە، ئەوە بوو کە لە مەسەلەکە کۆڵینەوە وتیان: ئێمە بۆ کوشتنی نەهاتبوین، بەڵکو زەکاتەکانمان هێنابوو، چونکە نێردراوەکەی پەیامبەری خوا ﷺ دواکەوت.

---

(١) بە مەبەستی پێشوازی لە وەفدی پەیامبەرﷺ. (وەرگێڕ)

(١) وایزانی پەلاماری ئەدەن و ئەیانەوێ بیکوژن. (وەرگێڕ)

دووەم: ئەڵێن بە سەرخۆشی نوێژی بەیانی کردووە، چوار ڕکاتی کردووە و پاشان سەلامی داوەتەوە و وتویەتی، زیادەتان بۆ بکەم؟

ئەوانیش گوتوویانە: تۆ لە مڕۆوە زیادەی، ئەوەبوو ڕۆیشتن بۆ لای عوسمان و سکاڵایان لەلا کرد، ئەویش بە (حەددی) مەی خۆر قامچی لێدا.

لە صەحیحی موسلمیشدا هاتووە کە عوسمان بە حەددی مەی خۆر قامچی لە وەلید داوە[1].

**سەبارەت بە یەکەمیان:** مەشهورە لەلای موفەسیرین[2]، کەوا ئایەتەکە لەبارەی وەلیدەوە دابەزیوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە وەلید فاسقە، چونکە خوای پەروەردگار حوکمێکی گشتی داوە بەسەر ئەو کەسەی کە هەواڵ ئەهێنێ، با پەروەردگاریش -سبحانه- بە فاسق ناوی هێنابێ، یانی ئیتر هەتا هەتایە هەر بە فاسقی دەمێنێتەوە؟

خوای بەرز و پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ {النور:٤-٥}. واتە: (وئەوانەی کە بوختان دەکەن بە ئافرتانی داوێن پاك، لە پاشان چوار شایەت ناهێنن، ئەوانە هەشتا شەلاق (قامچی) یان لێبدەن و ئیتر هەرگیز شایەتیان لێوەرمەگرن، ئا ئەوانە لەسنور دەرچوون وفاسقن، جگە لەوانەی دوای ئەوە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە و کردەوەیان چاك دەکەن و چاکسازی

---

(١) (صحيح مسلم) كتاب الحدود، باب حد الخمر، حديث (١٧٠٧).
(٢) (أحمد) (٤/٢٧٩).

دەکەن، ئەوە بێگومان خوا لە ئاست ئەو جۆرە کەسانەدا لێخۆشبوی بە بەزەییە. گریمان ئەم ئایەتە لەسەر وەلیدی کوڕی عوقبە دابەزیووە، ئایا تەوبەکردنی بۆ نییە؟!

**سەبارەت بە مەی خواردنەوەکەشی**، پێش هەموو شتێ، ئەوە خوا ئەزانێ کە خواردویەتی یان نا؟ نەك صەحیحی موسلم بەدرۆ بخەمەوە، بەڵکو لە صەحیحی موسلم دا هاتووە کە لەسەر مەی خواردنەوە قامچی لێدراوە، بەڵام ئایا سابت بووە مەی خواردبێ یان نا؟ ئەمەشتێکی ترە.

کاتێك کە وەلیدی کوڕی عوقبە والی بوو بەسەر کوفەوە، دوو پیاو لە خەڵکی کوفە هاتن بۆ مەدینە بۆلای عوسمانی کوڕی عەففان و پێیان وت: وەلیدی کوڕی عوقبەمان بینی بە سەرخۆشیەوە نوێژی بەیانی بۆکردین، یەکێکیان وتی: خۆم بینیم بەسەر خۆشی، ئەوەکەی تر وتی: من بینیم مەیەکەی هەڵدەهێنایەوە. عوسمانیش وتی: حەتمەن خواردوویەتیەوە بۆیە هەڵی دێنێتەوە.

عەلی کوڕی ئەبو تالب و حەسەنی کوڕی عەلی و عەبدوڵلای کوڕی جەعفەریش لەوێ ئامادە بوون. ئەوەبوو عوسمان فەرمانیدا قامچی لە وەلید بدرێ و پاشان لە والیتی کوفەش لایبرد، بەڵام هەندێك لە زانایان گومانیان لە شایەتی شایەتەکان هەیە، نە لە ڕاستێتی چیرۆکەکە، بەڵێ ئەو قامچی لێدراوە هەروەکو لە صەحیحی موسلم دا هاتووە، بەڵام ئایا هەردوو شایەتەکە ڕاستگۆ بوون؟

هەرکەس زانیاری زیاتری لە بارەی مەسەلەکەوە ئەوێ، با تەماشای کتێبی (العواصم من القواصم) بکات بە تەحقیقی (محب الدین الخطیب) لەوێدا ڕەخنە و

تانه له هەردوو شایەتەكە دەگرێ و ڕونیشی ئەكاتەوە كە هەردوو شایەتەكە جێی متمانە نین[١].

گریمان ئەو شایەتانەش ڕاستگۆبن، خۆ هیچ نەنگی و تانەیەكی بۆ عوسمان تێدا نییە، بەڵكو هەر كە مەیخواردنەوەكەی یەكلابوویەوە، ڕاستەوخۆ قامچی لێداوە و لە فەرمانڕەوایی دەریكردوە، خۆ عوسمان هەڵەیەكی نەكردووە؟ هەروەكو دیارە، بەڵكو ئەمە شانازیە بۆ عوسمان، كە ڕۆیشتووە قامچی لە خزم و نزیكێكی خۆی داوە و لە والیەتی دەریكردوە و پشتگیری نەكردووە، دوای ئەوەش خۆ وەلیدی كوڕی عوقبە مەعصوم نییە؟ ئێمە هەر لە سەرەتای باسەكەمانەوە وتمان ئێمە بانگەشەی مەعصومیەت بۆ هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ناكەین.

لەسەردەمی عومەریشدا شتێكی ئاوها ڕویدا، ئیبن مظعون مەی خواردەوە وئەم ئایەتەی تەئویل كرد ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ [المائدة: ٩٣].

بەڵام دواجار عومەر ڕاستی مەسەلەكەی بۆ ڕوون كردەوە و پاشان لە والیێتی دەریكرد، جا ئا ئەوانەن والیەكانی عوسمان، تاكە كەسێك كە ئەكرێت تانەی لێبدرێ وەلیدی كوڕی عوقبەیە، ئەویش هیچ تانەیەكی بۆ عوسمان تێدا نییە، جا ئەگەر تانەیەكیش هەبێ تەنها لەسەر خودی وەلیدی كوڕی عوقبەیە.

**لێگرتنی دووەم: دوورخستنەوەی ئەبو زەڕ بۆ ڕەبزە.**

ئەو ڕیوایەتەی كە لە لای تەبەری و ئەوانی تریشدا هاتووە، لە ڕێگەی سەیفی كوڕی عومەرەوە ڕیوایەت كراوە، كەوا موعاویە و ئەبو زەڕ دەمە قالێكیان بووە، ئەویش نوسراوێك دەنوسێ بۆ عوسمان كە ئەبو زەڕ خەڵكمان

---

(١) (العواصم من القواصم) ص (١٠٧ - ١٠٨) الحاشیە.

لێدەوروژێنێنێ، ئەوەبوو عوسمان ناردیە شوێن ئـەبو زەڕ، جـا عوسمـان ئاگـاداری کردەوە و پاشان ئەبو زەڕ دەرچوو بۆ ڕەبزە[١].

ئەمە ڕیوایەتەکەی سەیفی کوڕی عومەرە، جا من پێشتر ئاماژەم بەوەدا کە ئێمە ڕیوایـەتی صـەحیحمان هەیـە قبـوڵی بکـەین، ئـا لێرەشـدا ڕیوایـەتێکی صەحیحی بوخاریمان هەیە لەسەر ئەم بابەتە:

لە زەیدی کوڕی وەهبەوە دەڵێ: بە ڕەبـزەدا تێپـەڕیم، بینـیم وا ئـەبو زەڕی لێیە! پێم وت: ئەی ئەبو زەڕ ئەوە چی تۆی گەیاندە ئێرە؟ وتـی: لـە شـام بـووم، جیاوازی کەوتە نێوان من و موعاویە لەسەر ئەوانەی ئاڵتون و زیـو هەڵـدەگرن و خڕی دەکەن، موعاویە ئەیووت: لەسـەر ئـەهلی کیتـاب دابـەزیووە؟ بـەڵام مـن دەموت: لەسەر هەردوولامان دابەزیوە[٢]. ئەمە شتێکی لـە بەینمانـدا دروسـت کرد، ئەوەبوو نامەیەکی نارد بۆ عوسمان و سکاڵای منی تێداکرد، کە باسی ئـەو

---

(١) (تاريخ الطبري) (٣/٢٣٥).

(٢) مەزهەبی ئەبو زەڕ لە بارەی ئەوانەی ئاڵتون و زیو هەڵدەگرن، مەعلومە، ئەو بە جائیزی نازانێت مرۆڤ لە سەروی پێویستی خۆیەوە ئاڵتون و زیـوی هـەبێت و لەماڵـدا هـەڵیبگرێ، بـەڵام جمهوری هاوەڵان لەگەڵ ئەم ڕەئیە نەبوون، بەڵام ئێستا ئەم مەسەلەیە لە نێوان موسڵمانانداندا نیوچـە ئیجماعێکی لەسەرە، بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێ ئاڵتون و زیوی هەبێت و هەڵیبگرێت، بـە مـەرجێك زەکاتەکەی دەرهبێنێ هەربۆیە بوخاری بەشێکی کتێبەکەی ناو ناوە: (باب ما أخرج زكاته فليس بكنز) (ئەوەی کە زەکاتەکەی بدرێت خڕکردنەوە نییە)، وە ئەم ڕیوایەتەی هەر لەو بەشەدا هێنـاوە، ئەم ڕەئیەش مەشهورە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و باقی هـاوەڵان، جـا ئـەبو زەڕ پێـی وا بـوو: هەرچیەك مرۆڤ لەسـەروی پێویسـتی یـەوە بـوو دەبێـت بیکـات بـەخێر و صـەدەقە و لەسـەروی پێویستیەوە نابێ هیچ زیادەیەك لەلای خۆی بهێڵێتـەوە ئەگـەر زەکاتیشـی دەربکـات، موعاویـە لەمەدا پێچەوانەی ئەو بووە.

جۆره مەسەلانه ئەكەم و خەڵك ئەوروژێنم، عوسمانیش ناردی بە شوێنمدا، كە گەیشتمە مەدینە خەڵكم هەموو لێ كۆبویەوە، وەكو ئەوەی پێشتر منیان نەدیتبێ، منیش باسی ئەوەم بۆ عوسمان كرد، عوسمان وتی: ئەگەر ویستت لێیەتی، دورت بگرتایە و لەشوێنێك لەم نزیكانە بوویتایە؟ جا ئەوەی منی گەیاندە ئێرە ئا ئەمە بوو، ئەگەر بەندەیەكی حەبەشیش بكەنە كاربەدەست بەسەرمەوە ئەوا هەر گوێڕایەڵ دەبم و سەرپێچی ناكەم[١].

هەر بۆیە عوسمان كوڕی عەففان ئەبو زەڕی دەرنەكردوە بۆ ڕەبزە، موعاویەش بەبێ ڕێزی و بە سوكایەتیەوە نەیناردۆتەوە بۆ مەدینە، هەموو ئەمانە درۆن بەناوی ئەوانەوە دەكرێتی. ئا ئەمە چیرۆكەكەی ئەبو زەڕە لە لای بوخاری، هەروەها لە لای ئیبن سەعدیش بە سەنەدێكی (جید) هاتووە كە كاتێك دەرچووە بۆ ڕەبزە وتویەتی: گوێم لە پەیامبەری خوا بووﷺ دەیفەرموو: «إذا بلغ البناء سَلْعاً فاخرج منها»[٢]، واتە: (ئەگەر خانوو گەیشتە (سَلْع) ئەوا لە مەدینە دەربچۆ). جا ئەمە فەرمانی پەیامبەری خوایەﷺ، هەروەها ڕیوایەتكراوە لە پەیامبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە ئەبو زەڕ بێ، بە تەنیایی ڕێدەكات، بە تەنیایی دەمرێ، لە قیامەتیشدا هەر بە تەنیایی زیندوو دەكرێتەوە)[١].

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب الزكاة، باب ما أدي زكاته فليس بكنز، حديث (١٤٠٦).

(٢) (الطبقات) لابن سعد (٤/٢٢٦) [سلع: شاخێكه له نزيك مەدينه].

(١) أخرجه الحاكم (٣/٥٠) وصححه، وقال الذهبي: (فيه إرسال، وفيه بريد بن سفيان وهو ضعيف جدا).

**لێگرتنی سێیەم: پێنجیەکی دەسکەوتی ئەفریقای داوەتە مەڕوان**

سابت نەبووە عوسمان شتی وای کردبێ، ئەگەر کارێکی واشی کردبێ ئەوا مەبەست پێی پێنجیەکی پێنج یەکەکەیە، چونکە دەستکەوت دابەش دەکرێتە سەر پێنج بەشەوە، پێنجیەکیان بۆ تێکۆشەرانە، پێنج یەکێکیشی دابەش دەکرێت بە سەر پێنج پێنج یەکدا، خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ {الأنفال ٤١}. واتە: (وبزانن بێگومان هەرچیەکتان لە غەنیمەت دەستکەوت، ئەو بەڕاستی پێنج یەکی ئەو دەستکەوتە بۆ خوا و بۆ پەیامبەری خوا ﷺ و بۆ خزمانی پیغەمبەر ﷺ و بۆ هەتیوان و بۆ هەژاران و بۆ ڕێبوارانە، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بە خوا و بەوەی ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆمان لە ڕۆژی جیاکردنەوەدا (واتە جەنگی بەدر)، لەو ڕۆژەی کە دوو کۆمەڵ دژبەیەك جەنگان، خواش بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵات دارە).

جا بەشی خوا و پەیامبەر ﷺ بۆ پێشەوای موسڵمانانە، هەر چۆنی بوێ وای لێ دەکا، ئەوەشی کە باس دەکرێت ئەوەیە کە عوسمان بەڵێنی بە مەڕوان داوە کە ئەگەر فەتحی ئیفریقیە بکات ئەوا ئەو پێنج یەکەی کە تایبەتە بە خۆی پێی دەبەخشێت، بەڵام هەروەك پێشتر لە فەتحی ئیفریقیەدا باسمان لێوە کرد ئەوەی وەکو پاداشت دا بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح لەبەرانبەر فەتحی ئیفریقیە.

**لێگرتنی چوارەم: سوتاندنی موصحەفەکان.**

حوزەیفەی کوڕی یەمان نوسراوێکی نارد بۆ عوسمان ﷺ کەوا خەڵکی لە سەر قورئان خوێندن جیاوازیەکی زۆر کەوتۆتە نێوانیانەوە، بەو ڕادەیەی ترسی ئەوەیان لێدەکرێ پێی بێ باوەڕ بن، بۆیە داوای لە عوسمان کرد هەموو خەڵکی کۆبکاتەوە لەسەر یەك شێوازی خوێندنەوە (قراءة) وجارێکی تر قورئان کۆ بکاتەوە[1].

بۆیە عوسمانیش فەرمانی کرد جارێکی تر قورئان کۆ بکرێتەوە و هەموو موصحەفەکانی تر بسوتێنرێت.

* ئەو موصحەفانەی کە عوسمان سوتاندنی کۆمەڵێ شتیان تێدا بوو لە تیلاوەی سڕاوە (منسوخ)، بەڵام هەندێك لە هاوەڵان هەر لای خۆیان هێشتبویانەوە.

* هەندێکی تری ئەو موصحەفانە، تەرتیبی سورەتەکانیان لە شێوەی ئەو ڕیزبەندیە نەبوو کە کۆتا جار جوبرەئیل عەرزی پەیامبەری خوای کردﷺ.

* بەشێکی تریان، تەفسیری هەندێ لە هاوەڵان بۆ هەندێك لە ئایەتەکانی تێدا بوو، بۆیە عوسمان فەرمانی دا هەموو ئەو قورئانانە بسوتێنرێن و تەنها یەك قورئانی نووسیوە کە هەموو قیرائەتەکانی لە خۆ گرتبوو، بە هیچ شێوەیەك قیرائەتە سابتەکانی لە پەیامبەری خواوەﷺ هەڵنەوەشاندەوە.

(١) (صحيح البخاري) كتاب فضائل القران، باب جمع القران، حديث (٤٩٨٧).

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: بەڵكو تەنها یەك قیرائەتی هێشتەوە، ئەویش ئەو قیرائەتە بوو كە بە زمانی قوڕەیش بوو.

ئیبن ئەلعەرەبی لە بارەی كۆكردنەوەی قورئان و سوتاندنی باقی موصحەفەكانی ترەوە دەڵێ: ( ئەمە كردەوە چاكە هەرە مەزنەكەی و خەسڵەتە گەورەكەیەتی، بەم كارەی جیاوازی بنبڕكرد و خوای گەورە لەسەر دەستی ئەم قورئانی پاراست)[1].

جا ئەمە شانازی و ڕێزداریە بۆ عوسمان، بەڵام ئەوان دەیكەنە تانە و بێ ڕێزیی و بەسەریەوە:

وَمَنْ يَكُنْ ذَا فَمٍ مُرٍ مَرِيضٍ يَجِدْ مُرًّا بِهِ المَاءَ الزُّلالا
ئەوەی دەمی تاڵ ونەخۆشە ئاوی سازگاریشی پێ تاڵ و ناخۆشە

**لێگرتنی پێنجەم: داویەتی لە ئیبن مسعود تا ڕیخۆڵەكانی تەقاندوە، هەروەها داویەتی لە عەممارِی كوڕی یاسر هەتا پەراسوەكانی شكاندوە.**

ئەمە درۆیە، ئەگەر ڕیخۆڵەكانی بتەقیایە دەمرد و نەدەژیا، جا نە ڕیخۆڵەكانی ئیبن مەسعودی تەقاندووە و نە پەراسوەكانی عەممارِیشی شكاندوە.

---

(١) (العواصم من القواصم) (ص٨٠). [(ابن عربی، ابـن العربـی) دوو نـاوو و دوو كەسـی جیاوازن، (ئیبن ئەلعەرەبی)ئەوەی كـە ئـەلیف و لامەكـەی پێوەیـە، زانایـەكی پایـەداری ئـەهلی سوونەت و جەماعەتە، خاوەن چەندین كتێبی بەنرخـە وەكـو(جـامع الأحكـام القـرآن)و(العواصـم القواصم) هتد..،بەڵام (ئیبن عەرەبی) بەبێ ئەلیف ولام، پیاوێكی گومڕای سەرلێشێواوە، سۆفیەكان بە گەورەی ڕادەگرن تەنانەت شێخولئەكبەر(شێخی هەرەگەورە)ی پێ ئەڵێن،تەنانـەت هەنـدێك لـە زانایان بە كافریشیان زانیووە، جا ئاگاداربە. (وەرگێڕ)]

## لێگرتنی شەشەم: زیادکردنی جێلەوەڕی قەدەغە

جێلەوەڕی قەدەغە (حِمی)[1] بۆ پەیامبەری خوا ﷺ هەبووە، هەر بۆیە دەفەرموێ: «إنما الحِمَى حِمَى اللهِ وَرسوله»[2]، واتە: (حِمَی تەنها بۆ خوا و بۆ پەیامبەری خوایە).

عومەر ﷺ پاکڕێکی بۆ لەوەڕاندنی حوشتری صەدەقە تەرخانکرد و ناوچەیەکی دیاری کراویشی بۆ سازدان تەنها حوشتری صەدەقەی تێدا دەلەوەڕا، بۆ ئەوەی قەڵەو بن و خەڵك سود مەندبن لێیان، بەڵام کاتێك کە عوسمان هات و خێر و صەدەقە زۆر بوو، هەستا ئەم پاکڕەی فراوانکرد، جا ئەمەیان کردۆتە تانەیەك بەسەریەوە، پێیان وت: ئەم لەوەڕگایەت وا فراوانت کردوە، خوا ئیزنی پێداوی یان درۆ بەناو خواوە ئەکەی؟

ئەویش وتی: عومەر پێش من ناوچەیەکی دیاریکراوی قەدەغەکرد و تەرخانی کرد بۆ لەوەڕاندنی حوشتری صەدەقە، بەڵام کە من هاتم حوشتری صەدەقە زیادی کرد، بۆیە منیش لەوەڕگاکەم فراوان کرد[1] جا توخوا ئەمە ڕەخنەیە؟!

## لێگرتنی حەوتەم: نوێژی سەفەری کورت نەکردۆتەوە.

---

(١) بریتیە لە دەورەدانی شوێنێك بۆ ئەوەی کەس نەڕواتە ناویەوە. [جێ لەوەڕی قەدەغە، قێغە، پاکڕیشی پێ دەگوترێ، لە زاراوە شەرعیەکەیدا، شوێنێکە دیاری دەکرێ ودەکرێتە لەوەڕگا، تەنها ئاژەڵی زەکات وئەوانەی بۆ جیهاد دەبرێن تێیدا دەلەوەڕێنرێت. (وەرگێڕ)]

(٢) (صحيح البخاري) كتاب المساقات، باب لا حمى إلا لله و رسوله) حديث (٢٣٧٠).

(١) أخرجه أحمد في (فضائل الصحابة) (١/ ٤٧٠ رقم ٧٦٥) بسند صحيح.

پەیامبەری خوا ﷺ لە سەفەردا دوو ڕکاتی کردووە، ئەبو بەکریش لە سەفەردا دوو ڕکاتی کردوە، عومەریش بەهەمان شێوە دوو ڕکاتی کردوە، عوسمانیش لە سەرەتای خیلافەتەکەیدا دوو ڕکاتی دەکرد، بەڵام دواجار بە تەواوی دەیکرد.

وەڵامیش ئەوەیە: سەرەتا: ئەمە مەسەلەیەکی فیقهی ئیجتهادی یە، عوسمان ئیجتهادی کردووە و هەڵە بووە؟ کە چی بکرێ؟ ئەمە ئەگەر فیعلەن هەڵەی کردبێ؟

بۆ ئەمە خوێنی عوسمان حەڵاڵ ئەکات؟ بۆ مەگەر غەیرە پەیامبەر ﷺ کێ مەعصومە؟

دوای ئەوەش، ئەم مەسەلەیە لە نێوان زانایاندا ڕاجیاوازی لەسەرە، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کەوا کورت کردنەوەی نوێژ سوننەتێکە و باش وایە بکری[١] جا گەر عوسمان شتێکی کردبێ، تەنها ئەوەیە کە وازی لە سوننەتێك هێناوە و موباحێکی کردوە، یان دەستبەرداری ڕوخسەت (ڕێپێدان)ێکی شەرعی بووە و عەزیمەتێکی کردوە.

بەڵام بۆچی عوسمان بە تەواوەتی کردویەتی؟ وتراوە بەهۆی یەکێك لەم دوو هۆکارەوە بووە:

١. لەبەرئەوەی خێزانی لەوێدا پێکەوەناوە - ژنێکی لەوێدا هێناوە - وای دەبینی لە شارەکەی خۆیدایە، هەر بۆیە بە تەواوی کردویەتی و کورتی نەکردۆتەوە.

---

(١) ئەمەش ڕەئی مالك و شافعی و ئەوزاعی و ئەحمەدە. (المغني) (٢/٥٤).

٢. عوسمان لەو خەڵکە ئەعرابیانە دەترسا کە دەهاتن بۆ مەککە، ئیتر گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان لەوێندەرێش نوێژەکانیان هەر بە کورتکراوەیی بکەن، بۆیە بەتەواویی دەیکرد، بەڵکو بۆیان ڕوون بکاتەوە کە نوێژ چوار ڕکاتە، ئیتر کامیان ڕاستە یان لەبەر چی وای کردوە؟ خوا خۆی دەزانێ.

جاکاتێك عائیشەش رضي الله عنها لە سەفەردا نوێژی بە تەواویی ئەنجامدا، بە عوروەیان ووت: باشە عائیشە بۆ وای کرد؟ ئەویش وتی: تەئویلی کردوە هەروەکو چۆن عوسمان تەئویلی کرد، جا مەبەستمان ئەوەیە عوسمان تەئویلی کردووە[(١)].

**لێگرتنی هەشتەم و نۆیەم و دەیەم: لە شەڕی بەدر ئامادە نەبوو، لە ئوحود ڕای کرد، لە «بیعة الرضوان» یشدا ئامادە نەبوو.**

وەڵامی ئەمەش لە صەحیحی بوخاری دایە: لە عوسمانی کوڕی مەوهیبەوە ئەڵێ: پیاوێکی میسری هات، وتی: ئەو خەڵکە کێن؟ وتیان: قورەیشین، وتی: ئەی ئەو ڕیش سپیە کێیە قسەتان بۆ دەکات؟ وتیان: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، کابرا هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و پێی وت: ئەی ئیبن عومەر پرسیاری شتێکت لێ ئەکەم وەڵامم بدەرەوە.

ئایا زانیوتە کەوا عوسمان لە ئوحود ڕای کردوە؟ وتی: بەڵێ.

ئایا زانیوتە ئامادەی جەنگی بەدر نەبووە؟ وتی: بەڵێ.

ئایا زانیوتە کە لە (بیعة الرضوان)دا ئامادە نەبوە؟ وتی: بەڵێ.

کابرا میسریەکە وتی: الله أكبر، -یانی ئەو ڕاستیە دەرکەوت، کەئەیویست.

---

(١) لە (الکافی) ی (کولەینی) دا هاتوە (٤/٥٢٤) لە ئەبی عەبدوڵڵا جەعفەری صادقەوە ووتویەتی: (کەوا لە حەرەمەین (مەککە و مەدینە) تەواوکردنی نوێژ باشترە).

بەڵام عەبدوڵلای کوڕی عومەر پێی وت: وەرە با بۆت ڕونکەمەوە: سەبارەت بە ڕاکردنی لە جەنگی بەدر دا، ئەوە من شایەتی ئەدەم کە خوای گەورە عـەفوی کردوە و لێی خۆشبوە، هەروەکو خوای بەرز و پیرۆز دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾ {آل عمران: ١٥٥}.

سەبارەت بە ئامادە نەبونی لە بەدردا، بە هۆی کچەکەی پەیامبەری خوا ﷺ کە خێزانی بوو و نەخۆش کەوتبوو، ئەوەبو پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرمو: (ئەی عوسمان، ئەجری کەسێکت هەیە بەشداری بەدری کردبێ و دەستکەوتیشی پێدا).

کەوابوو بە فەرمانی پەیامبەری خوا ﷺ ئامادەی جەنگ نـەبوە و بۆیـە لـە دەستکەوتی ئەو جەنگە بەشی ئەدات.

سەبارەت بە ئامادە نەبوونی لە (بیعة الرضـوان)دا، ئەگـەر لـە نێـو هـەمو مەککە دا پیاوێك لە عوسمان شکۆدارتر هەبوایە پەیامبـەری خـوا ﷺ ئـەوی لـە جێگەی دەنار[1]، کە پەیامبەری خوا ﷺ ناردی و دوای ئەوەی گەیشـتە مەککـە (بیعة الرضوان) بەسترا، پەیامبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی لە نێو دەستی چەپی دا

(١) یانی پەیامبەر ﷺ ئەو کەسەی لە باتی عوسمان دەنارد، چونکە پەیامبەرا ﷺ عوسمـانی نارد بۆلای خەڵی مەککە بەڵکو بۆیان ڕون بکاتەوە کە پەیامبەر ﷺ تەنها بۆ عومرە کردن هاتووە و هیچ مەبەستێکی تری نییە، وبەیعەتی ڕیزوانیش دوای ئەوەی عوسمان بچێت بۆ مەککـە ڕویـدا، کە ئامادەش نەبوو چونکە بە فەرمانی ڕەسولی خـوا ﷺ ڕۆیشـتبوو، ئەسـڵەن بەیعـەتی ڕیـزوان نەبەسترا، ئیللا بۆ تۆڵەسەندنەوەی عوسمان نەبێ لە ئەهلی مەککە، کە کـاتێ هـەواڵی پێگەیشـت عوسمان کوژراوە، پەیامبەری خوا ﷺ بەیعەتی ڕیزوانی لە هاوەڵان وەرگـرت بـۆ تۆڵـە سـەندنەوەی عوسمان، ئەگەر هاتوو هەواڵەکە ڕاست دەرچو کە کوژراوە.

و فەرموی: ئەمەش لەجیاتی عوسمان. ئینجا ئیبن عومەر پێی ووت: جا ئێستا بڕۆ و ئەمانەش لەگەڵ خۆت ببە[١].

## لێگرتنی یازدەهەم: عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەری لە بەرانبەر هورموزان نەکوشتەوە:

دوای ئەوەی ئەبو لوئلوئەی مەجوسی عومەری کوڕی خەتابی کوشت[٢]، کە بەیانی بوویەوە عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر هەستا و پیاوێکی بەناوی هورموزانەوە کوشت -سەرەتا مەجوسی بوو بەڵام دواجار موسڵمان بوو- کە پێیان وت بۆ وات کرد؟ وتی: بە سێ ڕۆژ پێش کوشتنی عومەر لەگەڵ ئەبو لوئلوئەی مەجوسی دا بووە و ئەو شیرەشیان پێ بووە کە عومەری پێ کوژراوە، بۆیە وای زانی ئەم هورموزانە هاوبەشە لە کوشتنی عومەردا، بۆیە ڕۆیشت و کوشتی.

لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە دەڵێ: (کاتێك کە عومەر کوژرا عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر وتی: بە لای ئەبو لوئلوئەی بکوژی عومەردا تێپەڕ بووم، بینیم (جوفەینە)و (هورموزان)ی لەگەڵدایە، چپە چپ و ورتە ورتیانە، هەرکە لە ناکاو چومە سەریان وروژان (یانی هەستان)، کە هەستان شمشێرێکیان لە بەیندا کەوت دوو سەری هەبوو، دەسکەکەی لە قەدەکەیدا بوو، جا بڕۆن بزانن ئەو شمشێرەی وا عومەری پێکوژرا چۆن بووە، تەماشایان کرد دەبینن هەمان ئەوەیە کە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر وەسفی کرد، هەرکە عوبەیدوڵڵا ئەمەی بیست، شیرێکی هەڵگرت و ڕۆیشت، چووە لای هورموزان و پێی وت: وەرە با بڕۆین هەندێك ئەسپم هەیە پێت نیشان دەم، لە ڕێگەدا نەختێ

(١) (صحيح البخاري) كتاب: فضائل الصحابة، باب مناقب عثمان، حديث (٣٦٩٩).
(٢) (صحيح البخاري) كتاب: فضائل الصحابة، باب قصة البيعة، حديث (٣٧٠٠).

خۆی دواخست تا هورموزان پێشکەوت، ئەوەبوو شیرەکەی لێ هەڵکێشا، عوبەیدوڵڵا ئەڵێ: هەرکە گەرمی شمشێرەکەی پێگەیشت وتی: لا إله إلا الله.

ئەڵێ: هەروەها جوفەینەشم بانگکرد، بەڵام ئەم گاورێکی خەڵکی (حیرە) بوو، هەر کە شمشێرەکەم لێ بەرزکردەوە، هێمای خاچی لە نێو چاوانی کێشا و پاشان کوشتی، دوای ئەوە عوبەیدوڵڵا ڕۆیشت کیژۆڵەیەکی ئەبو لوئلوئە -کە بانگەشەی ئیسلامی دەکرد- کوشتی، تەنانەت عوبەیدوڵڵا ئەیویست هەرچی سەبی[1] هەیە لە مەدینە بکوژێت، ئەوەبوو موسڵمانان لێی بە دەنگ هاتن، کۆچبەرە پێشەنگەکان لێی خڕبونەوە و هەڕەشەیان لێکرد، کە بۆت نییە ئەم کارە بکەی، ئەویش وتی: دە بەخوا دەیانکوژم و غەیری ئەوانیش دەکوژم، تەنانەت ئەیویست پەلاماری هەندێ لەو موهاجرانەش بدا، بەڵام عەمری کوڕی عاص وازی لێ نەهێنا و نەهێنا، هەتا شمشێرەکەی لێوەرگرت، هەر کە شمشێرەکەی پێدا، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هات بۆی، هەردوکیان کردیانە سەریەکتریا و کێشمە کێشیان بوو تا لە یەکتر جیاکرانەوە، دوای ئەمە هەر لەو شەوەدا پێش ئەوەی عوسمان وەکو خەلیفە هەڵبژێردرێ، ئەویش لەگەڵ عوبەیدوڵڵادا بووی بە دەمەقاڵ و کێشمە کێش، تا لەیەکتر جیاکرانەوە، جا بەڕاستی ئەو ڕۆژەی کە عوبەیدوڵڵا جوفەینە و هورموزان و منداڵەکەی ئەبو لوئلوئەی کوشت، خەڵك بێ تاقەت بوون و دنیایان لەبەر چاو ڕەش بوو.

دوای کە عوسمان بوو بە خەلیفە، کۆچبەران و پشتیوانانی کۆکردەوە و پێی وتن: پێم بڵێن، چی ئەڵێن لەبارەی کوشتنی ئەم پیاوەی کە لە دین ترازاوە؟ هەموو کۆچبەران لەسەر یەك شت ڕێککەوتن، ئەویش هاندانی عوسمان بەڵکو بیکوژێ، بەڵام زۆربەی زۆری خەڵك لەگەڵ عوبەیدوڵڵادا بوون، بە جوفەینە و

(١) بە دیلی شەڕ دەگوترێ. (وەرگێڕ).

هورموزانیان دەگوت (خوا لە ناویان دا): وادیارە دەتانەوێ لە شوێن عومەر کوڕەکەشی بنێرن؟ بەو هۆیەوە غەڵبە غەڵب و ڕاجیاوازی پەیدابوو، ئیتر عەمری کوڕی عاص بە عوسمانی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەم مەسەلە پێش ئەوەی تۆ ببیتە خەلیفە ڕویداوە، جاپێم باشە وازی لێبێنی، ئیتر خەڵك دوای قسەکانی عەمر بڵاوەیان لێکرد، عوسمانیش لە ئەوەندە وەستا، پاشان خوێن بابی دوو پیاو و کەنیزەکەش درا[١].

ئا لێرەدا سێ بۆچوون هەیە لە بۆ نەکوشتنی عوبەیدوڵلا لە بەرانبەر هورموزان:

**یەکەم:** ئەوەیە کە هورموزان لەگەڵ ئەبو لوئلوئەدا دەستی هەبوبێ لە کوشتنی عومەر، هەروەك عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر بینی، ئا بەمەش موستەحەقی کوشتنە، هەروەکو عومەر خۆی دەڵێ: ئەگەر هەمو خەڵکی (صەنعاء) دەستیان هەبێ لە کوشتنی کەسێکدا، ئەوا هەموویان لە باتی ئەو کەسە دەکوژم[١]. لێرەدا خوێنی هورموزان حەڵاڵ ئەبێ چونکە دەستی هەبووە لە کوشتنی عومەر.

**دووەم:** پەیامبەری خوا ﷺ ئوسامەی کوڕی زەیدی نەکوشت کاتێ تەئویلی کرد، کاتێك ڕۆژێ لە یەکێك لە جەنگەکاندا موشریکێکی بینی موسڵمانانێکی زۆری کوشت، ئەمیش پەلاماریدا، کابرای موشریك هەرکە ئەمی بینی لەترسا خۆی لە پشت دارێکا شاردەوە، ئوسامەش شمشێرەکەی بەرزکردەوە بیکوژێت، کابرا وتی: أشهد أن لا إله إلا الله، بەڵام ئوسامە وازی نەهێنا و هەر کوشتی، جا

---

(١) (الطبقات) لابن سعد (٣/٢٥٥) بسند صحيح.

(١) (صحيح البخاري) كتاب: الديات، باب: اذا أصاب قوم من رجل، حديث (٦٨٩٦).

کە ئەم هەواڵە گەیشت بە پەیامبەری خوا ﷺ، بانگی ئوسامەی کرد و پێی وت: کوشتت دوای ئەوەی وتی لا إله إلا الله؟!

وتی: ئەی ڕەسولی خوا لە ترسی شمشێرەکە وای وت، فەرموی: دڵیت شەق کرد (تابزانیت لە ترسا وتی؟)، ئیتر بەردەوام هەر دەیگوتەوە: کوشتت دوای ئەوەی وتی: لا إله إلا الله، تاوام لێهات خۆزگەم دەخواست کە ئەو ڕۆژە موسوڵمان ببوایەم(١).

جا پەیامبەری خوا ﷺ ئوسامەی نەکوشت لە بری ئەو کابرایە، لەبەرئەوەی ئوسامە وای لێکدابووەوە، جا ئەمەش هەمان حاڵەتە بۆ عوسمان، عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەری نەکوشت چونکە حاڵەتەکەی وا لێکدا بووەوە و تأویل کردبوو.

سێیەم: ئەڵێن: هورمزان وەلی ئەمری نەبووە (خاوەنی نەبووە)، جا هەر کوژراوێکیش وەلی نەبێ، ئەوا ڕاستەوخۆ خەلیفە دەبێتە وەلی ئەمری، بۆیە لە خوێنی ئەو پیاوە خۆش بوو، هەندێکی تر ئەڵێن: کوڕێکی هەبووە بە ناوی (القامذبان)، ئەو لە خوێنی عوبەیدوڵڵا خۆش بووە(١).

---

(١) متفق عليه: (صحيح البخاری) كتاب المغازی، باب بعث النبی اسامة إلى الحرقات، حديث (٤٢٦٩)، (صحيح مسلم) كتاب الايمان: باب تحريم قتل الكافر بعد أن قال: لا إله الا الله (١٥٨) (٩٦). [پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((أن الإسلام يهدم ما كان قبله)) واتە بێگومان ئیسلام بوون هەرچی تاوانی پێش خۆیەتی دەسڕێتەوە. بۆیە ئوسامە وا ئەڵێ. (وەرگێڕ)]

(١) چیرۆکی دەستهەڵگرتنی قامذبان لە خوێنی عوبەیدوڵڵا لە تاریخی تەبەریدایە ٣/٣٠٥، بەڵام لە ڕێگەی سەیفی کوڕی عومەری کەزابەوەیە.

## لێگرتنی دوازدەهەم: زیاد کردنی بانگی دووەمی ڕۆژی جومعە.

پەیامبەری خواﷺ دەفەرموێت: «عليكم بسنتي و سنه الخلفاو الراشدين من بعدي». واتە: (دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە سەر ڕاستەکانی دوای منەوە) (١).

ئەم زیادەیەش لە سوننەتی خەلیفە ڕاشدەکانەوەیە، بە دڵنیاییەوە عوسمان یەکێکە لەو خەلیفە ڕاشدیانە، جا دوای فراوان بوونی شاری مەدینە، بەرژەوەندی لەوەدا بینی ئەم بانگە زیاد بکات بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی کەوا کاتی نوێژی هەینی نزیك بوەتەوە، ئەم ئیجتهادەی کرد و سەرجەم هاوەڵانیش ڕازی بوون لەسەری، بەردەوامیش کاری پێکراوە و کەس پێچەوانەی نەکردووە، نە لەسەردەمی عەلی(١) و نە لەسەردەمی موعاویە و نە لەسەردەمی بەنی ئومەییە و نە لە سەردەمی بەنی عەبباسیش، تەنانەت تا ئەمڕۆش کەس لە موسوڵمانان پێچەوانەی ئەمەی نەکردوە، هەر بۆیە بە ئیجماعی هەموو موسوڵمانان ئەم کارە سوننەتە.

دوای ئەوەش، ئەم کارە بنچینەیەکی لە شەرعدا هەیە، کە بانگی یەکەم(٢) لە نوێژی بەیانیدا، پێ ئەچێ عوسمان قیاسی لەسەر ئەو بانگە کردبێ.

---

(١) (سنن أبي داوود): كتاب السنة، باب في لزوم في السنة، حديث (٤٦٠٧)، (سنن الترمذي): كتاب العلم، باب ماجاء في الأخذ بالسنة، حديث (٢٦٧٦).

(١) شێخی ئەلبانی لە کتێبی (الأجوبة النافعة)دا (ل١١) ئەڵێ: (عەلی لە کوفەدا کاری بە سوننەت دەکرد و بانگەکەی عوسمانی نەدەدا وەك لە قورتبیدا هاتووە...) (وەرگێڕ).

(٢) بەداخەوە ئەڵێم: لای ئێمە ئەمڕۆ ئەم سوننەتە مردوە، تەنها یەك بانگ ئەدرێ، خۆزگە هەر واش بمایە؟! ڕۆیشتوون بانگی دووەمیان هێناوەتە شوێن بانگی یەکەم وە لەباتی لەفزەکانی بانگی یەکەم لەفزەکانی بانگی دووەمی لە شوێن ئەدەن، واتە: سوننەتانێکیان کوشتووە بیدعانێکیان بەرپا کردووە، کە ئەویش خوێندنی هەندێ ئەزکارە لە پێش بانگدا، وە گۆڕینی لەفزی

**لێگرتنی سیازدەهەم: گێڕانەوەی حەکەم، لە کاتێکدا پەیامبەری خوا ﷺ نەفی کردبوو.**

ئەم بوختانەش لە سێ ڕوانگەوە وەڵام ئەدەینەوە:

یەکەم: ئەمە ئیسپات نەبووە و سەنەدێکی صحیحی نی یە.

دووەم: حەکەم یەکێکە لەوانەی کە لە ساڵی فەتح دا موسوڵمانان بوو، یەکێك بووە لە ئازاد کراوەکان (الطُّلَقَاء)[1] و طُلَقَاکانیش شوێنیان مەککە بووە، هەرگیز لە مەدینە نەژیاون، باشە چۆن پەیامبەری خوا ﷺ لە مەدینە نەفی دەکا و دوری دەخاتەوە، لە کاتێکدا ئەم بەهیچ شێوەیەك خەڵکی مەدینە نییە..؟!

سێیەم: ئەو نەفیەی لە شەریعەتی ئیسلامدا دانراوە لای ئەولایینی ساڵێکە، هەرگیز لە شەرعی خوادا نەبووە کە کەسێك بۆ هەتا هەتایە نەفی بکرێت، ئەمە چ تاوانێکە مرۆڤ پێی شایستەی ئەوە بکات، بۆ هەتا هەتایە نەفی بکرێ و لە زێدی خۆی دوور بخرێتەوە؟!

جا نەفی کردن سزایەکی تەمبێیە لە لایەن حاکمەوە دەسەپێنرێ، گریمان پەیامبەری خوا ﷺ نەفی کردووە و هەر بەنەفی کراویی بەدرێژایی ژیانی پەیامبەر ﷺ ماوەتەوە، لە خیلافەتی ئەبوبکریش بە هەمان شێوە ماوەتەوە، لە خیلافەتی عومەریشدا هەر بەنەفی کراویی ماوەتەوە، ئینجا دوای ئەم هەمووە

---

بانگی دوەم، وە بە ئیجماعی زانایان کاتی بانگی یەکەم، نە کاتی نوێژی بەیانییە، نە ڕۆژوانیش بەو بانگە ئیمساکیان لەسەر واجب دەبێ. فإنا لله وإنا إليه راجعون، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم. (وەرگێڕ)

(١) خۆشەویستی خوا کە ساڵی فەتح هاتە مەککەوە، پێی ووتن: اذهبوا فأنتم الطلقاء، بڕۆن ئێوە ئازادکراون، بۆیە ناوی طلقایان بەسەردا بڕا. (وەرگێڕ)

عوسمان گێڕاویەتیەوە، دوای چەند ساڵ؟ دوای زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ. باشە خراپی ئەم کارە لە کوێیەتی؟

ئەمە گریمان ئەگەر ڕاست بێ، کە ڕاست نییە، دوای ئەوەش پەیامبەری خوا ﷺ تکای عوسمانی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سرح قبولکرد، دوای ئەوەی هەڵگەڕایەوە، بێگومان حەکەم کارێکی لەمە گەورەتری نەکردوە، ئیدی چۆن پەیامبەری خوا ﷺ لەو خۆش دەبێ بەڵام لەم خۆش نابێ؟!!

ئەمە ئەو لێگرتن (المآخذ) و تانانەیە لەسەر عوسمان. وە دەتوانین بە پێی ئەم خشتەیەی خوارەوە دابەشی بکەین:

| | |
|---|---|
| شتانێکی بێ بنەما | ٢، ٣، ٥، ١٣ |
| چاکە | ٤، ٨، ١٠ |
| ئیجتهاد | ١، ٦، ٧، ١١، ١٢ |
| هەڵانێکی نوقم بوو وچاوپۆشی لێکراو | ٩ |

❊ ❊ ❊

# باسی شەشەم

## کوشتنی عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه

دوای وروژاندنی ئەم شتانە لەسەر عوسمان، لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا، کۆمەڵە خەڵکێك لە بەصرەوە و کۆمەڵە خەڵکێك لە کوفەوە و کۆمەڵە خەڵکێك لە میسرەوە بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ، وایان پیشاندا کە نیازی حەجیان هەیە، بەڵام لە ژێرەوە نیازی دەرچونیان هەبوو لە عوسمان، جیاوازی هەیە لە بارەی ژمارەیانەوە، ئەڵێن: دوو هەزار لە میسر و دوو هەزار لە کوفە و دوو هەزار لە بەسرە بوون، هەندێکی تر ئەڵێن: بەڵکو هەر هەموویان دوو هەزار بوون، ڕەئی تریش هەنە، لە ڕاستیدا سەر ژمێریەکی ورد نییە تا ژمارەیان کوتومت دیاری بکا، بەڵام بە هەر حاڵ نە لە دووهەزار کەمتر و نە لە شەش هەزار زیاتر بوون.

ڕۆیشتنە مەدینەوە، جا ئەم خەڵکانەی کە هاتبوون هەموویان دەم سپی عەشرەتی خۆیان بوون، هاتبوون بۆ لە کارلابردنی عوسمان، ئیتر بە هەڕەشەکردن بێ یان بە هێزی بازو، لە کۆتایی مانگی (ذی القـ ٥٠١) دا بوو دەوری ماڵەکەی عوسمانیاندا و فەرمانیان پێکرد خۆی واز لە خیلافەت بهێنێ، ئەم ئابلۆقەیە هەتا هەژدەی ذي الحجة بەردەوام بوو، کە ئەکاتە ڕۆژی کوشتنی عوسمان رضي الله عنه.

ئەڵێن: ئابلۆقەکە چل ڕۆژ بەردەوام بووە، بەڵام هەندێکی تر شتی تر ئەڵێن، هەرچۆنێك بێ لە چل و یەك ڕۆژ زیاتر نەبووە.

کە لە ماڵەکەی خۆیدا ئابلۆقەی درا، لە نوێژی جەماعەت قەدەغە کرا، تەنانەت لە ئاویش، ئەوەبوو پیاوێك لە سەرانی فیتنەکە بەرنوێژی بۆ خەڵك

دەکرد، تا ئەوەبوو عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی خیار هات بۆلای عوسمان و پێی ووت: سەری فتنەکە نوێژ بە خەڵکی دەکات، ئەمر بەچی ئەفەرموون؟ ئەویش وتی: (نوێژ باشترین شتێکە خەڵك ئەنجامی ئەدات، جا ئەگەر خەڵك چاك بوون تۆش چاك بە، ئەگەریش خراپ بوون ئەوا خۆت لەخراپەیان بە دووربگرە)(١).

هەندێك لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ڕۆیشتنە ماڵەکەی عوسمان بە مەبەستی بەرگری لێکردنی، لە بەناوبانگترینی ئەوانەی ڕۆیشتنە ماڵەکەی و لەگەڵیدا دانیشتن حەسەنی کوڕی عەلی و حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و ئەبوهورەیرە و موحەممەدی کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (السجاد) و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوون، ئەمانە هەر هەموویان شمشێریان دەرهێنا و ڕووبەڕووی ئەو ستەمکار و زۆردارانە وەستانەوە کە بۆ کوشتنی عوسمان رضي الله عنه هاتبوون(٢).

* هەروەها صەفیەی دایکی ئیمانداران بەسەر وڵاخێکەوە بوو کە کینانەی خزمەتکاری ڕایدەکێشا، ئەوەبوو ئەشتەر لە ڕێگادا پێی گەیشت و کێشای بە ناو چاو وڵاخەکەیدا.

دایکی ئیمانداران وتی: بمگەڕێننەوە، با ئەم سەگە ئابڕوم نەبات(٣).

بەڵام عوسمان فەرمانی کرد بە هاوەڵان نەجەنگن، تەنانەت لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە: کەوا زیاتر لە حەوت سەد کەس لە کوڕی صەحابە هاتوون بۆ

(١) (البداية والنهاية) (٧/١٨٤).
(٢) (البداية والنهاية) (٧/١٨٤).
(٣) (الطبقات) ابن سعد (٨/١٢٨٠)، و إسناده حسن.

بەرگریکردن لە عوسمان، بەڵام تەنانەت ئەم حەوت سەد کەسەش هەر ناگەنە ژمارەی ئەو ستەمکارانە کە بەلانی کەمەوە وەك گوتویانە دوو هەزار کەس بوون.

* لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەوە ئەڵێ: لەگەڵ عوسماندا بووم لە ماڵەکەیدا، ئاگام لێ بوو وتی: جەخت دەکەمەوە لەسەر هەر کەسێك کە گوێڕایەڵیم بە واجب دەزانێ، با دەست هەڵگرێ و چەکەکەی دابنێ[(١)] * لە ئیبن سیرینەوە دەڵێ: زەیدی کوڕی سابت هاتە لای عوسمان رضي الله عنه و پێی ووت: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەوە پشتیوانەکان لە بەر دەرگان، ئەڵێن: ئەگەر ئەتەوێ جارێکی تر و دووبارە ئەبینەوە بە ئەنصاری خوا و ئەکەوین لەگەڵت هەروەکو چۆن لەگەڵ پەیامبەری خوا ﷺ بووین.

بەڵام عوسمان وتی: بە شەڕکردن نەخێر[(٢)] * هەروەها ئیبن عومەریش ڕۆیشتە ژورەوە بۆلای، بە ئیبن عومەری ووت :

ئەی کوڕی عومەر دەبینی ئەوانە چی ئەڵێن؟ ! ئەڵێن واز بێنە و خۆت مەدە کوشت.

ئیبن عومەر پێی ووت: ئەگەر وازی لێ بهێنی هەتا هەتایە دەژیت؟

وتی: نەخێر

ئیبن عومەر وتی: ئەگەر وازی لێ نەهێنی لەوە زیاتر هەیە کە بتکوژن؟

---

(١) (المصنف) لابن أبی شیبة (١٥/٢٤ رقم ١٩٥٠٨) بسند صحیح.
(٢) (المصنف) لابن أبی شیبة (١٥/٢٠٥ رقم ١٩٥٠٩) بسند صحیح.

وتی: نەخێر.

ئیبن عومەر وتی: ئەی بەهەشت و ئاگریان بەدەستە؟

وتی: نەخێر.

ئیبن عومەر وتی: کەواتە من وا ئەبینم جلێك کە خوا لەبەرتی کردوە لەبەری نەکەنی، ئیتر دوای تۆ ببێتە عادەت (سُنّة)، هەرکە خەڵکێك خەلیفەکەیان یان فەرمانڕەواکەیان بەدڵ نەبوو لایبدەن[1]

* هەروەها عوسمان بە بەندەکانی خۆی ووت: هەرکەس چەکەکەی دابنێ و شەڕنەکات، لەبەر خوا ئازادی دەکەم.

کەواتە عوسمان خۆی نەیهێشتووە خەڵك شەڕبکات.

لەگەڵ ئەمەشدا چوار گەنجی قوڕەیشی کە خەڵتانە خوێن کرابوون خرانە سەر شان و بران بەهۆی بەرگریکردنیان لە عوسمان، ئەوانیش بریتی بوون لە: حەسەنی کوڕی عەلی ـ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ـ مەڕوانی کوڕی حەکەم ـ موحەممەدی کوڕی حاتەب[2]

## کێ عوسمانی کوشت ؟

دوای گەمارۆدانی عوسمان و دەوردانیماڵەکەی، لە کاتێکدا قورئانەکەی لەبەردەستدا بوو و قورئانی ئەخوێند کوشتیان.

(١) أخرجه أحمد فی کتاب (فضائل الصحابة) (٤٧٣/١ رقم ٧٦٧) بإسناد صحیح.
(٢) (الاستیعاب) لابن عبدالبر بحاشیة (الاصابة) (٧٨/٣).

پرسیان لە حەسەنی بەسرِی -کە لەوسەردەمەدا ژیاوە ولەگەورە تابعیەکانە- لەبارەی ئەوانەی عوسمانیان کوشت: کەس لە موهاجرین وئەنصاری تیابوو؟

ئەویش وتی: ئەوانە کۆمەڵێ یاخی و گومرِا بوون لە خەڵکی میسر[١].

بەڵام سەرکردەکانیان ناسراون، بریتین لە: کینانــەی کــورِی بیشــر، رِۆمــانی یەمانی، پیاوێك بە ناوی جەبەلە، سودانی کورِی حەمرِان، لەگەڵ پیاوێکی تر لــە خێڵی سەدوس کە بە (الموت الاسود) ناسراوە.

هەندێك ئەڵێن: مالیکی کورِی ئەشتەری نەخعیش.

ئا ئەمانە سەرکردایەتی ئەو ئاژاوەیانە کرد دژ بە عوسمان.

**بەڵام کێ رِاستەوخۆ کوشتی؟** ئەوە بەناوبانگە کە پیاوێکی میسری بووە بە ناوی جەبەلە.

* لە عەمرەی کچی ئەرتەئەوە ئەڵێ: لەو ساڵەی وا عوسمان کوژرا، لەگەڵ عائیشەدا بووم بۆ مەککە ئەرِۆیشتین، دوای کە هاتینەوە بە مەدینەدا تێ پەرِین، ئەو قورئانەمان بینی کە کاتێك عوسمان کوژرابوو لە باوەشیدا بوو، دەبینین یەکەمین دڵۆپی خوێنەکەی کەوتۆتە سەر ئەم ئایەتە: ﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾[البقرة١٣٧].

واتە: (ئینجا ئەگەر برِوایان هێنا بەو وێنەیەی کە ئێوە برِواتان پێ هێناوە، ئەوە بێگومان رِێی رِاستیان دۆزیەوە وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد و نەیانویست ئەوا

---

(١) (تاریخ خلیفة) (ص ١٧٦) بإسناد صحیح.

ئەوان لە دوبەرەکیدان، خودا ئاگاداری تۆ ئەکات لەوان (لە ناویان دەبات بۆت) وە هەر خوایە بیسەری زانا).

عەمرەی کچی ئەرتەئە ئەڵێ: هەربۆیە دەبینی یەکێکیان بەڕێکی نەمرد[١].

* هەروەها لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ئەڵێ: بە دەوری کەعبەدا دەسوڕامەوە بینیم پیاوێك دەپاڕایەوە و ئەیوت: پەروەردگارا ! لێم خۆش ببە، ئەگەرچی وا نازانم لێم خۆش ببی!

ئەڵێ: منیش پێم سەیر بوو، وتم: ئەی بەندەی خوا من گوێم لە کەس نەبووە بەم شێوازەی تۆ بپاڕێتەوە ؟!

ئەویش وتی: ئاخر ئەمن پەیمانم بەخوا دابوو بەس دەستم بگاتە عوسمان زللەیەکی پیاکێشم، ئەوەبوو کاتێك کە کوشتیان لە نێو جێگە لە ماڵەکەی خۆی دانرابوو، خەڵك دەهاتن نوێژیان لە سەر دەکرد، منیش خۆم کردە ژورەوە و وام پیشاندا کە بۆ نوێژکردن هاتووم، کە بینیم دەورم چۆڵە و ماڵەکە کەسی تێدا نییە، بان چاویم لادا و زللەیەکم پیاکێشا، بۆ خۆی دەستم وشك بوو ! ئیبن سیرین ئەڵێ: دەستیم بینی وشك بوو بوو وەکو دار[٢].

* * *

(١) أخرجه أحمد في كتاب (فضائل الصحابة) (١/٥٠١ رقم ٨١٧) واسناده صحيح وانظر كذلك (٧٦٥/٧٦٦).

(٢) (البداية و النهاية) (٧/٢٠٠)، و ڕاویەکانی هەموو سیقەن، جگە لە (عیسای کوڕی مینهال) نەبێ، ئەمیش ئیبن حیببان لە (الثقات) دا هێناویەتی، وە هەریەك لە بوخاری لە (تاریخ الكبير) (٦/٣٩٩) و ئیبن ئەبی حاتیم لە (الجرح و التعديل) دا (٦/٢٨٨) باسیان کردووە و لێی بێدەنگ بوون.

## چۆن عوسمان ﷺ کوژرا و کەسیش لە هاوەڵان بەرگری لێ نەکرد؟

### هۆکاری یەکەم :

عوسمان خۆی لەسەر ئەمە جەختی دەکرد و داوای لێکردن شمشێرەکانیان دابنێن و واز لە شەڕ کردن بێنن، خۆی تەسلیمی قەزا و قەدەری خوای باڵا کردبوو.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ دوو شت :

یەکەمیان: لێهاتویی و زیرەکی عوسمان.

دووەمیان: ڕەحمەت و بەزەیی عوسمان بە ئومەتی موحەممەددا ﷺ، چونکە ئەیزانی ئەم ئەعرابیانە گەمژەن و لە هیچ تێناگەن، نیەتی خراپیان هەیە، بۆیە وای دەبینی ئەگەر هاوەڵان ڕوبەڕویان ببنەوە خراپە (مەفسەدە)ی زۆرتر ئەبێ وەك لە کوشتنی تاکە کەسێك، لەوە ئەچو هاوەڵێکی زۆر بکوژرایەن، دەستدرێژیش بکرایەتە سەر ناموس و ماڵیشیان، بۆیە ئەمەی بە باش زانی کە تەنها خۆی بکوژرێت و ئەو هەموو هاوەڵەی پەیامبەر ﷺ بە کوشت نەدا و ئابڕوی مەدینەی پەیامبەری خوا ﷺ بپارێزێت.

### هۆکاری دووەم:

هاوەڵان ژمارەیان زۆر زۆر کەمتر بوو لەو خەوارجانە، چونکە ئەوکاتە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ بەسەر چوار ناوچەدا دابەش بوو بوون:

شوێنی یەکەم: مەککە؛ لەبەرئەوەی مەوسمەکە مەوسمی حەج بوو، هاوەڵێکی زۆر ڕۆیشتبوون بۆ حەج و ئامادە نەبوون.

شوێنی دووەم: هەندێك لە هاوەڵان لە ناوچەکانی تردا دەژیان، وەکو کوفە و بەسرەو میسر وشام و... هتد.

شوێنی سێیەم: لە جیهاددا بوون.

شوێنی چوارەم: ئەوانە بوون کە لە مەدینە بوون و هاو ژمارەی ئەو خەوارجانە نەبوون.

## هۆکاری سێیەم:

لە ڕاستیدا هاوەڵان منداڵەکانی خۆیان نارد بۆ بەرگریکردن لە عوسمان، بەڵام تەسەوریان نەدەکرد مەسەلەکە بگاتە کوشتن، تەنها دەیانگوت گەمارۆدان، کەللەڕەقیەکە و کۆتایی دێ و ئیتر تەواو و دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەوان جورئەت بکەن و عوسمان بکوژن، ئەمە لەلای گەلێك لە هاوەڵان قابیلی قبوڵ نەبوو، وایاندەزانی کارەکە سەر بۆ کوشتن ناکێشێت.

جا نزیکترینی ئەم بۆچونانە، بۆچوونی یەکەمیانە کە ئەڵێ عوسمان خۆی نەیهێشتوە بەرگری لێ بکرێ و شەڕ لەگەڵ ئەو خەوارجانە بکرێ.

* * *

# باسی یەکەم

## عەلی کوڕی ئەبو تالب ﷺ لە چەند دێڕێکدا

*** ناو و ڕەچەڵەکی :**

ناوی عەلی کوڕی ئەبو تالبی کوڕی عەبدولموتەللیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدمەنافە، ئامۆزای پەیامبەرە ﷺ ومێردی گەورەی ئافرەتانی دونیایە (فاتیمەی کچی پەیامبەر ﷺ)، باوکی هەردوو کچەزاکەی پەیامبەرە ﷺ حەسەن و حوسەین سەلامی خویان لێ بێ. دایکی ناوی: فاتیمەی کچی ئەسەدی کچی هاشمی کچی عەبد مەنافە[1]، کە یەکەمین کەسێکە لە بنەماڵەی هاشمی لە ئافرەتێکی هاشمی بوو بێت.

کونیەکەی: ئەبولحەسەنە، پەیامبەر ﷺ کونیەی (ئەبو توراب)یشی لێناوە. هەر بەمنداڵی موسوڵمان بووە ولەسەر ڕەئی مەشهور هەشت ساڵان بووە[2].

*** خێزانەکانی عەلی:**

١. فاتیمەی کچی پەیامبەری خوا ﷺ.

٢. ئومامەی کچی ئەبولعاص، کە دایکی دەکاتە زەینەبی کچی پەیامبەری خوا ﷺ، دوای وەفاتی فاتیمەی پوری، عەلی خواستی.

٣. خەولەی کچی جەعفەری کوڕی قەیس.

---

(١) (معرفة الصحابة) (٢٧٨/١).

(٢) (معرفة الصحابة) (٢٧٨/١).

٤. لەیلای کچی مەسعود.

٥. ئوم ئەلبەنینی کچی حیزام.

٦. ئەسمائی کچی عومەیس.

٧. صەهبائی کچی ڕەبیعە.

٨. ئوم سەعیدی کچی عورڕوە.

* منداڵەکانی :

کوڕەکـان: حەســەن - حوســەین - موحەممــەدی گــەورە - عوبەیــدوڵڵا - ئەبوبەکر - عەباسی گەورە - عوسمان - جەعفەری گەورە - عەبدوڵڵا - یـەحیا - عەون - عومەری گەورە - موحەممەدی ناوەڕاست - موحەممەدی بچوك.

کچەکان: زەینەبی گەورە - ئـوم کەلسـومی گــەورە - ڕوقەییــە - دایکـی حەسەن - ڕەمڵەی گەورە - ئوم هانی - مەیمونە - زەینــەبی بچــوك - ڕەمڵــەی بچوم - ئوم کەلسومی بچوك - فاتیمە - ئومامە - خدیجــە - ئومــو لکـیڕام - ئوم سەلەمە - ئوم جەعفەر - جومانە - نەفیسە.

* فەزڵەکانی عەلی :

دەتوانین فەزڵەکانی عەلی ﷺ بکەینە سێ بەشەوە:

١. هەندێکی تایبەتە بە خۆیەوە.

٢.هەندێکی لەگەڵ ئال و بەیتدایە.

٣.هەندێکی لەگەڵ کۆمەڵی هاوەڵاندایە.

**یەکەمیان: ئەو فەزڵانەی کە تایبەتن بە خۆیەوە:**

**لەوانە:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا فەرمووی: (ئاڵاکە دەدەمە دەستی پیاوێکەوە، خوا و پەیامبەرەکەی خۆشیان دەوێت و ئەویش خوا و پەیامبەرەکەی خۆشدەوێت) [١].

**لەوانە:** لە عەلیەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ پێی وتم: (کەس خۆشتی ناوێ مەگەر موسڵمان، کەسیش ڕقی لێت نابێ مەگەر مونافیق) [٢].

**لەوانە:** لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ﷺ ئەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: (تۆ بۆ من وەکو هارونی بۆ موسا؟ بەڵام ئەوندە هەیە پەیامبەر دوای من نییە) [٣].

**لەوانە:** لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەرکەس من دۆستیم ئەوا عەلیش دۆستێتی) [٤].

---

(١) أخرجه البخاري: كتاب فضائل، باب مناقب علي (٣٧٠٢). و مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل علي (٢٤٠٥).

(٢) أخرجه مسلم في كتاب الايمان، باب الدليل على أن حب الانصار و علي من الايمان (٧٨).

(٣) أخرجه البخاري: كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب علي (٣٧٠٦). و مسلم في كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل علي (٢٤٠٤).

(٤) أخرجه أحمد (٥/٣٥٠) واسناده صحيح.

**دووەمیان: فەزڵەکانی ئال و بەیت -کە ئەمیش یەکێکە لە ئالوبەیت-:**

**لەوانە:** لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ لە نێوان مەککە و مەدینەدا لە لای جۆگەلەیەك ووتارێکی بۆ خوێندین کە پێی دەوترا (خُم)، فەرموی: (ئەی خەڵکینە ئە من دوو شتی سەنگینم لە نێوانتاندا بە جێ هێشتووە، یەکێکیان لەوەکەی تریان گەورە ترە) ئەوەبوو باسی قورئانی کرد و جەختی لەسەر کردەوە و پاشان فەرمووی (هەروەها خانەوادەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم ). بە زەید ووترا: ئەی ئەهلو بەیتەکەی کێن؟ ئەویش وتی: ئەوانەن وا خێرو صەدەقەیان لەسەر قەدەغە کرابوو، کە ئالی عەلی و ئالی عەقیل و ئالی جەعفەرو ئالی عەبباسن. بە زەید ووترا: هەمو ئەمانە لە ئەهل و بەیتین؟ وتی: بەڵێ[(١)].

**لەوانە:** لە عائیشەوە ئەڵێ: (بەرە بەیانێك پیغەمبەری خواﷺ دەرچوو و بوردەیەکی سوفی لەسەر شان بوو، پاشان عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینی ی خستە ژێر کراسەکەوە و ئینجا فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ [الأحزاب: ٣٣]. واتە: (بەڕاستی ئەی (ئەهل و بەیت)ی پەیامبەر ﷺ خوا دەیەوێ ئێوە لە هەر جۆرە پیسی و گوناهێك دوور بخاتەوەو پاك و خاوێنتان بکاتەوە بە تەواوەتی)[(١)].

---

(١) أخرجه مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب ماجاء في فضل علي (٢٤٠٨).

(١) أخرجه مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل أهل بيت النبي (٢٤٢٤).

## سێیەمیان: فەزڵە گشتیەکانی:

لەوانە: پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: (ڕاوەستە ئەی حیراء تۆ تەنها پەیامبەر، یا صدیق، یا شەهیدت لەسەرە)[1].

لەو کاتەش کێوی ئوحود پەیامبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبەیر و سەعدی لەسەر بوو -ڕەزای خوا لە هەمویان بێت-.

لەوانە: لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( دە کەس لە بەهەشتن: ئەبوبەکر لە بەهەشتایە، عومەر لە بەهەشتایە، عەلی لە بەهەشتایە، عوسمان لە بەهەشتایە، تەڵحە لە بەهشتایە، زوبەیر لە بەهەشتایە، ئەبوعوبەیدە لە بەهەشتایە، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتایە، سەعد لە بەهەشتایە، هاوڕێکەتان لە بەهەشتایە)[2].

لەوانە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (باشترینی خەڵك، خەڵکانی سەردەمی منن، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان)[1].

---

(١) أخرجه مسلم: كتاب فضائل الصحابة باب فضائل طلحة والزبير (٢٤١٧) عن أبي هريرة.

(٢) أخرجه الترمذي في كتاب المناقب، باب مناقب عبدالرحمن بن عوف (٣٧٤٨) واسناده صحيح. ئەوەی زەید کە ئەڵێ: وە هاوڕێکەتان لە بەهەشتدایە، مەبەستی خۆیەتی.

(١) صحيح البخاري كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل أصحاب النبي ح (٣٦٥١). ومسلم في كتاب فضائل الصحابة، باب فضل الصحابة (٢٥٣٣).

*** هەروەها لەو شتانەی تر کە عەلی تایبەتمەندی پێ پەیدا کرد و لە هاوڕێکانی جیا کردەوە:**

**جەنگی خەندەق:**

لە ڕۆژی خەندەقدا دەرچوو بۆ ڕوبەڕو بوونەوەی عەمری کوڕی عەبد ود، پێی ووت: ئەی عەمر تۆ پەیمانت بە خوا داوە کەوا هەر قورەیشیەك داوای یەکێك لە دوو پێویستیەت لێ بکا ئەوا وەڵامی دەیتەوە، ئەویش وتی: بەڵێ. عەلی وتی: جا ئەمن بانگت دەکەم بۆلای خوا و پەیامبەر و بۆ لای ئیسلام. عەمر وتی: پێوەیستیم بەوە نییە. عەلی وتی: کەواتە داوای مویارەزەم لەگەڵ بکە. ئەویش وتی: بۆ ئەی کوڕی برام؟ بەخوا حەز ناکەم بتکوژم. عەلی پێی ووت: بەڵام بەخوا من حەز دەکەم بتکوژم. ئیتر عەمر گەرم بوو و لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و ملی لێکردەوە و دایبە نێو چاویدا و پاشان هاتە بەرانبەر عەلی و مویارەزەی لەگەڵ کرد، ئەوەبوو عەلی کوشتی. جا عەمر وتی:

وَلَقَدْ بَحَحْتُ مِنَ النِّدَا ءِ لِجَمْعِهِمْ هَلْ مِنْ مُبَارِزْ
وَوَقَفْتُ إِذْ جَبُنَ الْمُشَجَّـ ـعُ مَوْقِفَ القِرْنِ الْمُنَاجِزْ
وَلِذَاكَ إِنِّي لَمْ أَزَلْ مُتَسَرِّعًا قَبْلَ الهَزَاهِزْ
إِنَّ الشَّجَاعَةَ فِي الفَتَى وَالْجُودَ مِنْ خَيْرِ الغَرَائِزْ[1]

عەلیش وەڵامی دایەوە و وتی:

---

(١) (علي بن أبي طالب)للصلابي ص٩٩. وانظر: (البداية والنهاية)حوادث سنة٥هـ،غزوة خندق.

لا تَعْجَلَنَّ فَقَدْ أَتَاكَ مُجِيبُ صَوْتِكَ غَيْرَ عَاجِزْ
فِي نِيَّةٍ وَبَصِيرَةٍ وَالصِّدْقُ مَنْجَى كُلِّ فَائِزْ
إِنِّي لأَرْجُو أَنْ أُقِيمَ عَلَيْكَ نَائِحَةَ الجَنَائِزْ
مِنْ ضَرْبَةٍ نَجْلاءَ يَبْقَى ذِكْرُهَا عِنْدَ الهَزَاهِزْ

**ڕۆژی خەیبەر:**

مەرحەبی یەهودی هاتە دەرەوە و وتی:

قَدْ عَلِمَتْ خَيْبَرُ أَنِّي مَرْحَبُ شَاكِي السِّلاحِ بَطَلٌ مُجَرَّبُ
إِذَا الحُرُوبُ أَقْبَلَتْ تَلَهَّبُ

خەیبەریش ئەزانێ کە من مەرحەبم، چەك بەهێز و بە ئەزموون چاو نەترسم، هەر کە شەڕ بوو بڵێسەم دێ و ناترسم.

عەلیش وەڵامی دایەوە و وتی:

أَنَا الَّذِي سَمَّتْنِي أُمِّي حَيْدَرَهْ كَلَيْثِ غَابَاتٍ كَرِيهِ المَنْظَرَهْ
أُوفِيهِمُ بِالصَّاعِ كَيْلَ السَّنْدَرَهْ

من ئەوەم دایکم ناوی لێناوم (حەیدەرم)، وەکو شێری دارستان دیمەن سەیرم، دوژمن دەکوژم بە زۆری و تاقی ئەبڕم[١].

(١) أخرجه مسلم في كتاب الجهاد، باب فضل الصحابة، باب غزوة ذي قرد (١٨٠٧).

### * بەیعەت پێدانی عەلی رضي الله عنه:

لە موحەممەدی کوڕی حەنەفیەوە، کە کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە -ڕەزای خوای لێبێ-، ئەڵێ: عەلی هات بۆ ماڵەکەی عوسمان دوای ئەوەی کوشتیان، ڕۆیشتە ماڵەوە و دەرگاکەی پشکۆڵدا، خەڵك هاتن و دایان لەدەرگا، وتیان: ئەوەتا ئەو پیاوە کوژراوە، خۆ نابێ خەڵك بێ خەلیفە بن، جا کەس لە تۆ شایستەتر شك نابەین بۆ ئەم کارە.

عەلی پێیگوتن: واز لە من بێنن! من وەزیرتان بم باشترە لەوەی ئەمیرتان بم.

ئەوانیش گوتیان: نەخێر، بەخوا کەس لە تۆ شایستەتر نییە بۆ ئەم کارە، ئەویش وتی: باشە کە هەر واز ناهێنن و هەر ئەبێت من بم، ئەبێ بەیعەت پێدانەکەم نهێنی نەبێ، ئەڕۆم بۆ مزگەوت، هەرکەس ئەیەوێ بەیعەتم پێ بدا با بەیعەت بدا، پاشان دەرچوو بۆ مزگەوت و خەڵکی بەیعەتیان پێدا[1]، پاشان هەرچی موهاجیر و ئەنساری لە مەدینە بوو بەیعەتیان پێدا.

ئەڵێن: هەندێك لە هاوەڵان ئامادەی بەیعەت پێدانەکەی نەبوون وەکو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و... هتر.

هەندێکی تر ئەڵێن: بەڵکو لە لایەن هەمووانەوە بەیعەتی پێدراوە، ئەم بۆچوونەش مەشهورترە، چونکە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵڵای کوڕی

---

(١) أخرجه أحمد في (فضائل الصحابة) (٥٧٣/٢ رقم ٦٩٦)، واسناده صحيح.

عومەر و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە تەنها لە جەنگ کردن لەگەڵیدا ئامادە نەبوون وەگەرنا هەموویان بەعەتیان پێداوە.

* عەوفی کوڕی ئەبی جەمیلە ئەڵێ: لە خزمەتی حەسەنی بەسریدا دانیشبووم جا ئەم لە کاتی کوشتنی عوسماندا لە مەدینەدا بووە، باسی هاوەڵانی پەیامبەر کرا ﷺ، ئیبن جەوشەنی غەتەفانی گوتی: ئەی ئەبو سەعید خۆ سوکایەتی بە ئەبو موسا کرا کاتێك شوێنی عەلی کەوت[1]، حەسەن توڕەبوو هەتا لە دەم و چاوی دەرکەوت، وتی: ئەی ئەو خەڵکە شوێنی کێ بکەوتایەن؟! ئەمیری ئیماندارانیان بە مەزڵومی کوشت خەڵکیش ڕوویان کردە باشەکەیان و بەیعەتیان پێدا، ئەی ئەو خەڵکە شوێنی کێ بکەوتایەن؟! چەند جارێك هەر ئەمەی دووبارە کردوە[2].

جا ئەهلی سوننەت کۆڕا و یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە باشترین هاوەڵی پەیامبەر ﷺ دوای عوسمانی کوڕی عەففا ن رضي الله عنه عەلی کوڕی ئەبو تالبە رضي الله عنه.

* ئیبن تەیمیە: ئەڵێ: لە ئەحمەدەوە ڕیوایەت کراوە ووتویەتی: هەر کەسێ لە خیلافەتی عەلی بێ دەنگ بێ و هیچی لەبارەوە نەڵێ، موبتەدیعە و گومڕاترە لە گوێدرێژەکەی ماڵی خۆیان. هەروەها فەرمانی کردووە بە سەلام لێنەکردن و دوور کەوتنەوە لێی و هجرکردنی[1].

---

(١) مەبەستی ئەوەیە خەڵك کە تانەیان لە ئەبی موسا دەدا بە هۆی ئەوەیەوە شوێنی عەلی کەوتبوو، لە کاتێکدا ئەبوایە شوێنی نەکەوتایە.

(٢) أخرجه أحمد في (فضائل الصحابة) (٢/٥٧٦ رقم ٩٧٦) باسناد صحيح.

(١) (مجموع الفتاوى) (٤/٤٣٨).

هەر بۆیە ئەهلی سوننەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە باشترین هاوەڵی پەیامبەر ﷺ ئەبوبەکرە، پاشان عومەرە، بەڵام لە دوای عومەر جیاوازیان هەیە -هەروەك باسمان کرد-، کە ئایا عوسمانە یان عەلی، بەڵام جمهوری زانایان پێیان وایە عوسمان باشترە لە عەلی، لەسەر ئەوەش کۆکن کە عەلی کوڕی ئەبو تالب چوارەم خەلیفەی ڕاشیدە.

❊ ❊ ❊

# باسی دووەم

## گرنگترین ڕووداوەکانی خیلافەتی عەلی رضي الله عنه

### * جەنگی جەمەل ساڵی ٣٦ ک:

کاتێك بەیعەت درا بە عەلی کوڕی ئەبو تالب، تەڵحە و زوبەیر ڕوخسەتیان لە عەلیرضي الله عنه خواست کە بڕۆن بۆ مەککە ئەویش ڕوخسەتی دان، لەوێدا گەیشتن بە دایکە عائیشە، جا هەواڵی ئەوەی پێگەیشتبوو کە عوسمان کوژراوە، هەر لەوێدا لە مەککە کۆبونەوە و جەختیان لەسەر تۆڵەسەندنەوەی عوسمان کردەوە.

پاشان یەعلای کوڕی مونیە لە بەسرەوە و، عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە کوفەوە هاتن و لە مەککەدا کۆبوونەوە لەسەر تۆڵە سەندنەوەی عوسمان، کە ئەبێ بسەندرێ.

ئەوەبوو بەخۆیان و ئەوانەشی دوایان کەوتبوون لە مەککەوە بەرەو بەسرە بەڕێکەوتن و بەمەبەستی کوشتنی بکوژەکانی عوسمان، وایان دەبینی کەمتەرخەمیەکیان کردووە لە ئاست بەرگریکردن لە عوسمانرضي الله عنه.

عەلیشرضي الله عنه لە مەدینەدا بوو، عوسمانی کوڕی حونەیفی کردبوو بە والی بەسرە.

هەرکە گەیشتن عوسمانی کوڕی حونەیف نێردراوی نارد تا بزانێ: بۆچی هاتوون و چیان دەوێ؟

وتیان: بکوژەکانی عوسمانمان دەوێ.

پێی ووتن: بوەستن تا عەلی دێ، و نەیهێشت بڕۆنە نێو بەسرەوە.

دوای ئەوە جەبەلە، کە یەکێکە لە بکوژەکانی عوسمان، بە حەوت سەد کەسەوە هات بۆ شەڕکردن لەگەڵیاندا، ئەوەبوو توانیان سەربکەون بە سەریدا و زۆرێکیان لێ بکوژن، بەو هۆیەوە زۆرێك لە خەڵکی بەسرە هاتنە نێو ڕیزەکانی سوپای تەڵحە و زوبەیر و عائیشەوە خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

لەم کاتەدا عەلی هەواڵی ئەم شەڕ و کوشتارەی نێوان عوسمانی کوڕی حونەیف، کە والی عەلیە بەسەر بەسرەوە لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر و عائیشە پێگەیشت، بە دە هەزار سەربازەوە لە مەدینەوە بەرە و کوفە کەوتە ڕێ.

ئا لێرەدا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کەوا عەلی کوڕی ئەبو تالب دەرچووە بۆ ئەوان و ئەوان دەرنەچوون لە ئەم[1]، هەرگیزیش مەبەستی کوشتارکردنیان نەبووە لەگەڵ عەلی دا هەروەك هەندێك لایەن و ئەوانەی پێیان کاریگەرن تەسەوری دەکەن، خۆ ئەگەر مەبەستیشیان کوشتاری عەلی بوایە ڕاستەوخۆ دەڕۆیشتن بۆ مەدینە، نەك بۆ بەسرە.

**جا تەڵحە و زوبەیر و عائیشە و ئەوانەشی لەگەڵیاندا بوون، هەرگیز نە خیلافەتی عەلیان پوچەڵ کردۆتەوە، نە تانە و تەشەریان لێیداوە، نە بەخراپ باسیان کردووە، نە بەیعەتیان بە جگە لە عەلی داوە، نە بۆ کوشتاری وی دەرچوون بۆ بەسرە، ئەسڵەن ئەو لەو کاتەدا لە بەسرە نەبووە.**

---

(١) بڕوانە ل٢٢٨-٢٢٩ بۆ بینینی وتەیەکی شیخ الاسلام لەم بارەوە زۆر گرنگە. (وەرگێڕ)

جا هەر وەك ئەحنەفی کوڕی قەیس ئەڵێ: دوای گەمارۆدانی عوسمان گەیشتم بە تەڵحە و زوبەیر، وتم: ئەمر بە چی دەفەرموون، من بزانم دەکوژرێت؟ وتیان: خۆت بگەیەنە بە عەلی.

هەروەها ئەڵێ: دوای کوشتنی عوسمان لە مەککەدا گەیشتم بە عائیشە، وتم ئەمر بەچی ئەفەرمووی؟ وتی: خۆت بگەیەنە بە عەلی[(١)].

**ووتوویژ و دانوستانەکانی پێش شەڕەکە:**

عەلی، میقدادی کوڕی ئەسوەد و قەعقاعی کوڕی عەمری نارد لە بۆ گفتۆگۆکردن لەگەڵ تەڵحە و زوبەیردا، ئەوەبوو هەردولا لەسەر شەڕنەکردن ڕیککەوتن و هەرلایە و دید و بۆچوونی خۆی لەمەڕ مەسەلەکە ڕوون کردەوە.

تەڵحەو زوبەیر وایان دەبینی کە نابێت دەست بەرداری بکوژەکانی عوسمان بن، بەڵام عەلی وای دەبینی کە بەرژەوندی لەوەدا نییە ئێستا دوای بکوژەکانی عوسمان بکەوێت، بەڵکو هەتا بارودۆخەکە هێور دەبێتەوە ئینجا، جا کوشتنی بکوژەکانی عوسمان هەمووی کۆك بوو، جیاوازیەکە لەوەبوو کەی ئەمانە بکوژرێن؟ دوای ڕێککەوتنەکە هەردوو سوپاکە لە خۆشترین شەودا بەخۆشی سەریان نایەوە، بەڵام سەبەئیەکان(کە بکوژەکانی عوسمانن)لە ناخۆشترین شەودا بەیانیان کردەوە، چونکە هەردوولا لەسەر ئەمان ڕێککەوتبوون، ئەو مێژوونوسانەشی کە باسی ئەم شەڕەیان کردووە ئاماژەیان بۆ ئەمە کردووە، وەکو تەبەری[(٢)] و ئیبن کەسیر[(٣)] و ئیبن ئەسیر[(١)] و ئیبن حەزم[(٢)] و..هتد.

(١) (فتح الباري) (٣٨/١٣). وقال: (أخرجه الطبري باسناد صحيح).

(٢) (تاريخ الطبري) (٥١٧/٣).

(٣) (البداية والنهاية) (٢٥٠٩/٧).

ئیتر سەبەئیەکانیش کۆڕابوون لەسەر تێکدانی ئەم ڕێکەوتنناماییە، ئەوەبوو بەیانی پێش مەلابانگدان، هەمووی خەوتبوو، کۆمەڵێك لەسەبەئیەکان هێرشیان کردە سەر سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر و چەند سەربازێکیان لێ کوشتن و ڕایان کرد.

سوپاکەی تەڵحە وا تێگەیشتن کە سوپاکەی عەلی خیانەتیان کردووە، بۆیە چەند سەربازێکی ئەمانیش بەو بەرە بەیانە هەڵیان کوتایە سەر سوپاکەی عەلی ﷺ، ئیتر سوپاکەی عەلیش وا تێکەیشتن سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر خیانەتیان کردووە، ئا بەو شێوەیە وردە شەڕ هەر بەردەوام بوو تا بە تەواوەتی لە نیوەڕۆدا شەڕ هەڵگیرسا.

## هەوڵەکان بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە:

سەرکردەی سوپای هەردوولا هەوڵی ڕاگرتنی شەڕیاندا، بەڵام بێ سود بوو، تەڵحە هاواری دەکرد: ئەی خەڵکینە واز بێنن! بەڵام کەس گوێی بۆ نەدەگرت، تا وای لێهات وتی: ئاخ ... ئاخ، پەپولەی ئاگر و مێشولەی تەماع[٣].

هەروەها عەلیش بەهەمان شێوە ڕێگری لێدەکردن، بەڵام کەس وەڵامی نەئەدایەوە، هەروەها عائیشە لە ڕێگەی کەعبی کوڕی سەورەوە قورئانێکی نارد بەڵکو شەڕەکە ڕابگرێت، بەڵام سەبەئیەکان تیربارانیان کردو هەر لەوێ کوشتیان.

شەڕ هەر وایە -پەنا بەخوا- هەرکە هەڵگیرسا، ئیتر کەس ناتوانێ بیکوژێنێتەوە.

---

(١) (الكامل في التاريخ) (٣/١٢٠).
(٢) (الفصل في الملل و الأهواء والنحل) (٤/٢٩٣).
(٣) (تاريخ خليفة بن خياط) (١٨٢).

ئیمامی بوخاری چەند دێڕە شیعرێکی ئیمرؤئو قەیس (امْرؤ قَیْس) دەهێنێتەوە کە دەڵێ:

الحَرْبُ أَوَّلُ مَا تَكُونُ فَتِيَّةً تَسْعَى بِزِينَتِهَا لِكُلِّ جَهُولِ
حَتَّى إِذَا اشْتَعَلَتْ وَشَبَّ ضِرَامُهَا وَلَّتْ عَجُوزًا غَيْرَ ذَاتِ حَلِيلِ
شَمْطَاءَ يُنْكَرُ لَوْنُهَا وَتَغَيَّرَتْ مَكْرُوهَةً لِلشَّمِّ وَالتَّقْبِيلِ

جەنگ سەرەتاکەی وەك کیژۆڵەی جوان دوای خۆی دەخا چی گەمژە و نەزان
هەر کە گڕی سەند و هاتە بڵێسەدان دەبێتە پیرەژنێکی بێ فەڕ و ڕەزا گران
سەرسپی وناشیرین وقیزەون ناشێ؛ نەبۆ بۆنکردن ونەبۆ ماچکردن[1]

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە: دەڵێ: فیتنە و ئاشوب و بەلا هەر کە هەڵگیرسا خەڵکانی ژێر گیر دێن بە دەست گەمژە و نەزانەکانەوە، هەر بۆیە ئەو پیاوە بەڕێزانەي نەیانتوانی ئەو فیتنەیە خامۆش بکەنەوە، عادەتی فیتنەش هەر وابوە، وەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ {الانفال: ٢٥}. واتە: (خۆتان بپارێزن لە فیتنە (ئاشوب و بەلا)یەك کە بە تەنها تووشی ستەمکارانتان نابێت، هەمووتان دەگرێتەوە، بشزانن کە بە ڕاستی تۆڵەو سزای خوا زۆر سەختە)[2].

(١) «صَحِيح البُخَارِيِّ»، كِتَاب الفِتْنَة، بَاب الفِتْنَة الَّتِي تموج كموج البحر، قبيل الحَدِيث (٧٠٩٦).

(٢) (مختصر منهاج السنة) (٢٨١).

ڕووداوی (جەمەل) لـە سـاڵی سـی و شەشـی كۆچـی ڕویـدا، كـە دەكاتـە: سـەرەتای خیلافـەتی عـەلی ﷺ، لـە دوای نیـوەڕۆ دەسـتی پێكـرد و پـێش خۆرئاوابوونی هەمان ڕۆژ كۆتایی پێهات.

كۆمەڵەكەی عەلی ﷺ دە هەزار كەس بوون، بـەڵام ئـەهلی جەمـەل پێـنج شەش هەزارێك دەبوون، ئاڵاكەی سوپاكەی عەلی لەگەڵ موحەممەدی كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تالبدا بوو، ئاڵاكەی ئەهلی جەمەل لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی زوبـەیردا بوو.

لەم ڕۆژەدا موسڵمانێكی زۆر كوژران، فیتنەیەك خوای گەورە شمشێرەكانمانی لێی بێوەی كرد، بۆ ئەوانیش داوای ڕەزامەندی ولێخۆشبون لە خوا ئەكەین.

## كوشتنی تەڵحە و زوبەیر:

تەڵحە و زوبەیر و موحەممەدی كوڕی تەڵحـە كـوژران، زوبـەیر لـەم جەنگـە بەشداری نەكرد و تەڵحەش هەروەها، لەبەر ئەوەی ئەگێڕنەوە كەوا زوبەیر دەگات بە عەلی، عەلی پێی دەڵێ: لە بیرت دێ پەیامبەرﷺ فەرمووی: شەڕی لەگەڵـدا دەكەیت و تۆ ستەمیی لێدەكەی، بۆیە زوبەیر پاشگەز بوویەوە و شەڕی نـەكرد و هەر لەو ڕۆژەشدا گەڕایەوە(١). بۆیە ڕاستیەكەی ئەوەیە شەڕی نـەكردبێت، بـەڵام ئایا ئەم گفتوگۆیە لە نێوان خۆیی و عەلی دا رویداوە؟

ئەمە خوا ئەزانێ، لەبەر ئەوەی ڕیوایەتەكە سەنەدێكی بەهێزی نییە، بـەڵام لە كتێبە مێژوییەكاندا بەناوبانگە.

---

(١) (المصنف) لابن أبي شيبة(١٥/٢٨٣ رقم ١٩٦٧٤). وفيه رجل مجهول، وذكره الحافظ ابن حجر في (المطالب العالية) (٤٤١٢).

لەمەش مەشهورتر ئەوەیە کە زوبەیر بەشداری ئـەم شـەڕەی نـەکردووە، بـە غەدر کوژراوە، بەدەست پیاوێکەوە پێی دەگوترا ئیبن جرموز.

* بەڵام تەڵحە، لەو کاتەی کە سەرقاڵی سارد کردنـەوەی خـەڵکی بـوو لـە شەڕکردن، بە تیرێکی وێڵ (بێ مەبەست) کوژرا، بەڵام ئەوەی مەشهورە تیرێکـی مەڕوانی کوڕی حەکەم بەری کەوتووە و داویەتی لە زامێکـی کـۆن لـە قاچـی و بووەتە هۆی مردنی.

شەڕ کۆتایی هات و خەڵکێکی زۆر کوژران، بە تایبەت لە بـەرگریکردن لـە وشترەکەی عائیشە، چونکە ئەو وەکو ڕەمزێك بوو بـۆ ئـەوان، بـەو هۆیـەوە لـە پێناویدا خۆیان دەدا کوشت. بۆیە هەرکە وشـترەکەی دای بـە زەویـدا ڕاسـتەخۆ جەنگەکە وەستایەوە و بەسەرکەوتنی عەلی کوڕی ئەبو تالبؓ کۆتایی پێهات. ئەگەر چی ڕاستتر وایە بڵێی کەس سەرنەکەوت، بەڵکو ئیسلام و موسڵمانان لـەم شەڕەدا خەسارۆمەند بوون.

## دوای شەڕەکە:

کە شـەڕەکە کۆتـایی پێهـات عـەلیؓ بـەنێو کوژراوەکانـدا دەڕۆیشـت، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵای بینی، هەڵیسانەوە و داینا و ئـەو خۆڵـەی بـە دەم و چاویەوە بوو سڕی و پاشان وتی: پێم گرانە، لەژێر ئەم ئاسمانە ئـا بـەم شـێوە بـە ڕاکشاوی دەت بینم ئەی ئەبو موحەممەد. پاشـان دەسـتی کـرد بـەگریان ووتـی: خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستا بمردایەم[1].

---

(١) (تاريخ دمشق) لابن عساكر -المختصر-(٢٠٧/١١)، (أسد الغابة) (٨٨/٣)، وقال البوصيري: (رجاله ثقات)، نقله عنه الحافظ ابن حجر في (المطالب العالية) (٢٠٢/٤) مع اختلاف يسير في ألفاظه.

* هەروەها کاتێك عەلی ﷛ موحەممەدی کوری تەڵحەی بینی دیسانەوە دەستی کرد بە گریان، جا ئەم موحەممەدی کوڕی تەڵحەیە ناوی لێنرابوو (سجاد) (زۆر سوژدە بەر)، بەهۆی زۆری عیبادەت کردنیەوە.

هەر هەموو ئەو هاوەڵانەی لەم شەڕەدا بەشداریان کرد، بە بێ هەڵاوێر، لەوەی کە ڕویدا پەشیمان بوونەوە.

ئەو جرموزەش هاتە لای عەلی و شمشێرەکەی زوبەیری پێبوو وتی: زوبەیرم کوشت، زوبەیرم کوشت، هەرکە عەلی ﷛ گوێی لەمە بوو وتی: بەڕاستی ئەم شمشێرە تەنگی و ناخۆشی زۆری لەسەر پەیامبەر ﷺ لابردوە، پاشان وتی: مژدەی ئاگر بدە بە بکوژەکەی ئیبن صەفییە[1]، ڕێگەشی نەدا بێتە ژورە بۆلای[2]، کە شەڕەکەش کۆتایی پێهات، عەلی ﷛ هەستا و بەو پەڕی ڕێز و شکۆوە عائیشەی دایکی ئیماندارانی ﵂ ناردەوە بۆ مەدینەی پەیامبەر ﷺ، بەو شێوەیەی پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێکردبوو.

لە عەلیەوە ﷛ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: (لە نێوان تۆ و عائیشەدا شتێ ڕوئەدات) عەلی وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ ئەمن سەر شۆڕیان دەکەم؟ ئەویش فەرمووی: (نەخێر، بەڵام گەر هاتوو شتێکی وا ڕوویدا

---

(١) صەفیە دایکی زوبەیری کوڕی عەوامە وکچی عەبدولموتەلبە وپوری پەیامبەری خوایە ﷺ. (وەرگێڕ).

(٢) (طبقات ابن سعد) (٣/١٠٥) بسند حسن.

ئەوا بیگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەی خۆی[1]، ئەویش هەستا بەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردبوو.

## بۆچی عەلی بکوژەکانی عوسمانی نەکوشت؟

عەلی بە چاوی (مەسڵەحە و مەفسەدەوە) دەیڕوانیە مەسەلەکە، ئەو دەیگوت بەرژەوەندی لەوەدایە تۆڵەسەندنەوەکە دوابخرێت، نەك وازی لێهێنرێت، لەبەر ئەمە تۆڵەسەندنەوەکەی دواخست، هەروکو چۆن پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕوداوی (إفك)[2]دا ئەمەی کرد، کاتێك کە هەندێك خەڵك قسەیان لەسەر عائیشە کرد و بوهتانیان بۆکرد.

* لە ناودارترینی ئەوانەی قسەیان لەسەر عائیشە کرد: حەسسانی کوڕی سابت، حەمنەی کچی جەحش، میستەحی کوڕی ئوپاپە، سەرئاشۆینەکەشی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو [تا ئەوەبوو ئایەت لەبارەی مەسەلەکەوە دابەزی و بەڕائەتی دایکی ئیماندارانی ڕاگەیاند]، پەیامبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە سەر مینبەر و فەرمووی کێ عوزرم بۆ دێنێتەوە [ئەگەر هەستم بە کوشتنی کەسێك لەسەر ئەو خراپیەی لێی وەشاوەتەوە] کە تینی خراپە و ئازاری گەیشتۆتە خێزانەکەم -مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە-،

---

(١) أخرجه أحمد في ( المسند)(٦/٢٩٢)، قال الحافظ في(الفتح) سنده حسن (١٣/٦٠).

(٢) افك واتە: درۆ هەڵبەستن، شتێك کە ئەسڵی نەبێ، ئەم ڕوداوە بەوە دەگوترێ کە هەندێك لە مونافیقەکان بوهتانیان بۆ دایکە عائیشە کرد ، کە داوێن پیسی کردوە، بەڵام دوای ماوەیەك خوای گەورە ڕوی ڕەش کردن و زیاد لە دە ئایەتی لەسەر داوێن پاکی دایکی ئیمانداران دابەزاندە خوارەوە، ئەوەی ئەیەوێ زیاتر بزانێ ڕوادوەکە چۆن بووە و چۆن ڕویداوە؟ با بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی باسیان لێوە کردووە وەکو صحیحی بوخاری و...هتد. (وەرگێڕ)

سەعدی كوڕی موعاز[(١)] هەستا و وتی: من ئـەی پەیامبـەری خـوا ﷺ سـەرت دەخەم و عوزرت بۆ دێنمەوە.

خـۆ ئەگـەر لـە ئێمـەی (ئەوسـە) ئـەوا دەیكـوژین، ئەگـەریش لـەبرا خەزرەخیەكانمانە و فەرمان دەفەرموی هەر دەیكوژین !

كەچی سەعدی كوڕی عوبادە هەسـتاو وەڵامـی سـەعدی كـوڕی موعـازی دایەوە، ئوسەیدی كوڕی حودەیریش هەستا و وەڵامی سـەعدی كـوڕی عوبـادەی دایەوە، پەیامبەری خواش ﷺ هەر بێ دەنگی دەكردن[(٢)].

ئیتر كە زانی مەسەلەكە لەوە گەورە ترە -چونكە پێش هـاتنی پەیامبـەری خوا ﷺ بۆ مەدینە، ئەوس و خەزرەج ڕێككەوتن لەسەر ئەوەی ئـەم عەبـدوڵڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلولە گەورە و دەم سپیان بێ، بۆیە پایەیەكی بەرزی هـەبوو لە لایان، خۆ هەر ئەم بوو سێ یەكی سـوپاكەی لـە جـەنگی بـەدردا گەڕانـەوە، دەبـینی پەیامبـەری خـوا ﷺ لێـرەدا- دەسـت بـەرداری قامچـی لێدانەكـەی عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی سەلول دەبێت، لەبەرچی؟! لـە بـۆ بەرژەوەنـدی، چـونكە قامچـی لێدانەكـەی مەفسـەدە و خراپـەی زۆرتـری لێدەكەوتـەوە وەك لـە وازلێهێنانەكەی.

---

(١) ڕاستتر یان نزیكتر لە ڕاست ئەوەیە بڵێین: ئەم دەمەقاڵێیە لە نێوان سەعدی كوڕی عوبادە و ئوسەیدی كوڕی حودەیردا بووە، چونكە سەعدی كوڕی موعاز لە شـەڕی بـەنی قـورەیزە وەفـاتی كردوە، چیرۆكی ئیفكیس لە غەزای «مورەیسیع - بەنی موستەلیق» دا بووە، كـە دەكەوێتـە دوای بەنی قورەیزەوە.. بۆیـەش وتم: نـزیكتر لـە ڕاسـت؟ لەبـەر بـوونی جیـاوازی ڕا لەسـەر مێـژووی ڕووداوەكانی ئەحزاب و قورەیزە و بەنی موستەلیق.. بۆ زیاتر بڕوانە فتح الباری (وەرگێڕ)

(٢) متفق علیه: (صحیح البخاري) كتاب المغازي، باب حدیث الإفك، رقم الحدیث (٤١٤١)، (صحیح مسلم) كتاب التوبة، باب حدیث الافك وقبول التوبة القاذف (٢٧٧٠).

بە هەمان شێوە عەلیش ﷺ وای دەبینی کە دواخستنی تۆڵەسەندنەوەی عوسمان، مەفسەدەی کەمترە وەك لە پەلەلێکردنی، ئاخر ئەسڵەن عەلی نەیدەتوانی بکوژەکانی عوسمان بکوژێت ! چونکە ئەوان دانە دانە ناسراو نەبوون، ئەگەریش سەرکردەکانیان دیارن ئەوانیش هۆز و عەشیرەتیان هەیە، بەرگری لێ دەکردن، سەرباری ئەوەش جاریٚ فیتنە و ئاشوب هەر بەردەوامە و هێشتا ئەمن و ئاسایش بەرقەرار نەبووە، کێ ئەڵێ عەلیش ﷺ ناکوژن ؟! هەرواش بوو دوای ئەوە کوشتیشیان.

* بۆیە کاتێك خیلافەت گەیشت بە موعاویە، بەهەمان شێوە بکوژەکانی عوسمانی نەکوشت ؟! بۆ ؟ چونکە ڕەئی وەکو ڕەئی عەلی لێهات، عەلی ئەمەی بە واقع دەبینی، موعاویە بە نەزەری، بەڵام کە خیلافەتی گرتە دەست بە واقیعی و عەمەلی بینی. ڕاستە موعاویە هەندێکیانی کوشت، بەڵام باقیەکەیان هەر مانەوە هەتا سەردەمی حەجاج لە خیلافەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا، ئەو هەموویانی کوشت و کەسیانی نەهێشتەوە.

ئەوەی گرنگە، عەلی نەیدەتوانی بیان کوژێ، نەك دەسەڵاتی نەبووبێ، بەڵکو لەبەر خاتری ئوممەت ئەمەی نەکرد.

## جەنگی صیففین[1] ساڵی ٣٧ ك:

موعاویە بەیعەتی بە عەلی نەدەدا هەتا تۆڵەی عوسمان نەکرێتەوە، جا کاتێك عەلی ﷺ لە جەنگی جەمەل بوویەوە، وتی: ئێستا پێویستە موعاویە بەیعەت بدات، سوپای لەبۆ شەڕ ئامادەکرد، یان ئەوەتا بەیعەت بدات، ئەوەبوو

(١) صفین نزیکی (الرقە) یە، تەنیشت ڕوباری فورات، ئێستا دەکەوێتە سوریاوە.

عەلی بە سەد هەزار سەربازەوە لە شامەوە بەرە و صفین بەڕێکەوت. کە موعاویە بیستی عەلی بەڕێوەوەیە بۆ شەڕکردن لەگەڵی، سەرکەوتە سەر مینبەر و وتی: وا عەلی لە عێراقەوە سوپای کۆکردۆتەوە و بەڕێوەیە بۆ شەڕ لەگەڵتان، چی ئەڵێن؟ هەمویان چەناکەیان نا بە سنگی خۆیانەو[1]، زولکیلاعی حیم یەری هەستا و وتی: لە تۆ بڕیار و لە ئێمە کردار، خەڵکیش هەموو بێ دەنگن.

عەلی یش ﷺ سەرکەوتە سەر مینبەر و دوای ئەوەی سوپاس و ستایشی خوای کرد وتی: وا موعاویە لە شامەوە سوپای کۆکردۆتەوە و خۆی بۆ قایم کردوین، چی ئەڵێن؟ ئەوەبوو قاڵە قاڵ دەستی پێکرد و دەنگیان بەرز بویەوە، دەیانووت: ئەی ئەمیری ئیمانداران: وابکە... ئەوە بکە، جا بە هۆی قاڵە قاڵەکەیانەوە، عەلی هیچی لێ حاڵێ نەبوون، ئیتر بوو بە ژاوە ژاوە و هەراو هور، پاشان عەلی ﷺ دابەزی و دەیووت: إنا لله وإنا إليه راجعون[2].

ئەوە حاڵ خەڵکی شامە و ئەوەش حاڵ خەڵکی عێراق، خەڵکی شام هەروا گوێڕایەڵ و بە ئارام و تاقەت بوون، خەڵکی عێراقیش هەر خەریك فەوزا و ئاژاوەنانەوە بوون هەروەك باسی لێوە دەکەین، هەر ئەوانیش بوون دواجار لەگەڵ عەلی دا ﷺ بە جەنگ هاتن و کوشتیان. ئەوەبوو عەلی ﷺ لە مانگی سەفەری ساڵی سی و حەوتی کۆچی گەیشتە صیففین.

جا ئەم شەڕانەی عەلی ﷺ هەم جەمەل و هەم ئەوەی صیففینیش بە ڕەئی و ئیجتهادی خۆی کردونی. ئەوەتا ئەبو داود لە سونەنەکەی خۆیدا لە قەیسی کوڕی عوبادەوە ڕیوایەت دەکا، ئەڵێ بە عەلیم ﷺ ووت: باسی ئەو بەسەر

(١) یانی خەڵك سەریان داخست و کەس سەری بەرز نەکردەوە.

(٢) «تَارِيخ الإِسْلَام» (ص ٥٤٠) عهد الخُلَفَاء الرَّاشِدين.

هاتانەی خۆتمان بۆ بکە ئایا پەیامبەری خوا ﷺ ڕایسپاردبووی یان ڕا و بۆچوونی خۆت بوون؟

وتی: پەیامبەری خوا ﷺ هیچی پێ ڕانەسپاردوم، هەمووی ڕا و بۆچوونی خۆم بوون[١].

## ئایا موعاویە شەڕی کورسی بوو؟[٢]

لە ئەبو موسلیمی خوەلانیەوە، کەوا ڕۆیشتۆتە لای موعاویە و پێی ووتوە: تۆ ڕکەبەرایەتی لەگەڵ عەلی دا دەکەی، تۆ خۆت ئەکەیتە هاوشانی عەلی؟

موعاویە وتی: نە بەخوا، ئەمن باش دەزانم کە عەلی باشترە و شایستەترە بۆ ئەو کارە، بەڵام ئێوە نازانن عوسمان بە مەزلۆمی کوژرا؟! منیش کوڕی مامیم، داوای خوێنەکەی ئەکەم، بڕۆن بۆلای عەلی و پێی بڵێن: با بکوژەکانی عوسمانم تەسلیم بکات، ئەوە منیش هەموو شتێکی تەسلیم ئەکەم، ئەوەبو ڕۆیشتنە خزمەت عەلی و قسەیان لەگەڵدا کرد، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو بکوژەکان تەسلیم بکات[٣].

جا موعاویە هەرگیز نەیگوتووە من خەلیفەم، مشت و مڕیشی لەگەڵ عەلی دا هەرگیز لەسەر خیلافەت نەبووە، بۆیەش کاتێك ناکۆك کەوتن -وەك دواجار باسی لێوە ئەکەین- و مەسەلەی تحکیم هاتە پێشەوە، نووسی: ئەمە ئەو

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبو داود فِي كِتَاب السّنة بَاب مَا يَدُلُّ عَلَى ترك الكَلَام فِي الفِتْنَة ح ٤٦٦٦. [وصححه الألباني]

(٢) عەرەبیەکەی: هل نازع معاوية على الخلافة؟ بەڵام ئەو تەعبیرەم پێ واقیعی تر و شیاو تر بوو، چونکە زۆرێك ئەمڕۆ ئەم دەستەواژەیە بۆ هۆکاری ئەو شەڕانە بەکار دێنن. (وەرگێڕ).

(٣) (تاريخ الاسلام) (ص ٥٤٠) عهد الخلفاء الراشدين، وسنده صحيح.

نوسراوەیە کە عەلی ئەمیری ئیمانداران پەیمانی لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان وەرگرتووە لەسەری، موعاویە وتی: مەنوسە ئەمیری ئیمانداران، ئەگەر بەیعەتم پێتبدایە لەسەر ئەوەی کە ئەمیری ئیماندارانی لەگەڵت نەدەجەنگام، بە تەنها ناوی خۆم و خۆت بنوسە، پاشان بەری کرد بەلای نووسەرەکە و پێی ووت: ناوی ئەو لە پێشدا بنوسە، بەهۆی فەزڵی و پێشەنگیی لە ئیسلامدا[1].

هەرگیز شەڕی نێوان عەلی و موعاویە شەڕی نێوان خەلیفەیەك و خەلیفەیەکی تر نەبووە، بەڵکو هۆکاری شەڕەکە ئەوەبووە؛ عەلی ﷺ دەیویست موعاویە لابدات، موعاویەش ئەوەی قبوڵ نەدەکرد تا بکوژەکانی کوڕەکەی مامی نەکوژرێن، یان تەسلیمی خودی موعاویە بکرێن، مەسەلەکە خیلافەت نەبووە هەروەك بڵاوە.

ژمارەی سوپاکەی عەلی سەد هەزار و ژمارەی سوپاکەی موعاویە حەفتا هەزار دەبوو، لەم شەڕەدا لە نێو سوپاکەی عەلی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا، پەیامبەری خواش ﷺ بە عەمماری فەرمووە: «یا عمار ستقتلك الفئة الباغیة»، واتە: (ئەی عەممار کۆمەڵە ستەمکارەکە دەتکوژن)[2].

بۆ ئەو مەبەستە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان پرسی: فەرمودەی «ستقتلك الفئة الباغیة» [چی ئەڵێی لە بارەیەوە]؟ وتی: هیچی لەبارەوە ناڵێم هیچ نەووتن

---

(١) (البداية والنهاية) (٧/٢٨٨).

(٢) (متفق عليه)صحيح البخاري،كتاب الصلاة - باب التعاون في بناء المسجد، حديث (٤٤٧)، (صحيح مسلم) كتاب الفتنة، باب لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل..، حديث (٢٩١٥).

بێوەی ترە، ئەوە ئەڵێم کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵە یاخی بووەکە کوشتویانە، ئیتر بێدەنگ بوو[١].

## هەق لەگەڵ کێدا بوو؟

ئیبن حەجەر ئەڵێ: جمهوری زانایانی ئەهلی سوننەت، ئەڵێن ئەوانەی لەگەڵ عەلی دا جەنگاون هەق و صەواب بوون و لە فەرمودەی صەحیحدا چەسپاوە ئەوانەی لە دژی عەلی جەنگاون یاخی بوون، لەگەڵ ئەم هەق پێدانەشدا بەڵام لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کەوا کەس لەوانە سەرزەنشت ناکرێن، بەڵکو ئەڵێن: ئیجتهادیان کردووە و نەیان پێکاوە[٢].

هەروەها ئەڵێ: (ئەهلی سوننە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە نابێت تانە لە یەك هاوەڵ بدرێ، لەسەر ئەوەی کە لێیان وەشاوەتەوە، ئەگەرچی و با لایەنە هەقەکەشیان بناسرێتەوە، چونکە ئەوان شەڕیان نەکردووە مەگەر بە ئیجتهاد نەبێ [واتە بۆ خۆشی و لەبەر هەوا و ئارەزوو شەڕیان نەکردووە هەروەك زۆرێك لە چەواشەکارەکان تەسەوری دەکەن ][٣].

هەروەها تەبەری: لە بارەی بەهیزکردنی ڕێبازی سەرخەرانی عەلی دا ﷺ ئەڵێ: ئەگەر لەکاتی ڕودانی هەر جیاوازی و ناکۆکیەك لە نێوان موسوڵماناندا، واجب وابوایە کە لێی ڕابکرێت و هەرکەسە و بتەپێتە ماڵی خۆیەوە، ئەوا نە سنورەکانی خوا جێبەجێ دەکرا و نەخراپە بە خراپە دادەنرا،

---

(١) (السنة) للخلال ص ٤٦٣ رقم ٧٢٢.
(٢) (فتح الباري) (٧٢/١٣).
(٣) (فتح الباري) (٢٧/١٣).

هەروەها خراپەكارەكان ڕێگەیان بۆ والآ دەبوو بەوەی هەر حەرامێك دەیانەوێ ئەنجامی بدەن[(١)].

منیش ئەڵێم: بەڵێ ئەم قسەیە ڕاستە ئەگەر مەسەلەكە ڕوون بێت، بەلاّم ئەگەر هاتوو مەسەلەكان ئالۆز و ناڕوون بوون، ئەوا دوور كەوتنەوە پێویستە، هەربۆیە دەبینی زۆرێك بەشداری لەم شەڕەدا ناكەن.

كەواتە شتێك كە دەبێت قەناعەتمان پێی هەبێ، ئەوەیە: تەڵحەو زوبەیرو عائیشە و شوێنكەوتوانیان، هەروەها عەلی و شوێنكەوتوانی، بە ئیجتهاد شەڕیان كردووە، مەسەلەكە ئاشوب و بەلاّ بووە، بەتایبەت جەنگی جەمەل، خۆی ئامادەكراو نەبوو و مەبەستیشیان شەڕ نەبوو، ئیبن تەیمیە و ئیبن حەزمیش ئەڵێن: جمهوری زانایان بێ دەنگی زمان گرتن لەم مەسەلەیەدا بەباش دەزانن.

ئیبن تەیمیە: ئەڵێ: ئەگەر كەسێكیش بڵێ: ئەی باشە خۆ عەلی یەكەم جار دەستی بە شەڕ كرد؟ ئەوا پێی ئەڵێین: خۆ یەكەمجاریش ئەوان بوون لەگوێڕایەڵی ئەو دەرچوون و بەیعەتەكیان شكاند و كردیان بە ستەمكار و بەشدار لە خوێنی عوسمان و شایەتی درۆشیان لەسەر قبوڵ كرد)[(٢)].

ئەڵێم: چونكە لای خەڵكی شام دەنگوباس وابوو كە عەلی بە كوشتنی عوسمان ڕازی بووە.

ئەمەش لەبەر چوارشت لە لای خەڵكی شام ڕەواجی پەیدا كرد:

١. نەكوشتنی بكوژەكانی عوسمان.

---

(١) (فتح الباري) (١٣/٢٧).
(٢) (منهاج السنة) (٤/٤١٠).

٢. جەنگی جەمەل.

٣. بەجێهێشتنی مەدینە و نیشتەجێبوونی لە کوفە، کە سەنگەر و حەشارگەی بکوژەکانی عوسمان بوو.

٤. لە ناو سوپاکەی عەلی دا خەڵکانێك هەبوون تۆمەتباربوون بەوەی دەستیان لە خوێنی عوسماندا هەیە.

لەبەر ئەم چوار شتە خەڵکی شام کەوتنە گومانەوە (لەلای نەزانەکانیان)، کە عەلی دەستی هەیە لە کوشتنی عوسماندا ﷺ خۆی لە ڕاستیدا هەرگیز دەستی عەلی تێدا نەبووە، تەنانەت عەلی نەفرەتی لە بکوژەکانی عوسمان دەکرد، جا ئەگەر یەکێك وتی: خۆ ئەمەش بە تەنها ئەو کوشتارەی ئەو لەگەڵیاندا کردی حەڵاڵ ناکات؟ ئەوا پێی دەڵێین: بەڵکو بۆ ئەوان حەڵاڵ نەبوو لەگەڵ عەلی ﷺ بجەنگن، چونکە ئەو توانای کوشتنی بکوژەکانی عوسمانی نەبوو، بەڵکو ئەگەر توانای ئەوەشی هەبوویا و نەیکردبێ" بە تەئویل یان بە تاوانباری بێ، هەر نەدەبووە پاساو بۆ پەرتەوازە کردنی کۆمەڵی موسوڵمانان و بەیعەت پێ نەدانی، بەڵکو هەرچۆنێك بوایە بەیعەت پێدانی عەلی بۆ ئیسلام و موسوڵمانان چاکتر بوو بە سودتریش بوو[(١)].

## ئەو هاوەڵانەی بەشداری ئەم شەڕانەیان کرد؟

ئەو هاوەڵانەی بەشداری شەڕی (جەمەل) و (صیففین) یان کرد ئەمانەن: عەلی، زوبەیر، تەڵحە، عائیشە، کوڕی زوبەیر، حەسەن، حوسەین، عەممار، ئیبن عەبباس، موعاویە، عەمری کوڕی عاص، قەیسی کوڕی سەعد، قەعقاعی کوڕی عەمر، جەریری کوڕی عەبدوڵلا، خوزەیمەی کوڕی سابت، ئەبو قەتادە، ئەبو

(١) منهاج السنة ٤/٤١١.

هەیسەمی کوڕی تەییهان، سەهلی کوڕی سەعد، جابری کوڕی عەبدوڵلا، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر، عەدی کوڕی حاتەم، ئەشعەسی کوڕی قەیس، جاریەی کوڕی قودامە، فوزاڵەی کوڕی عوبەید، نوعمانی کوڕی بەشیر.

ئەوانەشی خۆیان گرتەوە و بەشداریان نەکرد ئەمانەن: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، سەعیدی کوڕی زەید، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، ئوسامەی کوڕی زەید، ئەبو هورەیرە، زەیدی کوڕی سابت، عومرانی کوڕی حوصەین، ئەنەسی کوڕی مالك، ئەبی بەکرەی سەقەفی، ئەحنەفی کوڕی قەیس، ئەبو ئەیوبی ئەنساری، ئەبو موسای ئەشعەری، ئەبو مەسعودی ئەنساری، وەلیدی کوڕی عوقبە، سەعیدی کوڕی عاص، عەبدوڵڵای کوڕی عامر، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی، ئەهبانی کوڕی صەیفی، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، بەڵکو زۆربەی هاوەڵانێ.

## * چیرۆکی داوەریکردن (تحکیم)

جەنگی صفین بە داوەری (تحکیم) کۆتایی پێهات، یانی وازیان لەشەڕ هێنا بەهۆی ئەو قورئانانەی بەسەر ڕمەکانەوە بەرزکرایەوە، عەلی یش رضي الله عنه بە تەحکیم ڕازی بوو و گەڕایەوە بۆ کوفە، موعاویەش بۆ شام، لەسەر ئەوەی کە داوەری کردنەکە لە ڕەمەزاندا ئەنجام بدرێ، عەلی ئەبو موسای ئەشعەری نارد و موعاویەش عەمری کوڕی عاص.

بەڵام ئەو چیرۆکەی تەحکیمە کە مەشهورە ئەوەیە: عەمری کوڕی عاص لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری ڕێککەوت لەسەر لابردنی هەریەك لە عەلی و موعاویە، ئەبو موسای ئەشعەری سەرکەوتە سەر مینبەر و وتی: من عەلی لە خیلافەت لائەبەم هەروەك چۆن ئەم ئەنگوستیلەیە لە پەنجەم دائەکەنم، پاشان

ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەند، ئینجا عەمری کوڕی عاص هەستا و وتی: هەروەها منیش عەلی لە خیلافەت لائەبەم هەروەکو چۆن ئەبو موسا لایبرد وەکو داکەندنی ئەم ئەنگوستیلەیەی دەستم، هەروەها موعاویە دەهێڵمەوە و جێگیری دەکەم هەروەك چۆن ئەنگوستیلەکەم لە جێی گیر دەکەم. ئەوەبوو بوو بە قاڵە قاڵ و هەرا و هوریا، ئەبو موسا بە توڕەییەوە ڕۆیشتەوە دەرەوەو گەڕایەوە بۆ مەککە و ئیتر نەڕۆیشت بۆ کوفە بۆ لای عەلی، بەڵام عەمری کوڕی عاص گەڕایەوە شام[1].

**ئەم چیرۆکە ساختەیە و درۆیە، هۆکەشی ئەو ئەبو میخنەفەیە کە چەندین جارە باسی دەکەین، چیرۆکە ڕاستەقینەکە بەو شێوەیەیە کە لە ئەهلی هەق و ڕاستیەوە ڕیوایەتیان کردووە:** کەوا عەمری کوڕی عاص لەگەڵ ئەبو موسا بەیەك گەیەشتن و پێی ووت: لەمەڕ ئەم مەسەلەیە چی ئەڵێی؟ ئەبو موساش وتی: من ئەڵێم ئەو لەو کەسانەیە کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و لێیان ڕازی بووە[2]، عەمری کوڕی عاص وتی: ئەی من و موعاویە دەخەیتە کوێ؟ ئەبو موسای ئەشعەری وتی: ئەگەر کۆمەکی لێخواستن، ئەوە ئێوە کۆمەك

---

(١) « تَاريخ الطَّبَرِيِّ » (٥١/٤)، وَ« الكامل فِي التَّارِيخ » (١٦٨/٣).
وعَمْرو بْن العَاصِ: صحابي جليل هَاجَر طوعا لَا كرهًا فَلَمْ يَكُنْ فِي المُهَاجِرِينَ نفاق لعدم الحَاجَة إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا كَانَ النِّفَاق فِي أَهْل المَدِينَة وَذَلِكَ أن أشراف مَكَّة وكُبَرَاءهَا كَانُوا كفارا وكَانَ المؤمن يؤذى فأنى يتأتى النِّفَاق؟! وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «ابْنَا العَاصِ مؤمنان عَمْرٌو وَهِشَام» رَوَاه أَحْمَد (٣٠٤/٢).

(٢) مەبەستی عەلی کوڕی ئەبو تالبە ﷺ.

ڕەسیتان تێدایە، ئەگەریش بەکارتان نەهێنیٚ و پێویستی پێتان نەبیٚ، ئەوە کـاری خوا هەر بیٚ پێویست بووە بە ئێو[1].

ئیتر مەسەلەکە بەمە کۆتایی پێهات، بەم هەواڵەوە عـەمری کـوڕی عـاص گەڕایەوە بۆ لای موعاویە و ئەبو موساش بۆ لای عەلی.

جا ڕیوایەتی یەکەم گومانی تێدا نییە کە ساختەیە لەبەر سیٚ هۆ:

یەکەم: سەنەدەکەی چــەعیفە، ئەبو میخنەفی درۆزنی تێدایە.

دووەم: خەلیفەی موسوڵمانان، نە ئەبو موسای ئەشعەری و نە غەیرە ئەویش ناتوانن لاییبەن، چونکە لابردنی خەلیفە لە لای ئەهلی سوننە هەروا بەم ساناییە نییە.

ئاخر چۆن دەکریٚ دوو پیاو ڕێککەون لەسەر لابردنـی ئـەمیری ئیمانـداران؟ ئەمە قسەیەکی ڕاست نییە، بەڵکو ئەوەی لە (تەحکیم)دا ڕویدا ئەوەیە: هەردولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە عەلی لە کوفەدا بمێنێتەوە و خەلیفەی موسـوڵمانانە و موعاویەش بمێنێتەوە وەکو ئەمیرێك بەسەر شـامەوە، بـەڵام شـەڕ و کوشـتار بوەستێت.

سێیەم: ئەو ڕیوایەتە صەحیحەمان هەیە کە باسمان کرد.

---

(١) أنظر تفصيل قصة التحكيم في كتاب (مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري (وقد عـزاه إلى (التاريخ الكبير) (٥/ ٣٩٨). وأنظر (تاريخ دمشق) (٤٦/١٧٥ - ترجمة عمرو بن العاص رضي الله عنه.

### * جەنگی نەهرەوان ( ساڵی ٣٨ ك ):

عەلی ﷺ گەڕایەوە بۆ کوفە، ئەوەبوو خەوارج دەرچوون و ( تەحکیم ) یان پێ ڕەفز بوو و دەیانگووت: «لا حُکم إلا للە داوەری تەنها بۆ خودایە»، ئیتر دەستیان کرد بە ئاژاوەگێڕان بەسەر عەلی یەوە ﷺ، تەنانەت لەناو مزگەوتیشدا هەڵدەستان و دادەنیشتن دەیانگووت: لا حُکم إلا للە .. لا حکم إلا للە، بەڵام عەلی ﷺ وتی: ووتەیەکی ڕەوایە، بەڵام مەبەست پێی ناڕەوایە[1]

* دوای ئەوە هاوەڵی پایەبەرز عەبدوڵڵای کوڕی خەباب و خێزانەکەیان کوشت و سکیان هەڵدڕی -منداڵێکیش لە سکیدا بوو- لە مانگی خۆیدا بوو - لە مانگی نۆیەمیدا بوو-، کە هەواڵ گەیشتە عەلی نێردراوی نارد بۆلایان: کە بزانێ کێ کوشتنی؟ ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان: هەمووومان کوشتمان ! عەلیش ﷺ بە سوپایەکی دە هەزار نەفەرییەوە بۆ کوشتاری خەوارج بەرەو نەهرەوان کەوتە ڕێ.

لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عیازی کوڕی عەمری قاریەوە ئەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد هات بۆلای عائیشە و ئێمەش دانیشتبووین، لە عێراقەوە هاتبووەوە لەو شەوانەی عەلی ﷺ تێدا شەهیدکرابوو، عائیشە وتی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد، گەر پرسیارێکت لێبکەم بە ڕاستی وەڵامم ئەدەیتەوە؟ باسی ئەوانەم بۆبکەی کە عەلی کوشتنی؟

ئەویش وتی: جا بۆ درۆت لەگەڵ بکەم؟

---

(١) دوایی بوو بە پەند (مەسەل).

وتی: دەی کەواتە باسی بەسەرهاتی ئەوانەم بۆبکە.

وتــی: کاتێــك عــەلی لەگــەڵ موعاویــەدا نوســراوەکەیان نووســی و دوو داوەرەکەیان لە نێو خۆیاندا کرد بە دادوەر، هەشت هەزار لە قورئــان خوێنــەکانی نێو خەڵك خروجیان لێکـردو ڕۆیشــتنە ناوچـەیەکی نزیــك کوفــە، پێـی دەوتــرا (حروراء)، سەرزەنشتی عەلیان دەکرد و ئەیانووت: خۆت لە جل و ناوێك داماڵی کە خوا لەبەری کردبووی و لێی نـابووی، پاشـانیش ڕۆیشـتووی پیـاوت کردۆتـە دادوەر لە دینی خوادا، لە کاتێکدا داوەری تەنها بۆ خوایە.

ئەمە گەیشتە عەلی کەوا لەسەر چـی سەرزەشـتیان کـردەووە و لێـی جیـا بوونەتەوە، فەرمانی کرد بە بانگکـەرێك بـانگ بکـات: هــەر کـەس دێتــە لای ئەمیری ئیمانداران با قورئانێکی پیّ بێـت، دوای ئـەوەی ماڵەکـەی پـڕ بــوو لــە خەڵکی قورئان خوێن، داوای قورئانێکی کرد، بۆیان هێنا، لـە بەردەسـتی خـۆی داینا و دەستی لە قورئانەکە دەدا و دەیووت: ئـەی قورئانەکـە ! قسـە بکـە بــۆ خەڵکی!

خەڵکی بانگیان کرد و وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران داوای چی لیّ دەکەی؟ ئەوە تەنها حوبرێکە لەسەر کاغەز ! ئێمە قســە دەکــەین بــەوەی لێــوەی بۆمــان گێڕدراوەتەوە ! چیت ئەویّ بڵیّ؟

وتی: ئەوانەتان کە خروجیان لێکردم، با قورئانی خوا حەکەمی نێوان من و ئەوان بیّ، خوای پایە بەرز لە قورئاندا لە بارەی ژن و پیاوێکەوە ئەفەرمویّ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾ {النساء: ٣٥}. واتە: (خۆ ئەگەر ترسان لەوەی نێوان ژن و مێرد بشێوێت، ئەوا داوەرێك لە کەس و کاری پیاوەکە و داوەرێك لە کەس و کاری ژنەکە بنێرن بۆ ڕێکخستنیان، ئەگەر ڕێکخستنیان دەویّ ئەوا خوا

ڕێکخستن دەخاتە نێوان ژن و مێردەکەوە، بێ گومان خوا هەمیشە زانای ئاگادارە).

ئەی خۆ ئوممەتی موحەممەد ﷺ خوێنی مەزنتر و بە حورمەتترە لە ژن و پیاوێك، ڕەخنەی ئەوەم لێدەگرن لە نوسراوەکەی نێوان خۆم و موعاویەدا نوسیومە: (عەلی کوڕی ئەبو تالب نووسی)[1]، لە حودەیبییەدا خزمەتی پەیامبەری خوا بووین ﷺ، سوهەیلی کوڕی عەمر هات بۆلامان، کاتێك صوڵحی لەگەڵ قورەیشدا کرد، پەیامبەری خوا ﷺ نووسی: (بسم الله الرحمن الرحیم) سوهەیل وتی: مەنووسە (بسم الله الرحمن الرحیم)، ئەویش فەرمووی: ئەی چی بنوسین؟ وتی: بنوسە: (باسمك اللهم)، پاشان پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: بنووسە (محمد رسول الله).

وتی: ئەگەر بمزانیایە تۆ پەیامبەری خوای دوژمنایەتیم نە دەکردی. بۆیە نووسی: «هذا ما صالح محمد بن عبدالله قریشا»، واتە: (ئەمە ئەو نوسراوەیە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا لەگەڵ قەرەیشدا صولحی لەسەر کردووە)، خودای پەروەردگاریش لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ {الأحزاب: ٢١} واتە: (سوێند بەخوا لە پێغەمەری خوادا چاکترین نموونەی سەرمەشقی و چاولێکەری هەیە، بە تایبەت بۆ کەسێك هیوای ڕەزامەندی خوا و سەرفرازی ڕۆژی دوایی بێ و زۆر یادی خوا بکات).

دوایی عەلی هەستا عەبدوڵلای کوڕی عەباسی نارده لایان، منیش لەگەڵی چووم، تاگەیشتینە ناوەڕاستی سەربازگەکەیان: ئیبنولکەواء هەستا ووتارێکی داو

---

(١) مەبەستی ئەوەیە: ڕەخنەی ئەوەی لێدەگرن، کە ناوەکەی بە ڕوتی، بەبێ ئەمیری ئیمانداران نووسیوە.

وتی: ئەی قورئان خوێنەکان، ئەمە عەبدوڵلای کوڕی عەباسە، جا هەرکەس نایناسێ ئەوە من لەڕێگەی قورئانەوە پێی دەناسێنم با بیناسێ، ئەمە ئەو کەسەیە خودا لەبارەی خۆی و قەومەکەیەوە ئەم ئایەتەی دابەزاندۆتە خوارەوە: ﴿ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴾ {الزخرف: ٥٨}. واتە: (و گوتیان ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترن یان عیسا ، ئەوانە نمونەی عیسایان تەنها بۆ دەمبازی بۆ دەهێنایەوە ئەوە نەبێ بە شوێن هەق و ڕاستیدا بگەڕێن، بەڵکو ئەوانە گەلێکی زۆر دەمەقاڵێ کەرن).

بیگێڕنەوە دواوە، لەسەر حوکمی قورئان لەگەڵی مەکەن.

بەڵام وتار بێژەکانیان هەستان و گوتیان: سوێند بەخوا لەسەر حوکمی قورئان لەگەڵی دادەبەزین، ئەگەر حەقێکی هێنابوو و بڕوامان پێ کرد، ئەوە شوێنی دەکەوین، خۆ ئەگەر ناحەقیەکی هێنابوو ئەوە ئەیدەینەوە نێو چاوانی[١].

تا سێ ڕۆژ عەبدوڵلا قسەی لەگەڵ کردن، ئەوەبوو چوار هەزاریان پاشگەز بوونەوە وتەوبەیان کرد، لەگەڵ ئەم ئیبنولکەوائەش. دوایی هەموویانی بردەوە بۆ لای عەلی لە کوفە[٢]، پاشان عەلی ناردیە دوای باقیەکەیان و وتی: خۆتان دەزانن لە نێوان ئێمە و خەڵکدا چی ڕوویدا، بۆیە لە هەر کوێیەك پێتان خۆشە لەوێ بن، هەتا ئومەتی موحەممەد ﷺ یەك دەگرێتەوە، بەڵام بە مەرجێك نابێت

---

(١) الله أكبر، لەو وتە جوانە، بە ئاوی ئاڵتون، بەڵکو بە ئاوی چاوان بنوسرێ، دەبەخوا زۆر زۆر کەمن بە تایبەت لەم ڕۆژگارە، بڵێ: با بزانم چیت پێیە؟ گەر هەق بوو سەر چاو و منیش ملم لە ئاست هەق تاڵە مووە، ناهەقیش بوو، ماڵی خراپ سەر بە صاحیبەکەیەتی! خوای مەزن بە لوتفی خۆی هەقمان پیشاندا و بمانکاتە شوێنەکوتووی و ناهەقیمان پیشان بدا و بە دوورمان بخات لێی. (وەرگێڕ)

(٢) (مستدرك الحاكم) (٢/ ١٥٠)..

هیچ کەسێك بە ناهەق بکوژن و ڕێگە بە کەس بگرن و زوڵم لە هیچ زیمی (ذمي) یەك[1] بکەن، ئەگەر ئەمانەتان جێ بەجێ کرد، ئەوا لەبەرانبەردا شەڕتان لەگەڵ ناکرێ، خودا خۆشی لەخیانەتکاران نایە.

عائیشە ﵂ وتی: ئەی کوڕی شەدداد: ئەی خۆ دوایش شەڕی لەگەڵ کردن، ئەویش وتی: دە بەخوا لەگەڵیان بە شەڕ نەهات هەتا ڕێگەیان بە خەڵك گرت و خوێنی ناهەقیان ڕشت و خوێنی ئەهلی زیمەشیان حەڵاڵ کرد، عائیشە وتی: توخوا ئاوها بوو؟ وتی: بەڵێ بەو خوایەی کە تاك و تەنهایە ئاو هابوو، عائیشە وتی: دەی من هیچم لە بارەی ئەهلی زیمەوە پێنەگەیشتووە، بەڵکو هەر دەیانگوت: ذو الثدی ذو الثدی؟

ئەویش وتی: ئەمن ئەوم بینی و لە نێو کوژراوەکاندا بوو لەگەڵ عەلیدا ڕۆشتمە سەری، عەلیش بانگی خەڵکی کرد و وتی: ئەمە دەناسن؟ زۆرێك هات دەیووت: لە مزگەوتی فلان خێڵ بینیم نوێژی دەکرد و لە مزگەوتی فلان خێڵ بینیم نوێژی دەکرد. کەسیان بەڵگەیەکی دی نەهێنا بۆ ناسینەوەی، تەنها وە نەبێت.

عائیشە وتی: باشە عەلی چی ووت کاتێك ڕۆیشتە سەری، وەك خەڵکی عیراق وا ئەڵێن؟ وتی: گوێم لێ بوو دەیووت: خوا و پەیامبەرەکەی ڕاستیان

---

(١) ذمي ئەو کەسەیە کە بەڵێنی پاراستنی ماڵ و سامان و سەر وگیانی پێدراوە و لەو پێناوەشدا بڕێك سەرانەی لێدەسەنرێ، ئەمەش دەوڵەتی ئیسلامی پێی هەڵدەسێ، تەنها ئەهلی= =کتاب -گاور و جو- و ناگر پەرست -مجوسی- دەگرێتەوە، ئەشڵێن: بۆ هەموو موشریکێکە..(وەرگێڕ).

فەرموو، عائیشە وتی: جگە لەوە هیچی دیکەت لێ نەبیست؟ وتی: خوا ئـەزانێ نەء.

عائیشەش وتی: بەڵێ، خوا و پەیامبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، ڕەحمەتی خوا لە عەلی بـێ، هەرشـتێکی سـەیری ببینیایـە دەیـووت: خـوا و پەیامبەرەکـەی ڕاسـتیان فـەرموو، ئـەوەتا خـەڵکی عـێراق ئـەڕۆن درۆ و دەلەسـەی بەدەمـەوە هەڵدەواسن و زیاد ئەخەنە سەر ئەوەی لێوەی دەبیسن[1].

ژمارەی خەوارجەکان هەزار کەس دەبوون، ئەوەبوو هەر هەموویانی کوشت، بەڵام سوپاکەی عەلی تەنها چوار کەس، یان وەك لـە هەنـدێ ڕیوایەتـدا هـاتووە حەوتیان لێ کوژراوە[2].

لە نێوانیاندا (مُخَدّج، ذا الثُديـّة)[3]ی تێدا بوو، وا عەلی بینی، پەیامبەری خواش ﷺ هەواڵی دابوو، لە کاتێکدا کە موسڵمانان جیاوازیەك لە نێوانیاندایـە، گروپێك دەردەچن، نزیکترین ئەو دوو کۆمەڵەیە لـە هەقـەوە کوشـتاریان لەگـەڵ دەکەن، لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێ: ( ذا الثُديّة )یان تێدایە[1]، هەر بۆیـە

---

(١) أخرجه أحمد في(المسند) (رقم ٦٥٦) بتحقيق أحمد شاكر، و قال(اسناده صحيح).

(٢) (البداية و النهاية) (٢٩٨/٧).

(٣) خداج، واتە: ناتەواو، نوقسان، ها ئەو فەرمودەیەی پەیامبەری خـوات ﷺ نەبیسـتووە، کە ئەفەرموێ: «من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن فهي خداج فهي خداج غير تمـام». واتە: هەرکەس نوێژێك بکا و فاتیحەی تێدا نەخوێنێ، ئەو نوێژە نوقسانە، ئەو نوێژە نوقسانە، ئەو نوێژە نوقسانە، ناتەواوە. صحيح سنن أبى داود. (وەرگێڕ)

(١) (مسلم) كتاب الزكاة، باب ذكر الخوارج، الحديث (١٠٦٤/١٤٨) ومابعده، وانظر (صحيح البخاري (كتاب المناقب، باب علامات النبوة حديث (٣٦١٠).

عەلی ﷺ لە نێـو کوژراوەکانـدا بەدوایـدا گـەڕا هـەتا دۆزیـەوە، کـە دۆزیـەوە سوجدەی شوکری بۆخوا برد[١]، چونکە زانی لەسەر هەقە[٢].

❊ ❊ ❊

(١) أخرجه أحمد في (المسند) (١٥٤/٢ رقم ٨٤٨) بتحقيق أحمد شاكر، وقال:(اسناده صحيح).

(٢) تەماشای ئیمامی عەلی بکەن ﷺ کاتێك کوشتاری عائیشە وتەڵحـە و زوبـەیر وئـەوان دەکا پێی ناخۆشە ودەگری -وەك بینیت-، بەڵام کە کوشتاری خەوارج دەکا سوجدەی شوکر دەبا.

# باسی سێیەم

## کوشتنی ئەمیری ئیمانداران

## عەلی کوڕی ئەبو تالب ﷺ ساڵی ٤٠ ك

لە دوای جەنگی نەهرەوان کاتێك بارودۆخەکە هەندێك سەقامگیر بوو و کەش و هەواکە بۆ ماوەی دوو ساڵێك ئارامیەکی بەخۆیەوە بینی، سیان لە خەوارجەکان لە مەککە کۆبوونەوە و پەیمانیان دا کە ئەبێت عەلی کوڕی ئەبوتالب و موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان و عەمری کوڕی عاص بکوژن.

وتیان: خۆمان لە خودا نزیك ئەکەینەوە بە کوشتنی ئەم سیانە (ئەمەش بۆ ئەوەی خەڵك قوتاریان بێ لە دەستیان ـ بە گومانی خۆیان-). عەبدولڕەحمانی کوڕی مولجیمی ئەلموڕادی وتی: من بۆ علی کوڕی ئەبو تالب، بەرکی تەمیم وتی: من بۆ موعاویە، عەمری کوڕی بەکری تەمیمیش وتی: منیش بۆ عەمری کوڕی عاص، لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن کە لە دوای حەڤدەی ڕەمەزانەوە دەستدەکەن بە جێ بەجێ کردنی.

عەمر لە میسر بوو، موعاویەش لە شام بوو و عەلی لە کوفە، ئیبن مولجیم دەستی خۆی وەشاند، کاتێك کە عەلی کوڕی ئەبو تالب دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی، بە شمشێرێ کە هەفتەیەك ژەهری پێوەکردبوو لێیدا. کاتێك کە لێیدرا وتی: ئەگەر باش بوومەوە، ئەوە خۆم ڕوبەڕووی دەبمەوە، ئەگەریش مردم بە بەرانبەر کوشتنی من بیکوژنەوە -قسەی لەگەڵ حەسەن و حوسویندا دەکرد-. بۆیە ئیبن مولجیم وتی: نە بەخوا شتی وانابێ، ئەمن یەك هەفتە ژەهرم

پێوەکردوە. کە وەفاتی کرد، هاتن بۆ ئیبن مولجیم و هەردوو دەستیان بڕی و هەردوو چاویان دەرهێنا، بەڵام هەر خۆڕاگر بوو نارەحەتیی نەدەکرد، کاتێك کە ویستیان زمانی ببڕن، ترسا، وتیان: ئێستا [ئەتەوێ تەوبە بکەی]!؟ ئەویش وتی: نا، دەترسم ماوەیەك بژیم و زیکری خوای تێدا نەکەم! [بەڵام ئەم بەسەرهاتە سەنەدەکەی صەحیح نیە].

سبحان الله !! ئا ئەمەیە گومڕایی و سەرلێشێواویی ئاشکرا، پەنا بە خوا، خوێنی وەلیەك لە وەلیەکانی خوا حەڵاڵ دەکا و پاشان دەترسێ ماوەیەك بژی و یادی خودای تیا نەکات !

لەوێشەوە (بەرك) لە نوێژی بەیانی دا چوو بۆ موعاویە و لێیدا، پێکای بەڵام نەیکوشت، چارەسەریان کرد و باسی ئەوەش دەکرێ کە دواجار ئەمە بۆیێتە هۆکاری نەزۆکی موعاویە. ئەوەشیان کە نیازی عەمری کوڕی عاصی هەبوو، دەرچوو بۆ نوێژ، بەڵام عەمر توشی نەخۆشی سکچوون هاتبوو نەهات بۆ مزگەوت، ئەمیش ڕۆیشت ئیمامەکەی کوشت، وایزانی عەمری کوڕی عاصە، ئیمامەکەش خاریجەی کوڕی ئەبی حەبیب بوو، هات لەناو نوێژەکەدا پیایکێشا و کوشتی، خەڵکەکە گرتیان، وتیان: ئەوە چیت کرد؟ وتی: ڕزگارتانم کرد لە دەست عەمری کوڕی عاص! وتیان: عەمرت نەکوشت، خاریجەت کوشت. ئەویش گوتی: من عەمرم ویست و خواش خاریج[1]، ئیتر ئەم و بەرك و عەبدولڕەحمانی کوڕی مولجیمیش کوژران[2].

---

(١) ئەمیش دواجار بوو بە پەند.

(٢) (الطبقات الكبرى) (٣/٣٥)، (البداية والنهاية) (٧/٣٣٨).

# باسی چوارەم

## هۆکاری جیاوازی نێوان هاوەڵان ﷺ

**ئەوەی مەشهورە: عائیشە و تەڵحە و زوبەیر بۆ تۆڵەسەندنەوەی عوسمان دەرچوونە.**

**بە نیسبەت موعاویەشەوە:** کاتێك کە عەلی خیلافەتی گرتە دەست، هەندێك لەو والیانەی لابرد کە عوسمان دانابوون، ئەوانیش: خالدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوون، کە هەواڵی لابردنەکە گەیشتە موعاویە ڕەفزی کرد و وتی: لەلایەن کێوە لادەبرێم؟ وتیان: لەلایەن عەلیەوە.

ئەویش وتی: ئەی بکوژانی کوڕەکەی مامم لە کوێن؟ لە کوێن بکوژەکانی عوسمان؟

ئەوانیش وتیان: جارێك بەیعەت بدە، دواجار داوای بکوژەکانی عوسمان بکە.

وتی: نەخێر، بەڵکو بکوژەکانی عوسمان تەسلیم دەکات، پاشان بەیعەت دەدەم.

ئەمەش لەبەرئەوەی موعاویە وای دەبینی کە هێز و توانایەکی لە شامدا هەیە، ئەم هێزەی کە هەیەتی هەروا بە فیڕۆ نادات و لە تۆڵە سەندنەوەی عوسماندا بە کاری دەهێنێت، بۆیە وتی: بەیعەت نادەم هەتا بکوژانی عوسمان نەکوژرێنەوە، عەلیش دەیووت: بەیعەت بدە، دواجار تەماشایەکی ئەو مەسەلەیەش دەکەین.

**جا جیاوازیەکەی نێوان عەلی و موعاویە ﷺ لەوەدا بووە، ئەو دووانە کامیان لە پێشە:**

**عەلی** وای دەبینی کە دەبێ پێشتر بەیعەت بدا، دوای سەقامگیر بوونی ئاسایش وبارودۆخەکە تەماشای بکوژەکانی عوسمانیش دەکرێت.

**موعاویە** مەسەلەکەی بە پێچەوانەوە دەبینی، یەکەم کارێك کە ئەبێت بیکەن، کوشتنی بکوژەکانی عوسمانە و پاشان تەماشای مەسەلەی خیلافەت دەکرێت.

**بۆیە جیاوازی نێوان عەلی و موعاویە جیاوازی بەراییتر (أولويات) بووە،** هەروەها تەڵحە و زوبەیریش ڕەئیان هەروا بوو، کە پەلە کردنە لە کوشتنی بکوژەکانی عوسمان، بەڵام فەرقی نێوان تەلحە و زوبێر و موعاویە ئەوە بوو کە تەلحە و زوبەیر بەیعەتیان دا بەڵام موعاویە بەیعەتی نەدا.

**هەڵوێستی هاوەڵان لەمەڕ ئەو جەنگانە:**

هاوەڵان بوون بە سێ کۆمەڵەوە:

**کۆمەڵەی یەکەم:** تەڵحە و زوبەیر و عائیشە و موعاویە، ئەم کۆمەڵەیە وا دەبینێ، پەلە بکرێت لە کوشتنی بکوژەکانی عوسمان.

**کۆمەڵەی دووەم:** عەلی و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون، ئەم کۆمەڵەیە وا دەبینێ، یەکەم شتێك دەبێت بکرێ و ببڕێتەوە خیلافەتە، لەگەڵ دواخستنی چاوخشاندن بە مەسەلەی بکوژەکانی عوسمان.

**کۆمەڵەی سێیەم:** لەسەروویەوە: سەعد، ئیبن عومەر، ئەبوهورەیرە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، ئەحنەف، ئوسامە، ئەبو بەکرەی سەقەفی، لەگەڵ زۆربەی هاوەڵان، ئەم کۆمەڵەیە وا دەبینێ دوورگیری بکرێ لە هەمووان.

هۆکاری ئەم ڕاجیاوازیەش ناڕونی بارودۆخەکە بوو، ئەو کاتەش کاتی فیتنە بوو، بۆیە کەس نەیتوانی لە مەسەلەکە ڕابمێنێت و ڕاستیەکەی بە جوانی بۆ ڕوون بێتەوە[١].

حافظ ئیبن حەجەر دەڵێ: ( تەبەری بە سەنەدێکی صحیح لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوەﷺ ڕیوایەت دەکات، کە ئەڵێ: گەیشتم بە تەڵحە و زوبەیر ـ دوای گەمارۆدانی عوسمان ـ وتم ئەمر بە چی دەفەرموون، من بزانم دەکوژرێت؟ وتیان: خۆت بگەیەنە بە عەلی، هەروەها لە مەککە دوای کوشتنی عوسمان گەیشتم بە عائیشە و پێم ووت: ئەمر بە چی دەفەرمووی؟ ئەویش فەرمووی: خۆت بگەیەنە بە عەلی[١].

هەر بۆیە کاتێك ئەم هاوەڵانە دەرچوون بۆ جەنگی جەمەل، ئەحنەف لە ڕێگادا گەیشت پێیان، وتی: دە بە خوا کوشتارتان لەگەڵ ناکەم و دایکی

(١) لە جەنگی کوەیتیشدا نمونەیەکی نزیك و زیندومان لەبەردەستە لەسەر ڕاجیاوازی وگرژی بارودۆخ، لە فیتنەیەکدا کە زۆرێك لە دەستەڵاتدارانی سەرگەردان کرد، چ جای خەڵکی سادە.

(١) ئەوەی کە لەم ڕیوایەتەدا دەردەکەوێت، (تەڵحە و زوبەیر و عائیشە)، هەرگیز قسەیان لەسەر خیلافەتی عەلی نەبووە، لەکاتێکدا ئەوان لەسەر خیلافەت بەیعەتیان پێداوە، وە فەرمانیشیان بە (ئەحنەف)کردووە بەیعەتی پێبدات، ئەوەندە هەیە ئەوان ئیجتهادیان لە زانینی ئەوە کردووە کە دەبێت یەکەمجار چی بکرێت وبەچی کارێك دەست پێ بکەن.

ئیماندارانتان لەگەڵ بێ، کوشتاری یەکێکیش ناکەم، خۆتـان فـەرمانتان پێکـردم بەیعەتی بدەمێ[(١)].

پێشتریش باسی ئەو فەرموودەیەی پەیامبەری خوامان کردﷺ کە بە عـەلی فەرموو: ئەی عەلی لە نێوان تۆ و عائیشەدا شتێ ڕوو ئەدات، جا نەرم و نیان بە لەگەڵی، عەلی وتی: ئەی پەیامبەری خواﷺ بـۆ ئـەمن سـەر شـۆڕیان دەکـەم؟ ئەویش فەرمووی: (نەخێر، بەڵام گەر هاتوو ئـەوە ڕوویـدا ئـەوا بیگەڕێنـەوە بـۆ ماڵەکەی خۆی)[(٢)].

*** هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لە ئاست عەبدولڕحمانی کوڕی مـولجیم و بکوژەکـانی عوسمـان و بکوژەکـەی زوبـەیر و بکوژەکـانی حوسـین و هاوشێوەکانیان:**

ئیمامی زەهەبی دەڵێ: (ئیبن مولجیم لەلای ئێمە لەو کەسانەیە کـە هیـوای دۆزەخی بۆ دەکرێ، بەڵام بە جائیز (گونجاو)یشی دەزانین گەر خوا لێـی ببورێـت، حوکمی ئـەویش هـەروەك حـوکمی بکوژەکـەی عوسمـان و بکوژەکـەی زوبێـر و بکوژەکەی تەڵحە و بکوژەکەی سەعدی کـوڕی جوبـەیر و بکوژەکـەی عـەممار و

(١) (فتح الباري) (١٣/٣٨) وانظر (تاريخ الطبري).

(٢) رواه أحمد (٦/٣٩٣) وقال الحافظ في ( الفتح) (١٣/٦٠) سنده حسن.

بکوژەکەی خاریجە و بکوژەکەی حوسەینە[١]، هەموو ئەمانە تەبەڕایان لێ دەکەین و ڕقمان لێیانە لەبەرخواو ئاخیرەتیان دەدەینە دەست خوای گەورە)[٢].

*** لەو ڕووداوانەی نێوان هاوەڵان هەق لەگەڵ کێدا بووە؟**

پەیامبەری خوا ﷺ لەربارەی (عەمار)ەوە دەفەرمووی: (کۆمەڵە یاخی بووەکە دەیکوژن)[٣].

لە بارەی(خەوارجەوە )دەفەرمووی: (لەکاتی جیاوازیەکی نێوان موسڵماناندا، تاقمێك دەردەچن، نزیکترین ئەو دوو کۆمەڵەیە لە هەقەوە کوشتاریان لەگەڵ دەکەن)[٤].

جا ئەم دوو فەرموودەیە زۆر ڕاشکاون لەوەی کەوا هەق لە عەلی یەوە نزیکترە.

لە ڕیوایەتێکی تردا: (نزیکترینی ئەو دوو کۆمەڵەیە لە هەقەوە کوشتاریان دەکەن).

هەردوو فەرموودەکە ئەوە دەستنیشان دەکەن کە عەلی نزیك تر بووە لە هەقەوە وەك لە بەرانبەرەکانی لە (جەمەل) و هەروەها لە (صفین) یشدا، بەڵام هەموو هەقەکەی نەپێکا، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرمووی: (نزیکتر لە

(١) هەموو ئەمانە یەك حوکمیان هەیە ، لە میللەتی ئیسلام بەتەواوەتی دەرناکرێن ، بەڵام گومانی تێدا نییە کە ئەوانە فاسق و موجرمن، ئیلا ئەوەیان نەبێت کە تەوبەی کردبێ.

(٢) (تاریخ الاسلام) (٦٤٥)، عصر الخلفاو الراشدین فی ترجمه عبدالرحمن بن ملجم.

(٣) سبق تخریجه في معرکة صفین.

(٤) سبق تخریجه في الکلام علی معرکة نهروان.

هەق)، (لە پێشتر بۆ هەق)، نەك ئەوەی بە تەواوەتی لەسەر هـەق بـێ. ئەمـەش ڕەخنە نییە لە عەلی ﷺ، تەنها بۆ ڕونکردنەوەی ئەوەیە کە ئەوانـەی خۆگریـان کرد لە فیتنەکەدا، ئەوانە بە تەواوی لەسەر هەق بوون، جا خۆگرتنەوە لە کوشتار بێوەی تر بوو بۆ عەلی، بۆیە عەلی کـە تەڵحـەی بینـی بـە کـوژراوی پەشـیمان بوویەوە و وتی: (خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستە بمردایەم)[1].

هەروەها کاتێك حەسەنی کوڕی عەلیﷺ پاش جەنگی صفین هات و باسی ئەوەی بۆ عەلی کرد کە ڕویداوە، عەلی وتـی: (سـوێند بـەخوا هـەرگیز گومـانم نەدەبرد کار بگاتە ئەوە)[2].

هەرهەموویان پەشیمان بوونەوە لە بەشداری کردن لەو جەنگانەدا.

پەیامبەری خواﷺمەدح و سەنای حەسەن دەکات و ئەفەرموێ: (ئەم کوڕەم گەورەو بەڕێزە، بەڵکو خوا بەهۆی ئەمەوە ئاشتەوای بخاتـە نێـوان دوو کۆمـەڵی موسڵمانان)[1].

دەبینین مەدح و سەنای دەکات لە بـۆ ئاشـتەوایی، بـەڵام مـەدح و سـەنای عەلی ناکات لەبەر ئەوەی لەگەڵیان دەجەنگێت.

مەدح و سەناکەی عەلیش بـەهۆی کوشـتاری ئـەهلی (نـەهرەوان)ـەوەیە، بێگومان بە تەواوی هەقی پێکا لە کوشتاری خەواریجـدا، هـەر بۆیـە کـەس بـە

(١) سبق تخريجه في معركة الجمل.

(٢) و انظر مصنف ابن أبي شيبة باب ماجاء في صفين.

(١) ( صحيح البخاري)كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب الحسن والحسين، حديث (٣٧٤٦).

کوشتنیان دڵتەنگ نەبوو، بەڵکو موسڵمانان دڵخۆش بوون بە کوشتنی ئەهلی نەهرەوان.

تەنانەت (عەلی)کاتێك کوشتاری خەڵکی نەهرەوانی کرد سوجدەی شوکری بۆ خودا برد، بەڵام کاتێك کوشتاری ئەهلی (جەمەل)ی کرد گریا، وە کاتێك کوشتاری ئەهلی (صفین)ی کرد دڵتەنگ بوو.

* * *

# بەشی پێنجەم

## خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی عەلی ﵁ لەساڵی ٤٠بۆ ٤١ك

# باسی یەکەم

## حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ لە چەند دێڕێکدا:

**※ خێزانەکانی :**

١. خەولەی کچی مەنزور.

٢. ئوم بیشری کچی ئەبو مەسعود.

٣. ئوم ئیسحاقی کچی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا.

و بەناوبانگە کە حەسەن زۆرێکی خواستووە و زۆرێکیشی تەڵاق داوە[1].

**※ منداڵەکانی :**

کوڕەکان: حەسەن - زەید - تەڵحە - حوسەین - عەبدوڵڵا - ئەبوبەکر - عەبدولڕەحمان - القاسم - عەمر - موحەممەد.

کچەکان: ئوم حەسەن - ئوم عەبدوڵڵا.

---

(١) شێخ عوسمان لێرەدا دەڵێ: بەناوبانگە. جا بەناوبانگە و وا مەشهورە و زۆرێك وا ئەڵێن و .. هتد هیچی نیشانەی چەسپاوی شتەکە نین، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەرکاتێك ئەهلی خۆی وتی: مەشهورە و ئاماژەی بە صیحەتی نەکرد ئەوە بۆ تەمریضە.
جا ئەم مەسەلەیەش لە نێو کتێبە مێژوویەکاندا مەشهورە کە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ ئاوها بووە، بەڵام واش نیە، هەروەك چۆن دەیان شتی تر لە کتێبەکانی تەفسیر و فیقە و ئەوانی تردا مەشهورە و ئەصلیشی نییە.

*** فەزڵەكانی :**

لە ئەبی بەكرەوە ئەڵێ: گوێم لە پەیامبەری خوا بوو ﷺ لە سەر مینبەرەوە، حەسەن لە تەنیشتیەوە بوو، جارێك تەماشای خەڵكەكەی دەكرد و جارێك تەماشای حەسەن، دەیفەرموو: ( ئەم كوڕەم گەورە و بەڕێزە، بەڵكو خوا بیكاتە هۆی ئاشتەوایی نێوان دوو كۆمەڵی موسڵمانان )(١).

لە ئوسامەی كوڕی زەیدەوە، كەوا پەیامبەر ﷺ خۆی و حەسەنی دەگرت و دەیفەرموو: ( ئەی خودایە من خۆشیانم دەوێ، خودایە خۆشیانت بوێ )(٢).

لە عوقبەی كوڕی حارسەوە ئەڵێ: ئەبو بەكرم بینی، حەسەنی لە ئامێز بوو و دەیووت: باوكم بە قوربانی بێ، شێوەی هەر لە پەیامبەر دەچێ و لە عەلی ناچێ، عەلیش پێدەكەنی)(٣).

*** وەفاتی:**

لە ماوەی خیلافەتی موعاویەدا بوو لە ساڵی ٤٩ ك حەسەنی كوڕی عەلی رضي الله عنه وەفاتی كرد.

عومەیری كوڕی ئیسحاق ئەڵێ: من و برادەرێكم چووین بۆ لای حەسەنی كوڕی عەلی سەردانێكی بكەین، بە هاوڕێكەم وتی: ئەی فلان كەس بپرسیارم لێبكە؟

ئەویش پێی ووت: هیچت لێناپرسم. پاشان هەستا و ڕۆیشتە ژورەكەیەوە و دیسانەوە هاتە دەرێ و وتی: ئەی فلان كەس، پرسیارم لێبكە پێش ئەوەی ڕۆژێك

---

(١) البخاري: كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل الحسن و الحسين (٢٧٤٦). وانظر (البدايتوالنهاية) (٧/٢٤٥).

(٢) صحيح البخاري: كتاب فضائل الصحابة، باب ذكر أسامة ﷺ(٣٧٣٥).

(٣) صحيح البخاري: كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب الحسن و الحسين حديث (٣٧٥٠) وفي باب صفة النبي ﷺ (٣٥٤٢).

بێت نەبم تا لێم بپرسی، دە بە خوا وە چەند جار ژەهر خۆر کراوم، بەڵام وەکو ئەمە کاری تێنەکردووم، لێم بپرسە.

ئەویش وتی: هیچت لێناپرسم، إن شاء الله خوا شیفات دەدات، [ئەوجا پرسیارت لێ دەکەین].

دوایی هەستاین و بەیانییەکەی سەردانیم کرد، بینیم لە سەرەمەرگدایە، حوسێن هاتە لای سەری و دانیشت، وتی: برام، پێم بڵێ: کێ بە خواردی دای؟

وتی: بۆ؟ دەیکوژی؟

وتی: بەڵێ.

ئەویش وتی: پێت ناڵێم، ئەگەر ئەوە بێت کە خۆم ئەیناسم ئەوە خوای گەورە تۆڵەی سەختترە، گەرنا سوێند بەخوا هەرگیز ڕێگا نادەم بێ تاوانێك لە جیاتیم بکوژرێت[1].

گوتراویشە: ئەوەی کە ژەهرەکەی پێداوە، خێزانەکەی خۆی بووە (جەعدەی کچی ئەشعەس )بەڵام ئیسپات نەبووە.

زەهەبی ئەڵێ: (ئەمە شتێکی ڕاست نییە، ئەمە کێ بینی؟)[2].

ئیبن کەسیریش ئەڵێ: (بەڕای منیش ئەمە شتێکی ڕاست نییە)[3] .

❊ ❊ ❊

---

(١) (الطبقات الكبرى) (ص ٣٣٥ رقم ٢٩٤) الطبقة الخامسة من الصحابة تحقيق محمد بن صامل السلمي.

(٢) (تاريخ الاسلام) - عهد معاوية - (ص ٤٠).

(٣) (البداية و النهاية) (٨/٤٤).

# باسی دووەم

## بەیعەتدان بە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ

دوای کوشتنی عەلی ﷺ خەڵکی کوفە بەیعەتیان دا بە حەسەنی کوڕی عەلی، پاش تەواو بوونی بەیعەتەکە ڕۆیشت بەرەو شام، چونکە تا ئێستا نەهاتوونەتە ژێر گوێڕایەڵی عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە.

* حەسەنی کوڕی عەلی صوڵح لەگەڵ موعاویەدا دەکات و موسوڵمانان کۆدەکاتەوە :

حەسەنی کوڕی عەلی کەوتەڕێ بەڵام بە نیەتی ئاشتیەوە، حەزی لە جەنگ نەبوو، تەنانەت حەسەن بە دەرچونی باوکیشی بۆ کوشتاری خەڵکی شام ڕازی نەبوو[1].

لە نیشانەکانی ئارەزوی صوڵحکردنی ئەوەبوو، هەستا بە لابردنی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە لە سەرکردایەتی و دانانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسب وەکو سەرکردە[2].

لە حەسەنی بەسریەوە ئەڵێ: کاتێك کە حەسەنی کوڕی عەلی بە سوپاکەوە چوو بۆ لای موعاویە، عەمری کوڕی عاص بە موعاویەی ووت: من سوپایەك دەبینم پشت هەڵناکات تا دوا دنکی نەبڕێتەوە.

---

(١) (مصنف عبدالرزاق) (٥/٤٦٢).
(٢) (فتح الباري) (١٣/٦٧).

حەسەنی بەسری ئەڵێ: وە گوێم لە ئەبو بەکرە بوو ئەیووت: لەو کاتەی کە پەیامبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، حەسەن هات، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەم کوڕەم گەورە و بەڕێزە، بەڵکو خوا بیکاتە هۆی ئاشتەوای نێوان دوو کۆمەڵی موسڵمانان[1].

هەروەها لە زوهریەوە دەڵێ: موعاویە تۆمار (سجل) ێکی نارد بۆ حەسەن و کۆتاییەکەشی مۆر کردبوو، کە هەرچی تێدا دەنوسی بنوسە ئەوە بۆ تۆیە، عەمری کوڕی عاص وتی: نا لەگەڵیدا دەجەنگین، موعاویە وتی: (جا زوهری ئەڵێ موعاویە لە عەمر باشتر بووە): لەسەر خۆبە ئەی ئەبو عەبدوڵلا، تۆ لە کوشتاری ئەمانە نابیتەوە هەتا بە ژمارەی ئەمانە لە خەڵکی شام نەکوژرێت، ئیتر دوای ئەو هەموو کوشتارە خێر وخۆشی دونیا کوا؟

دە بە خوا ئە من هەرگیز ناجەنگم مەگەر ڕێگە چارەیەکم نەمێنێ و مەجبوربم.

موعاویە و حەسەن گەیشتنە یەك، حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وازی لە خیلافەت هێنا بۆ موعاویە، ئیتر موعاویە بوو بە ئەمیری ئیمانداران، ئەم ساڵەش ناونرا بەساڵی کۆمەڵ (الجماعة).

ماوەی حوکمڕانیەکەشی (٦) مانگ بوو.

❊ ❊ ❊

(١) أخرجه البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب الحسن و الحسين، حديث (٢٧٤٦).

# باسی یەکەم

## موعاویە ﷺ لە چەند دێڕێکدا:

لە ساڵی حەوتی کۆچیدا لە (عومرەی گێڕانەوەدا (عُمرة القضاء)) موعاویە پێش باوکی موسڵمان بوو،و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند[1]

*** خێزان و منداڵەکانی:**

١. مەیسونی کچی بەحدەلی کەلبیە، (یەزید)ی لێ بوو.

٢. فاخیتەی کچی قەرزەی مونافیە. ئەمیش (عەبدولڕەحمان) و (عەبدوڵلا)ی لێ بوو.

٤. نائیلەی کچی عومارەی کەلبیە.

*** لەو فەرمودانەی لەسەر فەزڵی هاتوون:**

١. پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (خوایە ڕێی نیشاندە و بیکە ڕێنیشاندەر و بەهۆیەوە هیدایەت بدە)[2].

٢. پەیامبەری خوا ﷺدەفەرموێ: (خوایە موعاویە فێری قورئان و ژماردن بکە و لە ئاگر بیپارێزە)[3].

٣. هەروەها لە ئوم حەڕامی کچی میلحانەوە ئەڵێ: ڕۆژێك پەیامبەری خوا ﷺ لە نزیك من خەوت، پاشان بە خەبەر هات و پێدەکەنی، منیش وتم: ئەی

---

(١) (تاريخ الاسلام) للذهبي ـ عهد معاوية ٣٠٨.

(٢) أخرجه الترمذي، كتاب الماقب: باب مناقب معاوية (٤١١٣).

(٣) أخرجه أحمد ٤/١٢٧.

پێغەمبەری خوا ﷺ چی یە؟ فەرمووی: (خەڵكانێك لە ئوممەتەكەم بەسەر ئەم دەریا سەوزەدا دەڕۆن وەكو ڕۆیشتنی پادشاكان بەسەر ڕاخەرەكاندا).

ئوم حەڕام وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ دوعا بكە خوا لەوانم بگێڕێ. ئەویش دوعای بۆ كرد، ئیتر جارێكی تر خەوتەوە و هەمان كرداری دووبارە كردەوە، ئەویش هەمان پرسیاری لێكرد، ئەویش بە هەمان شێوە وەڵام دایەوە، ئەویش دیسانەوە وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ دوعا بكە خوا لەوانم گێڕێ. پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ لە یەكەمینەكانی (أَنْتَ مِنَ الأَوَّلِينَ) ).

ئیتر كاتێك كە یەكەم جار موسڵمانان لە ڕێگەی دەریاوە غەزایان كرد، ئوم حەڕام لەگەڵ عوبادەی كوڕی صامتی مێردیدا كەوت لەگەڵیان، كاتێك لێ بوونەوە، لە شام دابەزین وڵاخێكیان هێنا سواری ببێ، ئەوەبوو وڵاخەكە كوتای بە زەویدا و مرد )[1].

موهەللەبی كوڕی ئەحمەدی ئەندەلوسی -كە یەكێكە لەوانەی بوخاریان ڕاڤە كردووە- دەڵێ: (ئەم فەرمودەیە فەزڵ و چاكەی تێدایە بۆ موعاویەی، چونكە بۆ یەكەمین جار ئەو لە ڕێگەی دەریاوە غەزای كرد)[2].

* پرسیاریان لە ئیبن موبارەك كرد لەبارەی موعاویەوە؟

ئەویش وتی: چی بڵێم لە بارەی پیاوێكەوە، پەیامبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «سمع الله لمن حمده» موعاویەش دەیووت: «ربنا ولك الحمد»[1].

---

(١) أخرجه البخاري: كتاب الجهاد والسير: باب فضل من يصرع في سبيل الله، حديث (٢٨٠٠).

(٢) (فتح الباري)(٦/١٢٠).

(١) (البداية و النهاية) (٨/١٣٠).

هەروەها پێی گوترا: کامیان باشترن؟ ئەو یان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز؟ ووتی: (خۆڵی نێو لوتی موعاویە لەگەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ، چاکتر و باشترە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)[١].

* هەروەها پرسیار لە موعافای کوڕی عیمڕان کرا: کامیان باشترن؟ موعاویە یان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز؟

ئەویش تورە بوو، بە کابرای ووت: صەحابی ئەکەیتە تابعی؟ موعاویە هاوەڵێتی و خزمێتی، نوسەرێتی، ئەمینداری وەحیەکەیەتی[٢].

ئیبن مولەیکە دەڵێ: بە ئیبن عەبباسیان وت: هیچت لەسەر موعاویەی ئەمیری ئیمانداران هەیە؟ ئەو تەنها ڕکاتێ نوێژی وتر دەکا؟

ئەویش وتی: بە ڕاستی فەقیهە[٣].

* حافظ ئیبن کەسیر ئەڵێ: (پاشای ڕۆم تەماعی کردە موعاویە، ئەمە دوای ئەوەی موعاویە ترسانی و سەرشۆڕی کرد و پشتی سەربازەکانی شکان و وەدەری نان، ئیتر کە پاشای ڕۆم بینی موعاویە سەرقاڵە لەگەڵ عەلی، لەشکر کێشی کردە سەر هەندێك ناوچە، موعاویەش بۆی نووسی: ئەی لەعنەشۆ، بەو خوایە گەر واز نەهێنی و نەگەڕێیتەوە، ئەوا من و کوڕەکەی مامم لە ماڵ و شارەکانی خۆیشت دەرتدەکەین و ئەم زەویە فراوانەت لێ تەسك ئەکەینەوە، کە

(١) (البداية و النهاية) (٨/١٣٠).

(٢) (البداية و النهاية) (٨/١٣٠).

(٣) (صحيح البخاري) كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب الحسن و الحسين، حديث (٣٧٦٥).

پاشای ڕۆم ئەوەی بینی ترسا و وازی هێنا و دوایش هات و داوای ئاگربەستی کرد)[١].

*** وەفاتی موعاویە ﷺ:**

موعاویە بوو بە خەلیفەی موسڵمانان و ماوەی بیست ساڵ درێژەی کێشا هەتا ساڵی شەستی کۆچی.

کە سەردەمێکی سەقامگیر و پڕ لە فتوحات بوو.

* * *

(١) (البداية و النهاية) (١١٩/٨).

# باسی یەکەم

## گرنگترین ڕووداوەکانی سەردەمی موعاویەدا

خیلافەتی موعاویەی کوڕی ئەبو سفیان خێرێك بوو بۆ موسڵمانان، ماوەی ئاژاوە و کوشتار کۆتایی پێهات، هەروەها ئەو تەماعەی بڕی کە دوژمنان هەیانبوو بە گەڕانەوەی ئەو ناوچانەی موسڵمانان لێیانیان بردبوون، ئەمانەش بەهۆی کۆك بوونی موسڵمانان لەسەر یەك کەس، بۆیە هێز و توانایان بەرەو دەرەوە ئاڕاستە کرد و ئاڵای جیهاد بەرز کرایەوە و فتوحات دەستی پێکردەوە، هەروەها موعاویە زۆر بە چاکی لەگەڵ خەڵکدا هەڵس وکەوتی دەکرد، ئەوەی دوور بوو نزیکی کردەوە (ئەوەی ڕەنجا بوو ئاشتی کردەوە)، تەنانەت یەك بەرهەڵستکاری نەما، هەرهەمووی چوونە ژێر گوێڕایەڵی یەوە (تەنها دەستەیەکی کەم نەبێت لە خەواریجەکان)، هەروەها لەسەردەمی موعاویەدا هاوینەییەکان و زستانەییەکان ناویان دەرکرد، کە مەبەست پێی غەزای هاوین و غەزای زستان بوو.

گرنگترین کارەکانی سەردەمی خۆی.

**❋ دانانی خانوویەك بۆ دروستکردنی کەشتی لە میسر ساڵی ٥٤ ك.**

**❋ غەزاکردنی قوستەنتینیە ساڵی ٥٠ ك.**

پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (یەکەمین سوپایەك لە ئومەتەکەم کە لەڕێگەی دەریاوە غەزا دەکەن بێگومان مسۆگەریان کردووە، و یەکەمین سوپایەك لە ئومەتەکەم کە غەزای شاری قەیصەر دەکەن خوا لێیان خۆش بووە)[1]. لە

---

(١) أخرجه البخاري في كتاب الجهاد: باب ما قيل في قتال الروم (٢٩٢٤).

ساڵی ٥٣ك جارێکی تریش غەزای کرد و گەمارۆیدا و هەتا ساڵی ٥٧ك گەمارۆدانەکە درێژەی کێشا. هەروەها فەتحی ( تکریت )، ( رودس )، ( بنزرت)، ( سوسە )، ( سەجستان )، ( کوهستان )، ( بلاد السند )یشی کرد.

*** بنیاتنانی شاری قەیرەوان.**

موعاویە عوقبەی کوڕی نافعی ناردبوو بۆ ئەفریقیە، ئەوەبوو فەتحی کرد و ناوچەکەی دیاری کرد دروست کرد، بە هۆی ئەوەی ناوچەیەکی دارستانی چڕ بوو، بەردەوام پڕ بوو لە شێر ومار وگیانلەبەرانی تر وئیتر دوعای بۆ کرد لای خوای گەورە، ئەوەبوو هیچی تیا نەما، هەموویان ڕایان کرد، تەنانەت شێرەکان بەچکەکانی خۆیان هەڵدەگرت و دەیان برد(١).

*** لە خیلافەتەوە بۆ میلاکەت:**

کاتێك کار کەوتە دەستی موعاویە خیلافەت گۆڕا بۆ موڵکایەتی.

ئەبوعەبدولڕەحمان سەفینەی خزمەتکاری پەیامبەری خوا ﷺ، دەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (خیلافەتی پەیامبەرایەتی سی ساڵە پاشان خوا موڵکی خۆی دەدات بەوەی ویستی لێیەتی).

سەفینە ئەڵێ: (خیلافەتی ئەبو بکر دوو ساڵ، خیلافەتی عومەر دە ساڵ، خیلافەتی عوسمان دوازدە ساڵ و خیلافەتی عەلیش شەش ساڵ)(٢).

کاتێکیش دەگەڕێینەوە بۆ کتێبە مێژوویەکان باسی ئەوە دەکەن کە ئەبو بەکر دووساڵ و سێ مانگ فەرمانڕەوایی کردووە، عومەر دە ساڵ و دوو مانگ

---

(١) (تاريخ الطبري) (٥/٢٤٠).

(٢) (سن أبي داود) كتاب: السنة، باب في الخلفاء، حديث (٤٦٤٦). وأحمد في ( مسنده ) (٢٧٣/٤) بسند صحيح.

فەرمانڕەوایی کردووە، عوسمان دوازدە ساڵ و چوار مانگ، عەلی چوار ساڵ و نۆ مانگ، حەسەنیش شەش مانگ، کە هەرهەمووی دەکاتە سی ساڵ.

ئیبن کەسیر ئەڵێ: (حەسەن لە ڕەبیعولئەوەلی ساڵی چل و یەکدا وازی هێنا، کە دەکاتە سی ساڵی تەواو لە وەفاتی پەیامبەرەوە ﷺ)[(١)].

* هەروەها لە ئەبوعوبەیدەی عامری کوڕی جەڕاحەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرەتای دینەکەتان پەیامبەرایەتی و ڕەحمەتە دوای ئەوە پادشایەتی و ڕەحمەتە، دوای ئەوە پاشایەتیەکی خراپە، دوای ئەوە پادشایەتی زۆرداری و جەور و ستەمە[(٢)].

کە دەفەرموێ: (سەرەتای دینەکەتان پەیامبەرایەتی و ڕەحمەتە) واتە: پیشەوایەتی پەیامبەر ﷺ بۆ ئیمانداران و پاشان پێشەوایەتی ئەبو بکر وئەنجا عومەر وئەنجا عوسمان، وئەنجا عەلی، وئەنجا حەسەن، پاشان دەفەرموێ: (پادشایەتی و ڕەحمەتە) ئەمەش سەردەمی موعاویەیە، پاشان (مُلك أعفر) کە لە (تعفیر) ەوە هاتووە، کە خۆگەوزانە لە خۆڵدا، ئەمەش زەم و سەرزەنشتە بۆ ئەو سەردەمە، هەروەك ئەڵێن: (تربت یداك، دەستت خۆڵاوی بێت)، کە دژی بەرزی و بڵندیە، پاشان (ملك و جبروت) واتە: پادشایەتی زۆرداری و جەور و ستەم دێت، ئەمەش لە دوای موعاویەوە دەگرێتەوە، ئیتر سەردەمی یەزید بێت یان سەردەمانی دوای یەزید، جگە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز.

---

(١) ( البدية والنهاية) (٨/١٧).

(٢) (سنن الدارمي) كتاب الاشربة، باب ما قيل في المسكر، (٢/١١٤). رجاله ثقات إلا أنه قيل إن مكحولا لم يسمع من أبي ثعلبة الخشني -راوي الحديث عن أبي عبيدة-.

*** وەفاتی حەسەنی کوڕی عەلیؓ:**

هەر لەم ماوەیەدا و لەساڵی ٤٩ ك حەسەنی کوڕی عەلی وەفاتی کرد.

*** بەیعەت دەدرێ بە یەزیدی کوڕی موعاویە :**

لە ساڵی پەنجا و شەشی کۆچی دا، موعاویە بڕیاریدا خەڵکی دوای خۆی بەیعەت بدەن بە یەزیدی کوڕی، ئا لێرەدا موعاویە لە ڕێچکەی ئەوانەی پێش خۆی لایدا، چونکە پەیامبەری خواﷺ کارەکەی هەروا هێشتەوە یا ئەبوبەکری دانا، پاشان ئەبوبەکر هاتوو و عومەری دەست نیشان کرد، دوای ئەو عومەر هات و شەش کەسی دەست نیشان کرد و بەڵام سەعیدی کوڕی زەیدی لێدەرکردن چونکە کوڕی مامی خۆی بوو، لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی دا، دوای ئەویش عوسمان هات و کەسی دیاری نەکرد، ئینجا عەلی هات، ئەویش دیسانەوە کەسی دەست نیشان نەکرد، حەسەنیش وازی لێ هێنا بۆ موعاویە.

بۆیە بە موعاویەیان ووت: یان ئەوەتا وازی لێ بێنە، وەکو چۆن پەیامبەری خوا ﷺ کردی، یان ئەوەتا وەك ئەبو بکری صدیق بکە و کەسێك دابنێ کە خزمی خۆت نەبێ، یان وەك عومەر بکە؛ کارەکەی دایە دەست شەش کەسەوە خزمی خۆی نەبوون، یان ئەوەتا وازبێنە با موسڵمانان خۆیان یەکێك هەڵبژێرن، بەڵام موعاویە ڕازی نەبوو ئیلا هەر دەبێت دوای خۆی ( یەزید )ی کوڕی جێنشین بێت[1].

---

(١) رواه خليفة بن خياط في طبقاته(ص ٥٢)، من طريق جويرية بنت أسماء عن أشياخ أهل المدينة.

پێ ئەچێ لایەنە چاکەکەی هەڵنەبژاردبێ، لە ترسی ئەو شەڕ و ئاشوبەی لە کە لە شورادا دەکەوتەوە، گوێڕایەڵی و ئاسایش و سەقامگیریشی لەو لایەنەدا دەبینیەوە کە یەزیدی کوڕی تێدابووە[1] ئەمە ئەگەر واش بێ هەر ڕاست نییە، بەڵکو هەق لە شورادایە.

## * هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە بەیعەتدانەکەی یەزیدی کوڕی موعاویە:

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەڵێن: بەیعەتەکە دروستە، بەڵام ئەم بەیعەتە عەیبدار دەکەن بەهۆی ئەم دووشتەوە:

یەکەم: ئەڵێن ئەمە بیدعەیەکی تازەیە، کە خیلافەتی داوەتە کوڕەکەی خۆی، وەکو ئەوەی ئیتر خیلافەت ببێت بە ویراسەت، ئەمە دوای ئەوەی بە شورا یا دەستنیشانکردنی جگە لە خزم بووە، ئەی چ جای ئەوەی نزیکێکت بێ و کوڕێکی ڕاستەوخۆی خۆتیش بێ، لەم ڕوانگەیەوە ئەم مەبدەئە ڕەدکرایەوە بە بێ لەبەر چاوگرتنی کەسەکە، ئەوان ئەو مەبدەئەیان ڕەت کردەوە کەوا کارەکە ببێتە ویراسەت.

دووەم: خەڵکی لە ( یەزید ) شیاوتر هەبوون بۆ خیلافەت، وەکو ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر و ئیبن عەبباس و حوسەین، جگە لەمانەش هی تر زۆرن.

---

(١) أنظر: (مقدمة ابن خلدون) فصل في ولاية العهد (ص ١٦٦).

ئیبن ئەلعەرەبی ئەڵێ: موعاویە وازی لە باشتر هێنا؛ بەوەی بیکا بە شورا و کەس لە خزمانی خۆی تیا بەشدار نەکا، چ جای کوڕەکەی خۆی؟ بەڵام بەیعەتیدا بە کوڕەکەی و خەڵکیش بە یعەتیان پێدا بۆیە بەیعەتەکەی شەرعییە[١]

سەبارەت بە دید و بۆچونی مویتەدیعەکان، ئەوان وا دەبینن کە ئیمامەت و خیلافەت تەنها لە عەلی و کوڕەکانیدا دەبێت، هەربۆیە ئەوان بەیعەتەکەی یەزید بەتەنها عەیبدار ناکەن، بەڵکو هەموو بەیعەتێك ڕەتدەکەنەوە کە نەدرێت بە عەلی و کوڕەکانی، هەر لەسەر ئەو ئەساسەش ئەوان بەیعەتەکەی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و موعاویە هەر هەموویان بە نادروست دەزانن، بەبێ لەبەرچاو گرتنی بەیعەتدەرەکە. چونکە ئەوان ئەڵێن خیلافەت و ئیمامەت دیاریکراوە بۆ عەلی و کوڕەکانی هەتا ڕۆژی قیامەت.

## ئایا یەزید شیاو بووە بۆ خیلافەت یان نا؟

ئیبن کەسی[٢] چیرۆکی عەبدوڵڵای کوڕی موتیع و هاوەڵەکانی دەگێڕێتەوە کە ڕۆیشتوون بۆلای موحەممەدی کوڕی حەنەفیە -کە کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالبە و برای حەسەن و حوسەینە لە باوکەوە-، ویستویانە ڕازی بکەن بۆ لابردنی یەزید، ئەویش قایل نەبووە، ئیبن موتیع وتی: یەزیدی کوڕی موعاویە مەی دەخواوەتەوە و نوێژ ناکات.

(١) العواصم من القواصم ص ٢٢٨.
(٢) البداية و النهاية ٨/٢٣٦.

موحەممەدیش وتی: من ئەوەم لیٚ نەبینیوە کە ئێوە باسی دەکەن، ئەمن ڕۆیشتومەتە لای و ماوەمەتەوە، بەردەوامە لەسەر نوێژکردن، هەوڵی خێر و چاکەی دەدا، پرسیاری فیقهی دەکرد و سوننەتەکانی جیٚ بەجیٚ دەکرد.

وتیان: ئەوە لەبەر تۆ خۆی وا دەرخستووە.

موحەممەدی کوڕی حەنەفیەش وتی: باشە چی من ترساندی و هیوای چی لێکردووم؟ ئێوە هەرگیز ئەوانەتان لێی بینیوە کە باسی لێوە دەکەن؟ ئەگەر ئەو کارانەی بە پێش چاوی ئێوەوە کردبێت، ئەوا بێگومان ئێوەش شەریکی وین، ئەگەریش ئەوانەتان لیٚ نەبینیوە ئەوا بۆتان حەڵاڵ نییە شایەتی لەسەر شتێك بدەن کە نازانن و نەتان بینیوە.

ئەوانیش وتیان: ئەوە لای ئێمە ڕەوایە، گەر چی نەشمان بینیوە.

موحەممەدی کوڕی حەنەفیە وتی: خوا ئەمە بە شایەتی قبوڵ ناکات، ئینجا ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاری بۆ خوێندنەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ {الزخرف: ٨٦}.

هەروەها لە یەزیدەوە دەگێڕنەوە کە دوای کوشتنی حوسەین ووتویەتی:

لَيْتَ أَشْيَاخِي بِبَدْرٍ شَهِدُوا   جَزَعَ الخَزْرَجِ مِنْ وَقْعِ الاسَلْ
قَدْ قَتَلْنَا القَرْنَ مِنْ سَادَاتِهِمْ   وَعَدَلْنَاهُ بِبَدْرٍ فَاعْتَدَلْ
وَلَعَتْ هَاشِمُ بِالْمُلْكِ فَلا   خَبَرٌ جَاءَ وَلا وَحْيٌ نَزَلْ [1]

بەڵام ئەمەی لێوە سابت نەبووە.

---

(١) نقله الطبري في (تاريخه) عن المعتضد الخليفة العباسي في أحداث سنة ٢٤٨ ك.

جا ئەو فاسیقیەی دراوەتە پاڵ یەزید وەك مەی خواردنەوە و یاریکردنی لەگەڵ مەیمون و خراپەکاری و.. هتد، هیچیان بەسەنەدێکی صەحیح لێوەی سابت نەبوون، بۆیە بڕوا بەمە ناکرێ و ئەسڵ باشییە[1]، ئیتر خوا زانا و شارەزاترە بە حاڵی یەزید، ئەمەش بەلای ئێمەوە گرنگ نییە، ئەوە لە بەینی خۆی و خوای خۆی دایە.

گریمان مەسەلەکە ئاوهاش بوبێ، خۆ فاسقێتی ئیمامیش خروج لێکردنی واجب ناکات ئا بەو شێوەیەی کە ڕویداوە، وەك دواجار باسی لێوە دەکەین.

❊ ❊ ❊

(١) ئەسڵ باشییە: واتە ئەسڵ لە هەموو موسڵمانێکدا باشییە، هەتاوەکو بەڵگەیەکی صەحیح دێت لە باشیەوە لای دەدات بۆ خراپی. نەك بە قسە و باس، بەڵکو بە بەڵگە، بە بەڵگەی تەنهاش نا، دەبێ صحیحەکەشی لەگەڵدا بێ: بە بەڵگەی صحیح. (وەرگێڕ)

# باسی یەکەم

## بەیعەتدان بە یەزید و ڕەفزکردنەوەی لە لایەن حوسەینەوە پاشان دەرچوونی لە مەککەوە بەرەو کوفە

لە ساڵی ٦٠ی کۆچی و لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا بەیعەت درا بە یەزیدی کوڕی موعاویە، بەڵام حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بەیعەتیان پێنەدا، کاتێك داوایان لێکرا بەیعەت بدەن، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر وتی: ئەم شەو بیرێکی لێدەکەمەوە و بەیانی ڕای خۆمتان پێ ئەڵێم، وتیان: باشە، ئیتر هەر کە شەو داهات لە مەدینەوە بەرەو مەککە هەڵهات و بەیعەتی نەدا.

کاتێك هاتن بۆ لای حوسەینی کوڕی عەلی، وتیان: بەیعەت بدە.

وتی: من بە نهێنی بەیعەت نادەم، بەڵکو بە ئاشکرا و بە پێش چاوی خەڵکیەوە بەیعەت ئەدەم.

وتیان: باشە، ئەویش هەر کە شەو هات، بە دوای عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هەڵهات.

### * خەڵکی عێراق نامە بۆ حوسەین دەنێرن :

گەیشتە خەڵکی عیراق کە حوسەین بەیعەتی بە یەزیدی کوڕی موعاویە نەداوە، ئەمانیش یەزیدی کوڕی موعاویەیان ناوێت، بەڵکو معاویەشیان ناوێت، تەنها عەلی و کوڕەکانی نەبێت -ڕەزای خوایان لێبێت- کەسیان ناوێت، ئەوە بوو هەر هەموویان نامەیان دەنارد بۆ حوسەینی کوڕی عەلی و تێیدا دەیان نوسی: ئێمە بەیعەتمان بە تۆ داوە و تۆ نەبێت کەسمان ناوێت و بەیعەتی یەزیدیش لە گەردنمان نەما بەیعەتەکەمان بۆتۆیە، ئیتر نوسراو و نامەکان ئەوەندە زۆر بوون

گەیشتنە زیاتر لە پێنج سەد نامە، هەر هەمووی لە خەڵکی کوفەوە دەهات و داوایان لێدەکرد بێت بۆ لایان.

*** حوسەین موسلیمی کوڕی عەقیل دەنێرێت :**

بۆ ئەو مەبەستە حوسەینی کوڕی عەلی، کوڕی مامەکەی موسلیمی کوڕی عەقیلی کوڕی ئەبوتالبی نارد بۆ هێنانی هەواڵ و ڕاستی و ڕوونی مەسەلەکە، کە موسلیمی کوڕی عەقیل گەیشتە کوفە دەستی کرد بە پرسیار کردن، بۆی دەرکەوت خەڵکی یەزیدیان ناوێ و حوسەینی کوڕی عەلیان دەوێت، دوایی لە ماڵەکەی هانیئی کوڕی عورروەدا مایەوە، ئیتر خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ و تاك تاك دەهاتن و بەیعەتیان دەدا بە موسلیمی کوڕی عەقیل لە جیاتی حوسەینی کوڕی عەلی ڕەزای خوا لە هەموویان بێت.

لەوکاتەدا نوعمانی کوڕی بەشیر ئەمیری کوفە بوو، هەرکە هەواڵەکەی پێگەیشت، وا موسلیمی کوڕی عەقیل لە بن دەستیانە و خەڵك دێن و لە جیاتی حوسەین بەیعەتی پێ دەدەن، وای پیشاندا کە هیچی نەبیستووە و پەی بەو باسە نەبردووە، کار گەیشتە ئەوەی هەندێك لەدەور و دەستەکەی چوون بۆلای یەزید و هەواڵەکەیان پێدا، کە خەڵك بەیعەت دەدەن بە موسلیم و نوعمانی کوڕی بەشیریش خۆی کەڕ کردووە.

*** عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد دەکرێت بە ئەمیری کوفە :**

بەوهۆیەوە یەزید فەرمانی دا نوعمانی کوڕی بەشیر لەسەر کار لابرێت و عوبەیدوڵڵای زیادی کرد بە ئەمیری کوفە، خۆی ئەمیری بەسرە بوو کوفەشی خستە پاڵی تا ئەم کێشەیە چارەسەر بکات، ئەوەبوو عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد لە شەودا گەیشتە کوفە و دەم و چاوی هەلپێچابوو، هەر کە بەلای خەڵکێکدا

تێدەپەڕی و سەلامی لێدەکردن دەیانوت: وعليك السلام، ئەی کچەزاکەی پەیامبەری خوا ﷺ، وایان دەزانی حوسەینە و بەنهێنی و دەم هەڵپێچراوی هاتووە، ئیتر عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد زانی مەسەلەکە جدیە و خەڵکیش چاوەڕێی حوسەینی کوڕی عەلی دەکەن، گەڕایەوە کۆشکەکەی، خزمەتکارێکی خۆی نارد بەڵکو هەواڵێکی مەسەلەکە بێنێ و بزانێ سەر مەسەلەکە کێ بەڕێوەی دەبا؟

ئەویش ڕۆیشت بەو پێیەی کە ئەم پیاوە لە ناوچەی (حمص)ـەوە هاتووە و سێ هەزار دیناری پێیە بۆ یارمەتیدانی حوسەین ﷺ، ئا بەو شێوەیە دەستی کرد بە پرسیارکردن تاماڵەکەی هانیئی کوڕی عوروەیان پیشاندا، کە چووە ژورە موسلیمی کوڕی عەقیلی بینی و بەیعەتی پێدا و سێ هەزار دینارەکەشی پێدا، بەو شێوەیە چەند ڕۆژێك سەردانی کردن هەتا بە تەواوی زانی چیان بەدەستەوەیە، پاشان گەڕایەوە لای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد و دەنگ و باسەکەی بۆ گێڕایەوە.

* **دەرچوونی حوسەین ﷺ بۆ کوفە :**

دوای سەقامگیر بوونی بارودۆخەکە و بەیعەتدانی خەڵکێکی زۆر بە موسلیمی کوڕی عەقیل، ناردی بە دوای حوسەیندا کە بەڕێ بکەوە کاروبارەکە ئامادە باشە، ئەوەبوو حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ لە ڕۆژی تەرویەدا دەرچوو بەروە و کوفە، عوبەیدوڵڵاش بەو کارەی موسلیمی کوڕی عەقیلی زانی بوو بۆیە گوتی: هانیئی کوڕی عوروەم بۆ بێنن، ئەوانیش هێنایان و پرسیاری لێکرد:

موسلیمی کوڕی عەقیل لە کوێیە؟ وتی: نازانم.

ئەویش بانگی (مەعقەل)ی خزمەتکاری هانیئی کرد، کە هاتە ژورەوە، پێی وت: ئەمە دەناسی؟ وتی: بەڵێ، کە ناسیەوە پەشیمان بوویەوە و زانی مەسەلەکە

فێڵی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد بووە، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد پێی وت: موسلیمی کوڕی عەقیل لە کوێیە؟!

وتی: بەو خوایە ئەگەر لە ژێر پێکانم بێت بەرزی ناکەمەوە، کە وای ووت عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد پیای کێشا و فەرمانی دا زیندانی بکرێ.

*** خەڵکی کوفە پشتی موسلیمی کوڕی عەقیل بەر دەدەن:**

کە هەواڵەکە گەیشتە موسلیمی کوڕی عەقیل، بە چوار هەزار سەربازەوە لەگەڵ خەڵکی کوفەدا دەوری کۆشکەکەی عوبەیدوڵڵایاندا، جا لەوکاتەدا عوبەیدوڵڵا زۆرێك دەم سپیەکانی کوفەی لە لابوو، بۆیە پێی ووتن: ئەو خەڵکە لە موسلیمی کوڕی عەقیل پاشگەز بکەنەوە، بەڵێنی پارە و پوڵیشی پێدان و هەڕەشەی سوپای شامی لێکردن، ئەوەبوو ئەو دەم سپیانە دەستیانکرد بە هەڵگەڕانەوە و پاشگەز کردنەوەی خەڵك، ئیتر هەر دایکە و دەهات و کوڕەکەی خۆی ئەبردەوە، هەر پیاو و دەهات و براکەی خۆی ئەبردەوە، هەر سەرۆك خێڵە و دەهات و خەڵکی پاشگەز دەکردەوە، تا وای لێهات لە کۆی چوار هەزار کە لەگەڵی بوون، تەنها سی کەس مایەوە ! تەنانەت خۆری ئەو ڕۆژە ئاوا نەبوو موسلیمی کوڕی عەقیل تەنیا کەوت، خەڵك هەمووی ڕایکرد، وای لێهات بە ناو کۆڵانەکانی کوفەدا دەڕۆیشت نەیدەزانی بۆ کوێ بڕوات، تا دای لە دەرگای ماڵی ئافرەتێك لە خێڵی (کیندە) و پێی وت: ئاوم دەوێ؟ ئەویش پێی سەیر بوو، وتی: تۆ کێی؟ وتی: من موسلیمی کوڕی عەقیلم، هەواڵ و سەربوردەی خۆی بۆ گێڕایەوە، کە خەڵك لێی هەڵگەڕاونەتەوە و سەریان نەخستووە و پشتیان داوەتە ئاوە و حوسەینیش وا لە هاتننە، چونکە ئەم ناردبویە شوێنیە کە بکەوێتەڕێ، ژنەکە بردیە ماڵەوە و خانوویەکی چەپیان هەبوو لەوێی دانا و ئاوی بۆ هێنا، بەڵام کوڕەکەی هەستا و ئیخباری کرد، شوێنەکەی ووت بە عوبەیدوڵڵای کوڕی

زیاد، ئەویش هەفتا پیاوی بۆنـارد و دەوری ماڵەکـەیان گـرت، هەنـدێك شـەڕی لەگەڵ کردن بەڵام دواجار-دوای ئەوەی پەیمانی نەکوشتنی لێـوەرگرتن [خـۆی دا بەدەستەوە بردیان بۆ کۆشکی ئەمیر]-، کە ڕۆیشتە ژورەوە، عوبەیدوڵڵای کـوڕی زیاد هۆکاری ئەم خروجەی لێپرسی؟

وتی: بەیعەتێك لە گەردنماندایە بۆ حوسەینی کوڕی عەلی. ئەویش وتی: بـۆ مەگەر بەیعەتێکی یەزید لە گەردنتدا نییە؟ پاشان وتی: دەتکوژم.

موسلیم وتی: ڕێگە بدە با وەسیەت بکەم. وتی: باشە وەسیەت بکە، چـاوی گێڕا، عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی بینی، پێی وت: تۆ نزیکترین کەسی منی کە بە خزمایەتی بە من دەگەی وەرە با وەسیەتێکت بۆ بکەم، بردیە سوچێکی ژورەکەوە و پێی ووت کـە: کەسـێك بنێرێـت بـۆلای حوسـەین بـەڵکو بگەڕێتەوە، عومەری کوڕی سەعدیش ڕاستەوخۆ پیاوێکی نارد کە بـە حوسـەین ڕابگەیەنێت کار لەکار ترازاوە و خەڵکی کوفە فێڵیان لێکردووە.

موسـلیم لـەو کاتـەدا ووتـە بەنرخـە بەناوبانگەکـەی خـۆی ووت: (بـە خاوخێزانتەوە بگەڕێوە، خەڵکی کوفە فریوت نەدەن، لە ڕاسـتیدا خـەڵکی کوفـە درۆیان لەگەڵ تۆ ولەگەڵ منیش کرد، درۆزنیش خاوەن قسەی خۆی نییە ).

لە ڕۆژی عەرەفە موسلیمی کـوڕی عـەقیل کـوژرا، حوسـەینیش لـە ڕۆژی تەرویەدا کەوتبووە ڕێ، کـە دەکاتـە ڕۆژێـك پـێش کوشـتنی موسـلیمی کـوڕی عەقیل.

**بەرهەڵستی هاوەڵان لە دەرچوونەکەی حوسەین :**

زۆرێك لە هاوەڵان هەوڵیاندا نەهێڵن حوسەینی کوڕی عەلی بڕوات، لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، و ئەبو سەعیدی خودری، و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، و موحەممەدی کوڕی حەنەفیەی برای، هەموو ئەمانە کە زانیان حوسەین نیازی کوفەی هەیە ڕێگریان لێکرد، ئەمەش ووتەی هەندێکیانە:

**١. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس:**

کە حوسەین ویستی بڕوات، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پێی وت: لەبەر ئەوە نەبێت خەڵك گاڵتەمان پێ بکات، بە توندی دەمگرتی و نەمدەهێشت بڕۆی[1].

**٢. ئیبن عومەر:**

شەعبی دەڵێ: ئیبن عومەر لە مەککەدا بوو هەواڵی پێگەیشت کەوا حوسەین وا بەرەو عێراق ڕۆیشتووە، بە دووری سێ ڕۆژە ڕێوە خۆی گەیاندە حوسەین، وتی بۆ کوێ تەشریف ئەبەی؟

ئەویش وتی: بەرەو عێراق، پاشان نامەکانی خەڵکی عێراقی پیشاندا و وتی: ئەوە نامە و بەیعەتەکانیانە -(فریویان دابوو ڕەزای خوای لێبێ-. ئیبن عومەر وتی: مەڕۆ، حوسەین قایل نەبوو.

(١) (البداية والنهاية) (٨/١٦١).

پاشـان وتـی: دەی فەرمودەیـەکت بـۆ دەگێڕمـەوە، جوبرەئیـل هاتـە لای پەیامبەر ﷺ سەرپشکی کرد لە نێوان دونیا و ئـاخیرەت، پەیامبـەری خـوا ﷺ ئاخیرەتی هەڵبژارد و دونیای نەویست، تۆش پارچە گۆشتێکی لـەو (إنـك بضـعة منه)، دە بەخوا هەرگیز کەستان ئەم کارە ناگرێتە دەست، خـوای گـەورەش ئـەم کارەی لێ لانەداون مەگەر بۆ خێـری خۆتـان نـەبێ، بـەڵام هـەر ئامـادە نـەبوو بگەڕێتەوە، عەبدوڵڵا دەستی کردە ملی و گریا و پێی وت: ( أستودعك الله مـن قتيل ).

## ٣. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر:

بە حوسـەینی وت: بـۆ کـوێ تەشـریف ئەبـەی؟ دەڕۆی بـۆلای خـەڵکانێك باوکتیان کوشت و دایان لە براکەت ! مەڕۆ[١]، بەڵام حوسەین قایل نەبوو.

## ٤. ئەبو سەعیدی خودری:

وتی: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا من ئامۆژگاریت دەکەم و دڵـم بـۆت دەسـوتێ، لـە ڕاستیدا پێم گەیشتووە کەوا خەڵکانێك لە سـەرخەرانی خۆتـان لـە کوفـە داوات لێدەکەن بڕۆی بۆلایان، نەکەی بڕۆی، چونکە گوێم لە بابت بوو لە بارەی کوفـەوە دەیوت: بەخوا بێزارم لێیان و ڕقم لێیانە، ئەوانیش لە من بێزارن و ڕقیان لێمـە و هەرگیز وەفایان لێ نابینی وە هەرکـەس بـەوان بباتـەوە ئـەوا بەشـێکی دۆڕاوی بردۆتەوە، بەخوا نە عەزمیان هەیە لەکاروباردا، نە ئارام دەگرن لەژێر شمشێردا[١].

---

(١) (البداية والنهاية) (١٦٣/٨).

(١) (البداية والنهاية) (١٦٣/٨).

* هەروەها لەو کەسانەی کە بە حوسەینیان ووت نەڕوا بۆ کوفە، لە غـەیرە صەحابە:

**فەرەزدەقی شاعیر**، دوای ئەوەی حوسـەین کەوتـە ڕێ گەیشـتە فـەرەزدەقی شاعیر، پێی وت: لە کوێوە؟ ئەویش وتی: لە عێڕاقەوە، وتی: ئەی دەنگ و باسی خەڵکی عێڕاق چۆنە؟

وتی: دڵیان لەگەڵ تۆیە و شیرەکانیان لەگەڵ بەنی ئومەییـە، بەمـەیش ڕازی نەبوو و وتی: خوا پشت و پەنایە(١)

* **حوسەین دەگاتە قادسیە:**

هەواڵی موسلیمی کوڕی عەقیل لە ڕێگـەی ئـەو نێـردراوەی کـە عومـەری کوڕی سەعد ناردبووی گەیشتە حوسەین، حوسەین ویستی بگەڕێتەوە، پرسـێکی بە کوڕەکانی موسلیمی کوڕی عەقیل کرد، ئەوان وتیان: نـە بـەخوا ناگەڕێینـەوە هەتا تۆڵەی باوکمان نەکەینەوە، حوسەینیش هاتە سەر ڕەئی ئەوان، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد دوای ئەوەی بەدەرچوونی حوسەینی زانی، فەرمانیدا بە حوڕڕی کوڕی یەزیدی تەمیمی کە لە پێشەوە بە هەزار سەربازەوە بـڕوات ڕێگـە بـە حوسـەین بگرێت، ئەوەبوو لە نزیك قادسیە گەیشتە حوسەین.

حوڕ پێی وت: بەرەو کوێ ئەی کچەزاکەی پەیامبەری خوا ؟!

وتی: بەرەو عێڕاق.

(١) (البداية والنهاية) (٨/١٦٨).

ئەویش وتی: کەواتە بگەڕێوە و باخوا بە تۆ گیرۆدەم نەکات، بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووی، یان بڕۆ بۆ شام بۆلای یەزید، بەس بەرەو کوفە مەیە.

حوسەین قایل نەبوو و دەستی کرد بە ڕۆیشتن بەرەو عێراق، حوڕڕی کوڕی یەزیدیش دەهاتە پێشیەوە و ڕێی پێ نەدەدا.

حوسەین پێی وت: لێم دوورکەوە لە بار دایکت چی.

حوڕری کوڕی یەزید وتی: دەی سوێند بەخوا هەر عەرەبێکی تر ئەو قسەیەی بکردایە، تۆڵەم لە خۆیی و دایکیشی دەکردەوە، بەس چی بڵێم دایکت گەورەی ئافرەتانی دونیایە.



# باسی دووەم

## کوشتنی حوسەین رضي الله عنه

*** حوسەین دەگاتە کەربەلا:**

حوسەین لە شوێنێك وەستا پێی دەگووترا کەربەلا (كَرْبلاءُ ).

پرسیاری کرد ئەم شوێنە ناوی چی یە؟ وتیان: كَرْبلاء.

وتی: كَرْبٌ وَبَلاءٌ، سەخڵەتی و مەینەتی.

کاتێك سوپاکەی عومەری کوڕی سەعد گەیشت کە ژمارەیان چوار هەزار سەباز دەبوو، قسەی لەگەڵ حوسەیندا کرد و پێی ووت کە لەگەڵیدا بڕوات بۆ عێراق لای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، ڕازی نەبوو. بەڵام کە بینی مەسەلەکە جیددیە، بە عومەری کوڕی سەعدی وت: من سەرپشکت دەکەم لە نێوان سێ شتدا، یەکێکیان لە بۆ خۆت هەڵبژێرە. وتی: چییە؟

وتی: یان ئەوەتا ڕێگەم بدەی بگەڕێمەوە، یان ئەڕۆم بۆ ثەغرێك[1] لە ثەغرەکانی موسڵمانان، یان ئەڕۆم بۆلای یەزید لە شامدا و دەستم دەخەمە نێو دەستی. عومەری کوڕی سەعد وتی: باشە تۆ یەکێك بنێرە بۆلای یەزید، منیش یەکێك دەنێرم بۆلای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، تا بزانین چی ئەبێت، حوسەین

(١) ناوچە سنوریەکانە کە مەترسی دزەکردنی لێوە دەکرێ، جا حوسەین پێشنیاری ئەوەی کرد بەڵکو بڕوا بۆ جیهاد کردن، بەڵام زیاد قایل نەبوو. (وەرگێڕ)

کەسی نەنارد، بەڵام عومەری کوڕی سەعد نێردراوێکی نارد بۆلای عەبەیدوڵڵای کوڕی زیاد.

نێردراوەکە گەیشت و حاڵ و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، کە حوسەین دەڵێ: لە نێوان ئەم سێ شتەدا سەرپشکتان دەکەم، ئیبن زیاد ڕازی بوو بە هەرکام لەوانەی حوسەین هەڵی دەبژێرێت، بەڵام لەلای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد پیاوێك هەبوو بەناوی (شەمری کوڕی زیلجەوشەن)، کە یەکێك بوو لە دار و دەستەکانی ئیبن زیاد، ئەو وتی: نە بەخوا شتی وا نابێ، ئیلا ئەبێ بە حوکمی تۆ ڕازی بێ. عوبەیدوڵڵا بەم قسەیەی فریوی خوارد و وتی: بەڵێ، ئەبێت بە حوکمی من ڕازی بێت[1].

ئەوەبو عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد هەستا بەناردنی شەمری کوڕی زیلجەوشەن وپێی وت: بڕۆ هەتا ڕازی دەکەیت بە حوکمی من، ئەگەر عومەری کوڕی سەعد بەمە ڕازی بوو باشە.

وەگەرنا ئەوە تۆ لە جێگەی ئەو دەبیتە سەرکردەی سوپا.

جا ئیبن زیاد، عومەری کوڕی سەعدی بە چوار هەزار سەربازەوە ئامادە کردبوو بۆ ڕۆیشتن بۆ ناوچەی (ڕەی) و پێی وت: مەسەلەکەی حوسەین تەواو بکە و پاشان لەوێوە بڕۆ بۆ ڕەی، بەڵێنیشی پێ دابوو بیکا بە والی ڕەی.

---

(١) مەبەست لە (ئەبێت بە حوکمی من ڕازی بێت) واتە: دێت بۆ کوفە و لەوێوە خۆم بەڕێی دەخەم ئیتر بۆ کوفە بێت یان بۆ پەغر یان دەیگەڕێنمەوە بۆ مەدینە، یا بۆ هەر کوێیەك، ئەگەر کوشتنیش بێ.. (وەرگێڕ)

شەمری کوڕی زیلجەوشەن کەوتە ڕێ، هەواڵەکە گەیشتە حوسەین، کە هەر ئەبێت بە حوکمی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد ڕازی بێت، بەرپەچی دایەوە و وتی: (نەخێر بەخوا هەرگیز بە حوکمی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد ڕازی نابم).

*** حوسەین ئامۆژگاری سوپای کوفە دەکا و خوایان بیر دێنێتەوە:**

ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ حوسەیندا بوون هەفتا و دوو سوار بوون و سوپای کوفەش پێنج هەزار دەبوون، کە هەر دوولا بەرانبەر یەك ڕاوەستان، حوسەینی کوڕی عەلی وتی: بە خۆتانا بچنەوە و موحاسەبەیەکی نەفسی خۆتان بکەن، دەکرێ خەڵکانی وەك ئێوە لەگەڵ ئەمسالی مندا بجەنگێ؟ من کچەزای پەیامبەرەکەتانم، لە کاتێکدا ئێستا هەموو سەر زەوی کچەزای پەیامبەرێکی تێدا نییە جگە لە من نەبێ، پەیامبەری خواﷺ بە من و براکەمی فەرموو: (ئەم دووانە گەورەی گەنجانی بەهەشتن)[(1)]

ئیتر بەردەوام هەر هانی دەدان کە واز لە عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادبێنن و بێنە پاڵ وی، ئەوەبوو سی کەسیان دایانە پاڵ حوسەین لەوانە حەڕڕی کوڕی یەزیدی تەمیمی سەرکردەی پێشەکی سوپاکەی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد. بە حەڕڕی کوڕی یەزیدیان وت: تۆ وەکو سەرکردەی پێشەکی سوپاکە لەگەڵمان هاتی، ئێستا دەڕۆیتە پاڵ حوسەین؟!!

---

(١) (أخرجه الترمذي) كتاب مناقب، باب مناقب الحسن والحسين، حديث (٣٧٦٨)، وهو ضعيف من رواية الحسين، ولكنه صحيح من رواية حذيفة و أبي سعيد وغيرهما.

ئەویش وتی: **تیابچن، سوێند بەخوا ئەمن نەفسی خۆم سەرپشك دەكەم لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا**، دەی بەخوا هیچ شتێك بەسەر بەهەشتدا هەڵنابژێرم، ئەگەر لەت لەت بكرێم و بسوتێنرێم.

دوای ئەوە لە ڕۆژی پێنج شەممە هەردوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەجێهێنا، پێش نوێژی بۆ هەردوو لا كرد، هەم بە سوپاكەی عوبەیدوڵڵای كوڕی زیاد، هەم بەوانەی لەگەڵیدا بوون، لە پێشدا پێی ووتن: خۆتان بەرنوێژی بۆخۆتان بكەن و ئێمەش بۆ خۆمان. وتیان: نابێ، ئێمەش نوێژ لە دوای تۆوە دەكەین، ئیتر نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان لە دوای حوسەینەوە كرد، كە نزیكی ئێوارە بوویەوە بە سوارەكانیانەوە هاتنە پێشەوە، حوسەین هەندێكیش خەوتبوو هەركە بینیانی وتی: ئەمە چی یە؟ وتیان: قوربان بۆ پێشەوە دێن، وتی: بڕۆن قسەیان لەگەڵ بكەن، بزانن چیان دەوێ؟

بیست سوار ڕۆیشتن، لە نێوانیاندا عەبباسی كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تالبی برای حوسەینیان تێدا بوو، قسەیان لەگەڵ كردن و پرسیاریان لێكردن؟ ئەوانیش وتیان: یان ئەوەتا بە حوكمی عوبەیدوڵڵای كوڕی زیاد ڕازی دەبێ یان بجەنگێ.

وتیان: با بڵێین بە ئەبو عەبدوڵڵا، گەڕانەوە بۆلای حوسەینﷺو پێیان ووت، وتی: ئەمشەو سەبرمان لێبگرن سبەی هەواڵتان دەدەینێ، **با نوێژ بكەم، حەزم لە نوێژكردنە بۆ پەروەردگاری پاك و پیرۆزم**، ئیتر ئەو شەوە هەتا بەیان هەر خەریك نوێژ و استغفار و دوعاكردن بوو، ئەو و ئەوانەشی لەگەڵیدا بوون -ڕەزای خوا لە هەموویان بێ-.

### * ڕووداوی طه ف ساڵی ٦١ ك:

لە بەرە بەیانی ڕۆژی هەینیدا دوای ئەوەی حوسەین ڕازی نەبوو ببێتە دیلی ژێر دەستی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، جەنگ لە نێوان هەردوو لادا دەستی پێکرد، هەر دوو تاکە هاوسەنگ نەبوون، بۆیە هەرکە هاوەڵەکانی حوسەین زانیان توانای ئەم سوپایەیان نییە، هەموو خەمێکیان بووە پاراستنی حوسەین ﷺ، ئەوەبوو یەك لە دوای یەك لە دەور دەستی دەکوژران، هەتا کەسیان نەمایەوە جگە لە حوسەینی کوڕی عەلی خۆی نەبێت ﷺ. عەلی کوڕیشی نەخۆش بوو.

دوای ئەوە حوسەین بە درێژایی ئەو ڕۆژە هەروا مایەوە، کەس نەیدەوێرا بڕواتە پێشەوە بەشکو بگەڕێتەوە، کەس نەیدەویست ببێتە هۆی کوشتنی، ئەمە هەر بەردەام بوو، هەتا شەمری کوڕی زیلجەوشەن هات و هاواری کرد تیاچن، لەبار دایکی خۆتان چن، دەوری دەن و بیکوژن، ئەوانیش هاتن و دەوریان گرت، حوسەینیش زۆر بە جوامێرانە بە شمشێرەکەیەوە بە نێوانیاندا دەڕۆیشت، زۆرێکی لێیان کوشت، وەکو شێر بوو، بەڵام زۆری لە زیرەکی دەباتەوە.

شەمر هاواری تێکردن: تیا بچن ئەوە چاوەڕوانی چین ؟! پەلاماری بدەن. ئەوانیش چوونە پێشەوە بۆی و کوشتیان. جا ئەوەی کە حەسەنی کوڕی عەلی کوشت و دەستی ڕاستەوخۆی تیا هەبوو: سینانی کوڕی ئەنەسی نەخعی بوو، سەری لە لاشەی کردەوە، هەندێکیش دەڵێن: شەمر بووە، خوا ڕوویان ڕەشکا.

دوای ئەوەی کوژرا سەریان برد بۆ عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد لە کوفە، عوبەیدوڵڵا بەو چوکڵەی کە بە دەستیەوە بوو پیای دەکێشا و دەیخستە نێو لوتیەوە، ئەوەبوو ئەنەسی کوڕی مالك هەستا و وتی: بە خوا خراپت لەگەڵ

دەکەم، ئەمن پەیامبەری خوام بینی ﷺ ماچی شوێنی چوکڵەکەی تۆی دەکرد[١].

ئیبراهیمی نەخعی ئەڵێ: ئەگەر لە بکوژانی حوسەین ببوایەم و پاشان بخرایەمە بەهەشتەوە ڕووم نەدەهات بە لای پەیامبەری خوادا ﷺ بڕۆم و بمبینێت[٢].

* **کێ لە خانەوادەکەی حوسەین کوژرا؟**

* **لە منداڵەکانی عەلی کوڕی ئەبو تالب:** حوسەین خۆی، جەعفەر، عەبباس، ئەبوبەکر، موحەممەد، عوسمان کوژرا.

* **لە منداڵەکانی حوسەین:** عەبدوڵڵا، عەلی گەورە (زەینولعابدین نا).

* **لە منداڵەکانی حەسەن:** عەبدوڵڵا، قاسم، ئەبوبەکر.

* **لە منداڵەکانی عەقیل:** جەعفەر، عەبدوڵڵا، عەبدولڕەحمان، عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی کوڕی عەقیل، موسلیمی کوڕی عەقیل خۆیشی لە کوفە کوژرا.

* **لە منداڵەکانی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر:** عەون، موحەممەد[٣] هەژدە کەس بس لە ئال و بەیتی پەیامبەر ﷺ لەم جەنگە ناهاوتایەدا کوژران.

---

(١) (المعجم الكبير) للطبراني، (٥/ ٢٠٦ رقم ٥١٠٧)، وانظر: (صحيح البخاري (كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب الحسن والحسين حديث (٣٧٤٨)

(٢) ( المعجم الكبير) للطبراني، (٣/١١٢رقم: ٢٨٢٩) وسنده صحيح.

(٣) (تاريخ خليفة بن خياط) (ص ٢٣٤).

### * ئەو پێشەکیانەی ئاماژەن بۆ کوشتنی حوسەین رضي الله عنه:

لە ئوم سەلەمەوە دەڵێ: جوبرەئیل لە لای پەیامبەری خوا بوو ﷺ وحوسەینیش لای من بوو، حوسەین دەستی کرد بە گریان منیش بەرمدا و ڕۆیشتە ژورەوە بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ، جوبرەئیل فەرمووی: ئەی موحەممەد خۆشیت دەوێ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی: دەی ئوممەتەکەت دەیکوژن، ئەگەریش ئەتەوێ لە خۆڵی ئەو شوێنەت پیشان دەدەم کە تیایدا دەکوژرێت، پیشانیدا، بینی شوێنێکە پێی دەوترێت کەربەلا[1]

هەر لە ئوم سەلەمەوە دەڵێ: گوێم لە جنۆکە بوو کاتێك حوسەین کوژرا شیوەنیان دەکرد[2].

بەڵام ئەوەی کە ڕیوات دەکرێ کەوا لە ئاسمانەوە خوێن باریوە، یان ئەوەی دیوارەکان خوێناوی بوون، یان بەردێك بەرز نەدەکرایەوە ئیلا ژێرەکەی هەر خوێن بوو، یان هەر وشترێکیان سەر ببڕایە هەمووی دەبووە خوێن، ئەمانە هەر هەمووی درۆ و دەلەسە و قسەی پوچن، ڕچەیەکی صەحیحی نییە نە بۆ پەیامبەری خوا ﷺ نە بۆ یەکێك لەوانەی کە هاوچەرخی ڕوداوەکە بوون، تەنانەت چەعیفیش نییە، تەنها درۆیەکە و بۆ وروژاندنی هەست و سۆز دەکرێ. ڕیوایەتانێکی سەنەد پچڕاون[3] و نەگەیشتونەتە ڕوداوەکە[4].

---

(١) (فضائل الصحابة) (٢/٧٨٢ رقم ١٣٩١)، فەرمودەیەکی مەشهوریشە بەڵام لە هەموو ڕێگاکانیەوە لە ئوم سەلەمەوە ضعیفە.

(٢) (فضائل الصحابة) (٢/٧٦٦ رقم ١٣٧٣) وسندە حسن.

(٣) بۆ زانینی واتای منقطع بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە ٢٤..

(٤) راجع (البداية و النهاية )، أحداث سنة ٦١هـ.

هەروەها لە ئیبن عەبباسەوە ئەڵێ: لە خەودا پەیامبەری خوامﷺ بینی، لە نیوەڕۆیەکدا قژی خۆڵاوی و شێواو بوو، شوشەیەکی هەڵدەگرت خوێنی تێدا بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چییە؟ فەرمووی: خوێنی حوسەین و هاوەڵەکانێتی، لەو کاتەوە بە دواییدا ئەگەڕێم تا ئەمڕۆ. عەممار کە هەواڵخوانی فەرمودەکەیە دەڵێت: ئەمەمان لای خۆمان لەبەرکرد، دوای بینیمان حوسەین لە هەمان ئەو ڕۆژەدا کوژرا[1] هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (هەرکەس بمبینێ لە خەودا، ئەوا بەڕاستی منی بینیوە )[2].

جا ئیبن عەبباسیش شارەزاترین کەسە بە شێوە و ڕوخساری موبارەکی پەیامبەری خوا ﷺ[3].

## سزای دونیا پێش دوارۆژ:

ئەو کەسەی وا فەرمانی کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلیدا عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد بوو، بەڵام زۆری نەبرد یەکسەر کوشتیان، موختاری کوڕی ئەبی

---

(١) ( فضائل الصحابة) (٢/٧٨٨ رقم ١٢٨٠)، واسناده صحيح.

(٢) (فضائل الصحابة) (٢/٧٨٨ رقم ١٢٨٠)، واسناده صحيح.

(٣) بینینی پەیامبەری خوا ﷺ لە خەودا بە تەنها بەس نییە، بەڵکو دەبێت ئەوەی لەخەودا بینیوتە شێوە و ڕوخساری هەمان شێوە و ڕوخساری پەیامبەری خوا بێت ﷺ لە ژیانیدا، بەو شێوازە بێت کە لە کتێبەکانی سیرەدا ڕوون کراوەتەوە. بۆ نموونە: کەسێك پەیامبەری خواﷺ دەبینێ لە خەودا لە شێوەی پیاوێکی کورتە بالآ، یا لەڕ و لاواز، یا ڕیش سپی یا..، ئەمە پەیامبەری خوا ﷺ نییە، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ شێوەی وا نەبووە... نە بالآی کورت بووە، نە لاواز بووە، بەڵکو چوار شانەیەك بووە (ڕوح و ماڵم فیدای بێ) تەنانەت هەموو تاڵە سپیەکانی ڕیشی موبارەکی نەگەیشتۆتە بیست تاڵ، جا ئاگادار بە. (وەرگێڕ)

عوبەید هەستا کوشتی و تۆڵەی حوسەینی لێ سەندەوە، جا ئەم موختارە لەو کەسانەبوو کە پشتی موسلیمی کوڕی عەقیلی بەردا و پاشگەز بوویەوە.

هەربۆیە ئەم کارە بۆ خەڵکی کوفە تۆڵە سەندنەوە بوو لە نەفسی خۆیان، چونکە :

**یەکەم:** ئەوان پشتی موسلیمی کوڕی عەقیلیان بەردا، تا کوشتیان و کەسیشیان جوککەی لێوە نەهات.

**دووەمیش:** کاتێك حوسەین دەرچوو کەسیان بەرگریان لێنەکرد، تەنها حورڕی کوڕی یەزیدی تەمیمی و هاوەڵەکانی نەبێت، بەڵام خەڵکی کوفە ئەوان وازیان لێهێنا، هەر بۆیە دەبینیت سینە دەکوتن و ئەوە دەکەن کە دەیکەن، هەمووی بۆ سڕینەوەی ئەو هەڵەیەی باو و باپیرانە هەروەك خۆیان ئەڵێن[1].

عومارەی کوڕی عومەیر ئەڵێ: سەری عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد و دار و دەستەکەیان هێنا و لە مزگەوتەکەی ( ڕەحبە )دا ڕیز کران، دەڵێ: کە گەیشتمە لایان گوێم لێبوو دەیانوت ئەوە هات، ئەوە هات، بینیم مارێکە، بەنێو سەرەکاندا دەڕۆیشت تا چووە نێو لوتی عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادەوە، کەمێك

---

(١) ئەو سوپای موختارەی کە تۆڵەی حوسەینیان کردەوە ناوی خۆیانیان نابوو( التوابین) (تۆبەکاران)، وەکو دان پێدانانێك بەو کەمترخەمیەی لە ئاست حوسەین کردیان، ئەمەش سەرەتای دەرکەوتنی شیعە بوو وەکو مەزهەبێکی سیاسی، بەڵام دەرکەوتنی شیعە وەکو مەزهەبێکی فیکری و فیقهی دوای ئەوە دەرکەوت دەمێك دوای ڕوخانی دەوڵەتی بەنی ئومەییە بوو.

مایەوە و پاشان هاتە دەر و چوو تا دیاری نەما، پاشان هەم وتیان: ئەوە هاتەوە، ئەوە هاتەوە، هەمان کاری دووبارە یان سێ بارە کردەوە[١].

ئەمەش تۆڵەیەکی خوایی بوو لەم پیاوەی کردەوە کە دەستێکی گەورەی هەبوو لە کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلی دا رضي الله عنه.

هەروەها لە ئەبی ڕەجائی عەتارەدیەوە وتوویەتی: جوێن بە عەلی و ئەو خانەوادەیە مەدەن، ئێمە هاومالێکی (بەلهوجین)یان[٢] هەبوو وتی: ئەم فاسقە - حوسەینی کوڕی عەلی- نابینن خوا کوشتی، ئەبو ڕەجا دەڵێ: ئەوەبوو خوای گەورە سپیاییەکی تووشی چاوی کرد و کوێری کرد[٣]

❊ ❊ ❊

---

(١) (جامع الترمذي) كتاب المناقب، باب مناقب الحسن و الحسين، حديث(٣٧٨٠)، واسناده صحيح.

(٢) هۆزێکە لە هۆزەکانی عەرەب.

(٣) (المعجم الكبير) (١١٢/٣ رقم ٢٨٣١) وسنده صحيح.

# باسی سێیەم

## کێ حوسەینی کوشت رضي الله عنه ؟

پێش ئەوەی بکوژانی حوسەین بناسین، وەرە با چەند ساڵێك بگەڕێینەوە دواوە بۆ لای عەلی و حوسەین لەگەڵ شیعەکەیاندا، [شیعە لێرە واتە سەرخەر و لایەنگر][1]:

### ١. عەلی رضي الله عنه :

سکاڵا لە دەست شیعەکەی دەکات (لە خەڵکی کوفە) و ئەڵێ: (لە ڕاستیا هەموو گەلێك لە ستەمی کاربەدەستانی ترساوە، بەڵام من وام لێهاتووە لە ستەمی ژێر دەستەکانم دەترسم، وتم دەرچن بۆ جیهاد دەرنەچوون، وتم گوێ بگرن گوێتان نەگرت، بە نهێنی و بە ئاشکرا بانگم کردن دەنگتان نەبوو، ئامۆژگاریم کردن وەرتان نەگرت، بۆ ئێوە ئامادەن بەس وەك نەبوو، بەندەن وەك خاوەن بەندە؟ حیکمەتتان بۆ باس دەکەم لێی ڕادەکەن، بە ئامۆژگاری چاك ئامۆژگاریتان دەکەم بڵاوەی لێدەکەن، قسەتان بۆ دەکەم و هانتان دەدەم لە بۆ جیهادی خەڵکانی زۆردار کەچی ناگەمە کۆتایی وتەکانم سەبەئیانە[2] هەریەك بۆلایەك بڵاوەی

---

(١) گرنگی ئەم چەند ووتانە -چی ئەوەی عەلی بێ یان ئەوانەی حەسەن و حوسەین ڕەزای خوا لە هەمویان بێ- لەوەدایە کە هەمووی تەنها لە کتێبی شیعە موبتەدیعەکانەوە ڕیوایەت دەکات - بە بێ ئەوەی ناوی یەك کتێبی ئەهلی سوننە بێنێت، لە سەرووی هەموویانیشەوە کتێبی (نهج البلاغة) کە پێگەی ئەو کتێبە لە نێویاندا زانراوە و شاراوە نیە، جا منیش بۆ ڕاڤەی وتەکان پشتم بە کتێبی (نهج البلاغة) بە شەرحی محمد عەبدە بەستووە.(وەرگێڕ)

(٢) پەندێکی عەرەبیە، بۆ پەرش و بڵاوی و تەفرەقە دەهێنرێتەوە، لسان العرب (سبأ).

لێدەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ مەجلیسی خۆتان و خۆتان لە ئامۆژگاریەکانتان گێل دەکەن، بەیانی ڕاستان دەکەمەوە کەچی ئێوارە دەگەڕێنەوە بۆلام وەکو قەوس لار بوونەتەوە، ڕاستکەرەوە وەڕس بوو ڕاستکراوەیش یاخی بوو، ئەی ئەوانەی بە لاشە ئامادەن بە عەقڵ لێرە نین، هەوەس و ئارەزو جیاوازەکان، ئەی ئەوانەی کە والیەکانتان بە دەستانەوە گیر هاتوون، هاوڕێکەتان [مەبەستی خۆیەتی] گوێڕاڵی خوا دەکا و ئێوەش سەرپێچی دەکەن، بەڵام هاوڕێکەی شامتان سەرپێچی خوا دەکا کەچی خەڵکەکە هەر گوێڕایەڵێن، قەسەم بەخوا حەزم ئەکرد موعاویە ئێوەی بۆم بگوڕیبایەتەوە بە گۆڕینەوەی دینار بە درهەم، دەی لە ئێوە ببردایە و پیاوێکی لەوانی پێم بدایە، ئەی خەڵکی کوفە ئەمن گیرۆدەی سێ و دووانێ بووم بە دەستانەوە: کەڕی گوێدار، لاڵی قسەکەر، کوێری چاودار[1]، نە بەڕێز و دڵسۆز لەبەیەك گەیشتن، نە برادەری سیقەن لە ناڕەحەتی، دەستان بەخۆڵا چێ، ئەی هاوشێوەکانی وشتر کە چاودێرەکەی دیار نییە، تا لەلایەکەوە کۆیان دەکەیتەوە لە لاکەی ترەوە بڵاوەی لێ دەکەن )[2]

کارەکە بەمەوە نەوەستا تەنانەت تۆمەتی درۆشیان داوە پاڵی -پەنا بەخوا-.

شەریف ڕەزا لە ئەمیری بڕوادارانەوە عەلی ﷺ ڕیوایەت دەکا کە وتوویەتی: (أما بعد: ئەی خەڵکی عێراق ئێوە وەك ژنی سك پڕ وان، سکی پڕ بوو بێ و

---

سبأ لێرەدا: زانایانی زمان جیاوازیان هەیە کە لە چیەوە هاتووە و وەرگیراوە، ڕەئی پەسەند ئەوەیە واتە: وەك سەبەئیەکان کە گەلێکن لە کۆندا بە هۆی سەرپێچیانەوە خوا -سبحانە- لە ناوی بردون= =نسأل الله العافیة خوا خەشم و قینی خۆی لێگرتوون و تەفر و تونای کردوون و هەریەکە و بۆلایەك بڵاوەی لێکردووە. (وەرگێڕ)

(١) ئەمە سیانەکە دوای ئەوەش دوانەکەی ترە. (وەرگێڕ)

(٢) نهج البلاغە (١/١٨١-١٨٩) .

ماوەی تەواو بوو بێ پاشان بە مردوێتی منداڵەکەی دانابێ، پاشان مێردەکەی مردبێ و ماوەی بێوەژنیشی درێژەی کێشا بێ، ئینجا خزمە دوورەکانی میراتیان گرتبێ، دە بەخوا بە ئیختیاری خۆم نەهاتم بۆلاتان بەڵکو بەزۆر هاتم، جا پێم گەیشتووە کە ئەڵێن: عەلی درۆ ئەکات، خوا بتان کوژێت ! درۆ بە دەم کێوە ئەکەم )[1]ز

هەروەها ئەڵێ: (خوا بتان کوژێت ! بەڕاستی دڵمتان پڕ کرد لە کێم و زوخاو و سنگمتان پڕ کرد لە ڕق و کینە و هەناسەمتان هەمووی کرد بە غەم و خەفەت و ڕا وبۆچونی منتان بە سەرپێچی و سەرکزی خۆتان لێ تێك دام )[2].

## ٢. حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ :

ئەڵێ: (بەخوا وا ئەزانم موعاویە لە مانە بۆ من باشترە، وا ئەزانن لایەنگری منن؟ کەچی ویستیان بمکوژن، شتومەکەکانمیان تالان کرد، پارە وسامانەکەمیان برد، دە بەخوا ئەگەر موعاویە پەیمانێکم لێوەر بگرێ کە خوێنمی پێ بپارێزرێت و ئەمینم بکات لە ماڵ وخێزانەکەم ئەوا باشترە لەوەی بمکوژن، ئەوکاتە وخاوخێزانەکەشم لە دەست ئەچێت، خۆ ئەگەر لەگەڵ موعاویەدا کوشتار بکەم ئەوا ئەو کاتە دەکەن بە ملمدا و بە ئاشتی دەمخەنە ژێر دەستی)[3].

---

(١) نهج البلاغة (١/١١٨-١١٩).

(٢) نهج البلاغة (١/١٨٧ - ١٨٩).

(٣) الندوة (٣/٢٠٨) و (في رحاب أهل البيت) ص (٢٧٠).

هەروەها بە شیعەکەی خۆی ئەڵێ: (ئەی خەڵکی عێراق لەبەر سێ شت وازم لێ هێنان: کوشتنی باوکم و لێدانی من و تالآنکردنی شتومەکەکانم)[1].

*** غەدری خەڵکی کوفە کە بکوژی حوسەینن:**

موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالب کە ناسراوە بە ئیبنولحەنەفیە، ئەمیش ئامۆژگاری حوسەینی برای ﷺ کرد و پێ وت: برام ئەتۆ دەزانی ئەوان غەدریان لە بابت و براکەت کرد، جا ئەترسم حاڵی تۆش وەك حاڵی ئەوان بێ و بەدەردی ئەوان بڕۆی[2].

هەروەها شاعیری بەناوبانگ فەرەزدەق -کاتێك حوسەین پرسیاری ئەو شیعەیەی خۆی لێکرد، کە ئەم لە لایانەوە دێتەوە- فەرەزدەق وتی: (دڵیان لەگەڵتە و شیرەکانیان لەسەرتە، بەڵام فەرمان لە ئاسمانەوە دادەبەزێت و خوداش ئەوەی بیەوێ دەیکات، حوسەین وتی: (ڕاست دەکەی فەرمان هەر بۆ خودایە و هەموو ڕۆژێ ئەو لە کردنی کارێکدایە، خۆ ئەگەر قەزای خوا بە شێوەیەك هات کە ئێمە حەزمان لێ ئەکرد و پێی ڕازی بووین، ئەوا سوپاسی دەکەین لەسەر نیعمەتەکانی، هەر ئەویش پشت و پەنایە بۆ شوکرانە بژێری کردن، ئەگەریش وا نەبوو خۆ ئەگەر کەسێك نیەتی ڕاست بێ و بە نهێنی لە خوا ترس بێ دوور ناکەوێتەوە)[3].

---

(١) (لقد شيعني الحسين) ص (٢٨٣).

(٢) اللهوف لابن طاووس ص(٣٩)، عاشوراء للإحسائي ص ١١٥، المجالس الفاخرة لعبد الحسين ص ٧٥، منتهى الآمال ٤٥٤/١، على خطى الحسين ص ٩٦..

(٣) المجالس الفاخرة لعبد الحسين ص ٧٩، على خطى الحسين ص١٠٠، لواعج الأشجان للأمين ص٦٠، معالم المدرستين ٦٢/٣.

کاتێکیش حوسەین ﷺ قسەی لەگەڵ کردن ئاماژەی بۆ پێشینەیان کرد، کە چیان بەسەر باوك و براکەی هێناوە، لە وتارێکیدا ئەڵێ : (خۆ ئەگەر ئەوە نەکەن و پەیمانەکەتان بشکێنن و بەیعەتی من لە گەردنتان لادەن، ئەوە شتێکی سەیر نییە لە ئێوە، مەگەر بەسەر باوك و براکەم و موسلیمی کوڕی مامتان نەهێنا، بەڕاستی مەغرور ئەو کەسەیە بە ئێوە فریو بخوات)[1].

### ٣. عەلی کوڕی حوسەین ناسراو بە زەینولعابدین:

دائەبەزێتە سەر سەرخەرانیی (شیعە)کەیی و سەرزەنشتیان ئەکا و ئەڵێ: (ئەی خەڵکینە سوێندتان ئەدەم بەخوا دەزانن کە نوسراوتان بۆ باوکم نووسی و پاشان فێڵتان لێکرد، گفت و پەیمان و بەیعەشتان پێدا و پاشان لەگەڵی بەشەڕ هاتن و سەرشۆڕیتان کرد، دەك لە ناوبچێ ئەو کارەی وا کردوتانە، بۆ ڕەی خراپیتان، بە چ ڕوویەکەوە تەماشای پەیامبەری خوا دەکەن ﷺ کاتێك پێتان ئەڵێ: (عیترەتی منتان کوشت، ئابڕو (حورمەت)ی منتان برد، دە بڕۆن ئێوە لە ئومەتی من نین)، ئەوەبوو دەنگی گریانی ئافرەتان لە هەموو لایەکەوە بەرز بوویەوە وهەندێکیان بە هەندێکی تریان دەیوت: تیاچوونە و بەخۆتان نازانن.

پاشان وتی: (ڕەحمەتی خوا لە کەسێك ئامۆژگاریەکانم قبوڵ دەکات وە وەسیەتەکەم لە پێناوی خوا و پەیامبەر و ئەهلوبەیتەکەی دەپارێزێت، بێگومان لە پێغەمەری خوادا چاکترین نموونەی سەرمەشقی و چاولێکەری هەیە بۆ ئێمە).

هەر هەمویان وتیان: ئێمە هەمووومان گوێڕایەڵ و فەرمانداریین و دەستمان بە تۆوە گرتووە و پشتت لێ ناکەین و بەرنادەین، ڕەحمەتی خوات لێبێ فەرمانی

---

(١) معالم المدرستين ٣/٧١ ـ ٧٢، معالي السبطين ١/٢٧٥، بحر العلوم ١٩٤، نفس المهموم ١٧٢، خير الأصحاب ٣٩، تظلم الزهراء ١٧٠.

خۆتمان پێ بلّێ، ئێمە شەڕین لە بۆ شەڕت و ئاشتین لە بۆ ئاشتیت و دەدەین لە یەزید و تەبەڕا لەهەر کەسێك دەکەین ستەمی لێتکردبێ، ئەویش وتی: هەی هو، ئەستەمە ئەی خیانەتکار و فێڵبازینە، بە دەست نەفسی خۆتانەوە گیرتان خواردوە، دەتانەوێ بێنە دەم منەوە هەروەك بەدەم هاتنەوەتان بۆ باوباپیرانم لەوەو پێش؟ نە بە پەروەردگاری وشترانی سەماکار[1]، برینەکە ساڕێژ نەبووەتەوە، دوێنێ باوکم لەگەڵ خانەوادەکەی کوژرا، هەرگیز جەرگ بڕینەکەی پەیامبەر و ئالوبەیتەکەیی و باوکم و کوڕەکانی باوکمم لە نەبیر ناباتەوە، هێشتا شەیدا و هۆگریان لە زمانە چکۆلەمدایە، تاڵیی لە قوڕگ و گەرومدایە، خەم و خەفەتی لە سنگمدایە)[2].

هەروەها کاتێك بە لای خەڵکی کوفەدا تێپەڕی، بینی شیوەن دەکەن ودەگرین، ئەمیش لێیان توڕە بوو وتی: (شیوەن دەکەن و دەگرین لە پێناوی ئێمە، ئەی کێ کوشتمانی؟)[3].

---

(١) سەماکاران (الراقصات): وشترە، چونکە وشتر لەکاتی ڕێکردندا لار و لانجەیەتی ئەڵێی سەما ئەکا، ڕای تریش هەیە لەسەری. (وەرگێڕ)

(٢) ذكر الطبرسي هذه الخطبة في الاحتجاج (٣٢/٢) وابن طاووس في الملهوف ص ٩٢ والأمين في لواعج الأشجان ص ١٥٨ وعباس القمي في منتهى الآمال الجزء الأول ص ٥٧٢، وحسين كوراني في رحاب كربلاء ص ١٨٣ وعبد الرزاق المقرم في مقتل الحسين ص ٣١٧ ومرتضى عياد في مقتل الحسين ص ٨٧ وأعادها عباس القمي في نفس المهموم ص ٣٦٠ وذكرها رضى القزويني في تظلم الزهراء ص ٢٦٢.

(٣) الملهوف ص٨٦ نفس المهموم٣٥٧ مقتل الحسين لمرتضى عياد ص٨٣ ط٤ عام ١٩٩٦م تظلم الزهراء ص ٢٥٧.

### ٤. ئوم کەلسومی کچی عەلی رضي الله عنه:

وتی: (ئەی خەڵکی کوفە عەیبە بۆتان، چیتانە بۆ پشتی حوسەینتان بەردا و دواییش کوشتان، پاشان ماڵاکەیتان تاڵان کرد و بردتان و ئافرەتەکانیتان بە دیل گرت، تووشی مەینەت و دەردەسەریتان کرد، دەك تیاچن و دوورچن، چ نەهامەتیەکە داویە لەسەرتان، چ تاوانێکە هەڵتان گرتووە لەسەر شانتان، چ خوێنانێکتان ڕژان، چ ژنانێکتان دابە کوشتان، چ منداڵانێکتان فەوتان، چ سامانێکتان برد بە تاڵان، پیاوانێکتان کوشت باشترینی دوای پەیامبەر بوون ﷺ، سۆز و بەزەیی لە دڵتان هەڵگیراوە )[١].

### ٥. زەینەبی کچی عەلی رضي الله عنه :

کاتێك خەڵکەکە پێشوازیان لێکرد بە گریان و ڕۆ ڕۆوە، پێی ووتن: ( دەگرین و ڕۆ ڕۆتانە؟ ! ئا بەخوا زۆر بگرین و کەم پێبکەنن، بەڕاستی عەیب و شورەییە و ئابڕوتان چوو، ئیتر هەرگیز پاکی ناکەنەوە [تازە ئابڕوتان چۆڕیا]، ئاخر چۆن کوشتنی وەچەی کۆتا پەیامبەر پاك دەکەنەوە[٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: سەری لە کەژاوەکەی درهێنا و بە خەڵکی کوفەی وت: وسبن ئەی ئەهلی کوفە، پیاوەکانتان دەمانکوژن و ژنەکانتان بۆمان دەگرین، خوا خۆی دادوەری نێوان ئێمە و ئێوەیە لە ڕۆژی دواییدا[٣].

---

(١) اللهوف ص ٩١ نفس المهموم ٣٦٣ مقتل الحسين للمقرم ص ٣١٦، لواعج الاشجان ١٥٧، مقتل الحسين لمرتضى عياد ص ٨٦ تظلم الزهراء لرضي بن نبي القزويني ص ٢٦١.

(٢) مع الحسين في نهضته ص ٢٩٥ وما بعدها.

(٣) نفس المهموم ص٣٦٥ و تظلم الزهراء ٢٦٤.

**٦. جەواد موحەدیسی:**

(هەموو ئەم هۆکـــارانە وای کـــرد ئیمـــامی عـــەلی ئـــەو دوو تالآوەیـــان بـــە دەستەوە بچەژێ و غەدر لە ئیمامی حوسەین بکەن و هەروەها موسـلیمی کوڕی عەقیل بە مەزڵومی لە نێو ئەواندا بکوژرێ و حوسەین لە کەربەلای نزیـك کوفە بە تینویەتی هەر بە دەست سوپای کوفەوە بکوژرێ[1])[2].

**٧. حوسەین کورانی :**

ئەڵێ: (خەڵکی کوفە بە وازهێنان و بڵاوەکردن لە حوسەین وازیـان نـەهێنا، بەڵکو بەهۆی ڕەنگاوڕەنگی هەڵوێستەکانیانەوە هەڵوێستی سێیەمیشیان بۆ پەیدا بوو، ئەوەش بە پەلەکردنیان لە دەرچوون بۆ کەربەلا و شەڕکردن لەگـەڵ ئیمـامی حوسەین علیه السلام، لە کەربـەلاش لـەوێ پێشـبڕکێیان دەکـرد لـە پیشـاندنی هەڵوێستی وا کە لە ڕەزای شەیتان و خەشمی خوای میهرەبان بوو)[3].

* هەروەها ئەڵێ : (هەڵوێسـتێکی تـریش دەبیـنین کـە نیشـانەی نیفـاقی خەڵکی کوفەیە، عەبدوڵلای کوڕی حەوزەی تەمیمی دێتە بەرانبەر ئیمام حوسەین ئەقیڕێنێ: حوسەینتان تێدایە؟-کە چی خەڵکی کوفەشە و تا دوێنێ لە شیعەکەی

---

(١) موسوعة عاشوراء ص ٥٩.

(٢) جواد محدثي: زانایایەکی گەورە وناوداریانە، هەر لەو ووتانەی کە جێگای خۆیەتی لێـرەدا ئاماژەی بۆ بکرێ، ئەڵێ: (لە ڕاستیدا مێژوو شاهیدە کەوا خەڵکی کوفـە مەشـهورن بـە غـەدر و پەیمان شکاندن، ئیتر هەر چۆنێك بێ مێژووی ئیسلام تێڕوانینی چاك نییە لە ئاست پەیمان و پابەندی خەڵکی کوفەوە (هەورەها حسین کورانی ومورتەزا موتەهەری وکازیمی ئیحسائی وحوسەینی نەجەفی وموحسین ئەمین کە نووسەر ووتەکانیان دێنێتەوە هەر هەموویان زانـای زۆر گـەورە و ناوداریـانن، جوان وتراوە: لە زمانی خۆتەوە قەرزار بارتەکەم (من فمك أدينك). (وەرگێڕ).

(٣) في رحاب كربلاء ص ٦٠-٦١.

عەلی ﷺ بوو پێ ئەچێ لەوانەش بووبێ کە نوسراویان بۆ نووسی بێ یان لە جەماعەتی(شەبس)بێ- ئینجا ئەڵێ: ئەی حوسەین مژدەی ئاگرت لێبێ)[1].

## ٨. مورتەزا موتەهەری :

مورتەزا موتەهەری ئەڵێ: (گومان لەوەدا نییە کەوا خەڵکی کوفە شیعەی عەلی بوون، ئەوانەشی حوسەینیان کوشت هەر شیعەی ئەو بوون)[2].

هەروەها ئەڵێ: (ئێمە پێشتر ئەوەمان سەلماند کەوا ئەم چیرۆکە لەم ڕوانگەیەوە زۆر گرنگە، هەروەها وتمان: کوشتنی حوسەین لە لایەن موسڵمانانەوە بەڵکو لە لایەن خودی شیعەوە کە هێشتا پەنجا ساڵێك بەسەر وەفاتی پەیامبەرەوە ﷺ تێپەڕیووە، بەڕاستی شتێکی سەیرە و مەتەڵێکی سەمەرەیە و تا بڵێی سەرنج ڕاکێشە)[3].

جا ئەوەی فەرمانی کرد بە کوشتنی حوسەین و پێی دڵشاد بوو: عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد بوو.

ئەوەی دەستی لە کوشتنی هەبوو: شەمری کوڕی زیلجەوشەن و سینانی کوڕی ئەنەسی نەخعی بوون. ئەم سیانەش هەموویان لایەنگری عەلین و لە صیففینیشدا لە نێو سوپاکەی وی بوون.

## ٩. کازمی ئیحسائی نەجەفی :

(١) في رحاب كربلاء ص ٦١.
(٢) الملحمة الحسينية (١٢٩/١).
(٣) الملحمة الحسينية (٩٤/٣).

ئەڵێ: (ئەو سوپایەی کە دەرچوو بۆ شەڕی ئیمام حوسەین -علیە السلام- سێ سەد هەزار[١] بوون، هەر هەمویان خەڵکی کوفە بوون، نە شامیەك، نە حیجازیەك، نە هیندیەك، نە پاکستانیەك، نە سودانیەك، نە میسریەك، نە ئیفریقیەکیان تێدا نەبووە، هەر هەموویان کوفەیی بوونە، لە هۆز و عەشیرەتە جیاوازەکانەوە کۆبوونەوە)[٢].

### ١٠. حوسەینی کوڕی ئەحمەدی بەڕاقی نەجەفی:

قەزوێنی ئەڵێ: وە لەو ڕەخنە و گازندانەی کە لە خەڵکی کوفە دەگیرێن ئەوەیە: (ئەوان حەسەنی کوڕی عەلیان -علیهما السلام- بەو دەردە برد و هەستان بە کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلی -علیە السلام- کەچی خۆیان بانگهێشتیان کردبوو)[٣].

### ١١. موحسین ئەمین:

(پاشان بیست هەزار لە خەڵکی عێراق بەیعەتیان دابە حوسەین و غەدریان لێکرد و بەیعەتی ئەویشیان لەگەردندا بوو، بەڵام خروجیان لێکرد و کوشتیان)[٤].

* * *

(١) ئەم ژمارە ڕاست نییە، بەڵام لەبەر ئەمانەتی عیلمی نووسەر وەکو خۆی هێناویەتی، ئێمەش هەر لەبەر ئەمانەتی عیلمی نەمان گۆڕی. (وەرگێڕ).

(٢) عاشوراء ص ٨٩.

(٣) تارخ الکوفة ص ١١٣.

(٤) أعیان الشیعة ١/٢٦.

## کێ دەستی ڕاستەوخۆی لە کوشتنی حوسەیندا هەبوو؟

ئـەوەی مەشـهورە لـە کتێبـە ژیاننامـەیی و مێژوویەکانـدا ئـەو کەسـەی ڕاستەوخۆ دەستی لە کوشتنی حوسەیندا هەبووە: سینانی کوڕی ئەنەسی نـەخعی و شەمری کوڕی زیلجەوشەن بوون، سەرگەورەکەشیان عوبەیـدوڵڵای کـوڕی زیـاد بووە، جا هەم عوبەیدوڵڵا و هەم شەمریش لە شیعەکەی عەلین :

١. عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد: طوسـي لە کتێبی (الرجال)ـەکەیدا باسیکردوە و لە هاوەڵانی عەلی هەژماری کردووە[1].

٢. شەمری کوڕی زیلجەوشەن: نەمازی شەهرودی لە بارەی شەمرەوە ئەڵێ: لە صیففیندا لەڕیزی سوپاکەی ئەمیرولمۆئمنین علیه السلام بووە [2].

❊ ❊ ❊

---

(١) رجال الطوسي ص٥٤ ترجمة(١٢٠) ط١المطبعة الحيدرية ـ النجف١٩٦١م، تحقيق: محمد صادق بحر العلوم. [هەر بۆ زانیاریت طوسـي زانایەکی زۆر پایەداری شیعەیە.شەهرودیش بەهەمان شێوە].

(٢) (مستدركات علم رجال الحديث) للعلامة علي النمازي الشهرودي، مؤسسة النشر الاسلامي ـ ١٤٢٥هـ (٤/٢٢٠) ترجمة (٦٨٩٩).

# باسی چوارەم

## هەڵوێستی خەڵك لە ئاست كوشتنی حوسەین[(١)]

بێگومان كوشتنی حوسەین ﷺ لەو موسیبەتە گەورانەیە كە بەسەر موسڵمانانندا هات، چونكە سەر زەوی كچەزای پەیامبەرێكی تری تێدا نەبوو جگە لەو نەبێ و بە مەزڵومیش كوژرا -خوا لە خۆیی و ئال و بەیتەكەی ڕازی بێ-، هەر بۆیە كوشتنەكەی بە نیسبەت موسڵمانانی سەر زەویەوە موسیبەتێكی زۆر گەورە بوو و بۆ خۆیشی شەهیدی و ڕیزلێگرتن و پلە بەرزكردنەوە و نزیك بوونەوەبوو لە خوا، كە هەڵی بژارد بۆ ئاخیرەت و نازو نیعمەتی ئەو بەهەشتە لە جیاتی ئەم دونیا سەخت و ناڕەحەتە.

هەروەها ئەڵێین: خۆزگە دەرنەچووبایە، بۆ ئەو مەبەستەش زۆرێك هاوەڵە بەڕێزەكان ڕێگریان لێكرد، ئەم دەرچوونەی وای لەو زۆردار و زاڵمانە كرد دەستیان بچێتە خوێنی كچەزاكەی پەیامبەری خوا ﷺ و پاشانیش بە مەزڵومی شەهیدی بكەن، بەڕاستی ئەوەندە شت لە كوشتنەكەی كەوتەوە كە ئەگەر لە شارەكەی خۆی دەرنەچوایە ئەوانە ڕووی نەدەدا.

---

(١) شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە -بە ڕەحمەت بێ- لەبارەی بكوژانی حوسەینەوە ئەڵێ: ئەوەشی حوسەینی كوشت، یا هاوكاری كرد، یا ڕازی بوو بەكوشتنی، لە عنەتی خوا و مەلائیكەت و هەموو خەڵكی لێبێ. ئەوە ئیبت تەیمیە كە ئەهلی بیدەع بە تایبەت ڕافیزە زۆر زۆر ڕقیان لێیەتی، وا دەزانن ڕقی لە ئال و بەیت بووە، بەڵام بەڕاستی ئەوە نیشانەی جەهلیانە بە شخ الاسلام، هەر لە كۆنیشەوە وتراوە: الناس أعداء ما جهلوا، خەڵك دوژمنی هەر شتێكن نەیناس و شارەزای نەبن و پەیان پێ نەبردبێت. (وەرگێڕ).

بەڵام کاری خوایە جل جلالە، هەر چییەك خوا تەقدیری بکا ئەبێ و با خەڵکیش نەیەوێ.

دوای ئەوساش کوشتنی حوسەین لە کوشتنی پەیامبەران مەزن تر نییە، ئەوەتا پەیامبەر یەحیا سەلات و سەلامی خوای لەسەر، سەریان بڕی و هێنایان کردیان بە مارەیی ئافرەتێکی داوێن پیس، هەروەها زەکەریا هەر بەکوشتن چوو و عومەر و عوسمان و عەلیش هەر هەموویان بە کوشتن ڕۆیشتن، ئەمانە هەموویان لە حوسەین باشترن خوا لەوان و لە ئەمیش ڕازی بێ، هەر بۆیە جائیز نییە مرۆڤ کاتێك یادی کوشتنی حوسەین بکات دەست بکات بە لە خۆدان ودەم وچاو ڕنین وئەوانە، هەموو ئەمانە لەشەرعدا نەهی لێکراوە، ئەوەتا پەیامبەری خواﷺدەفەرموێت: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ وَ شَقَّ الجُيُوبَ»[1]، واتە: (لە ئێمە نییە ئەوەی لە گۆنایی دەدا و سنگی دەدڕێ).

هەروەها دەفەرموێ: «أَنَا بَرِيءٌ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ»[2]، واتە: (من بەریم لەو ئافرەتەی شیوەن دەکا و لەوەی قژی دادەڕنێ و لەوەی لە سنگی دەدا ودایدەڕنێ ).

الصالقة: ئەو ئافرەتەیە بە دەنگی بەرز دەگری و شیوەن دەکا.

الحالقة: ئەو ئافرەتەیە قژی دادەڕنێ.

الشاقة: ئەو ئافرەتەیە لە سنگی دەدا و دایدەڕنێ.

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب الجنائز، باب ليس منا من شق الجيوب حديث (١٢٩٤). و (صحيح مسلم) كتاب الايمان، باب تحريم ضرب الخدود (١٠٣).

(٢) (صحيح البخاري (كتاب الجنائز، باب ما ينهى من الحلق عند المصيبة (١٢٩٦). و(صحيح مسلم)كتاب الايمان، باب تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب والدعاء بدعوى الجاهلية، حديث رقم (١٤٠/١٦٧).

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ النَّائِحَةَ إِذَا لَمْ تَتُبْ فَإِنَّهَا تُلْبَسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ دِرْعًا مِنْ جَرَبٍ وَسِرْبَالًا مِنْ قَطِرَانٍ»[١]. واتە: (ئەگەر شیوەنکەر تەوبە نەکات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا قەمیسێکی گەڕی و خوریان و پۆشاکێکی قەترانی دەکرێتە بەری).

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان ئەگەر موسیبەتێکی ئاوها ڕویدا، ئەوە بڵێت کە خوای پایەبەرز فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ {البقرة: ١٥٦}. واتە: (ئەوانەی کە هەرکات تووشی بەڵا و موسیبەتێك دەبن، دەڵێن: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ ئێمە هەر هی خواین و سەرەنجامیشمان هەر بۆ لای ویە ).

*** هەڵوێستی خەڵك لە کوشتنی حوسەین:**

خەڵك لە کوشتنی حوسەین دەبنەوە سێ کۆمەڵەوە:

**کۆمەڵەی یەکەم:** وا دەبینن کوشتنی حوسەین هەق بووە، چونکە خروجی لە پێشەوای موسڵمانان کردووە و ویستوویەتی کۆکی و تەبایی موسڵمانان تێك بدا[٢]. هەروەها ئەڵێن پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەس هات و ئێوەش پێشەوایەکی خۆتان هەبوو کاروباری بەڕێوە دەبردن، جا ویستی

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب الجنائز، باب ما ينهى من الحلق عند المصيبة (١٢٩٦). و(صحيح مسلم)كتاب الايمان، باب تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب والدعاء بدعوى الجاهلية، حديث رقم (١٤٠/١٦٧).

(٢) عەرەبیەکەی ((وأردا أن يشق عصا المسلمين)) مەبەست پێی: اجتماعهم وائتلافهم. انظر مختار الصحاح باب (ع ص ا). هەندێك بە (دار) تەرجومەی دەکەن، لە ڕاستیدا ئەگەر هەر ڕاستیش بێ لە ڕوی زمانەوانیەوە وەربگێڕدرێ، دەبێت بگوترێت (گۆچان) نەك (دار)، لەبەر: یەکەم/ خۆی بەو مانایە دیت. دووەم/کنایەیە بۆ شکاندنی ئەو گۆچانەی کە موسڵمانان پێی وەستاون. کە گۆچانی تەبایی و کۆك بوونە. والله أعلم وهو الموفق. (وەرگێڕ)

کۆمەڵەکەتان تێك بشکێنێ، هەرکەسێك بووە بیکوژن، کائنا من کان»[1]. جا حوسەینیش ویستوویەتی کۆمەڵی موسڵمانان تێکدا و پەیامبەریش ﷺ دەفەرموێت: «اقتلوه کائنا من کان» بۆیە کوشتنەکەی ڕاستە، ئەمەش ووتەی (ناصبیەکانە)[2]، کە ڕقیان لە حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالبە -ڕەزای خوا لە خۆیی و لە بابی بێ-.

**کۆمەڵەی دووەم:** ئەڵێن: حوسەین ئەو ئیمامەیە کە گوێڕایەڵی واجب بووە و پێویست بوو کارەکە تەسلیم بەم بکرایە. ئەمەش قسەی شیعەکانە.

**کۆمەڵەی سێیەم:** کە ووتەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، ئەڵێن: بە مەزڵومی کوژراوە، بەڵام کاربەدەست نەبووە واتە ئیمام نەبووە، وەکو خارجیەکیش نەکوژراوە، بەڵکو بە مەزڵومی کوشتیان و شەهیدیان کرد هەروەکو پەیامبەرﷺ دەفەرموێ: (حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن)[3]. هەروەك ویستیشی بگەڕێتەوە، یان بڕوات بۆلای یەزید لە شام، بەڵام ئەوەبو ڕێگریان لێکرد و وازیان لێ نەهێنا هەتا نەبێتە دیلی ژێر دەستی کوڕەکەی زیاد.

*** دوو بیدعەی تازە داهێنراو :**

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: (دوای کوشتنی حوسەین خەڵك دوو بیدعەیان داهێنا:

---

(١) (صحیح مسلم)کتاب الامارة، باب حکم من فرق أمر المسلمین وهو مجتمع، حدیث رقم (١٨٥٢).

(٢) الناصبە: ئەوانەن کە ڕقیان لە عەلی و خانەوادەکەیەتی.

(٣) (أخرجە الترمذي ) کتاب المناقب، باب مناقب الحسن والحسین حدیث (٣٧٦٨).

یەکەمیان: بیدعەی غەمباری و شیوەنکردن لە ڕۆژی عاشورادا، بە لە گۆنـا دان و هاوارکردن و گریان و تینویەتی و خوێندنەوەی شیوەننامە و لاواندنەوە، کە ئەمانە سەردەکێشـێ بـۆ جنێـو و نـەفرەتکردن لـە پێشـینیان و تاوانبـارکردنی خەڵکانێکی بێ تاوان تەنانەت جنێو بـە (پێشـکەوتووە یەکەمـەکان) (السـابقون الأولون) دەدرێت، هەروەها سەرگوزەشتەی کوشتنەکەی دەخوێنرێتەوە کە زۆربەی درۆ و دەلەسەیە، جا ئەو کەسەی کە ئەم کارەی داهێنـاوە مەبەسـتی کردنـەوەی دەرگای ئاشوب و بەش بەش کردنی ئوممەت بووە، وەگەرنا مانای چییە ئەم یـادە هەموو ساڵێك دووبارە بکرێتەوە و خوێن برێژرێ و ڕابردو گـەورە بکرێتـەوە خـۆ پێوەی پەیوەست بکرێ و باوش بکرێتە گۆڕەکان).

دووەمیان: بیدعەی خۆشی و شادی و دابەشکردنی شـیرینی و بەخشـین بـە منداڵ و خێزان لە ڕۆژی کوشتنی حوسەیندا.

لە کوفەدا خـەڵکانێك هـەبوون لایـەنگری ئـال و بـەیت بـوون لـە سـەروی هەموویانـەوە موختـاری کـوڕی ئـەبو عوبەیـدی موتەنـەبیئی درۆزن لەگـەڵ خەڵکانێکی تردا کە ڕقیان لە ئال و بەیت بوو لە سەروی هەموویانەوە حـەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، جا بیدعە بە بیدعە چارەسەر ناکرێ بەڵکو بە بەرپاکردنی سوننەتی پەیامبەر دەبێتﷺ هەروەك خـوای بـاڵا دەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾[البقرة١٥٦] [1].

* * *

(١) ـ(منهاج السنة) (٥/٥٥٤-٥٥٥) بتصرف.

# باسی پێنجەم

## هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لە ئاست یەزیدی کوڕی موعاویە

### * هەڵوێستی یەزید لە کوشتنی حوسەین ﷺ:

یەزید دەستی لە کوشتنی حوسەیندا نەبووە، ئەمەش دیفاعکردن نییە لە یەزید بەڵکو دیفاعکردنە لە هەق[1]، لەوەو پێشیش ڕونمان کردەوە کێ حوسەینی کوشتووە.

یەزید کە عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادی نارد بۆ ئەوەبوو نەهێڵێت بێتە کوفەوە، فەرمانی کوشتنی پێنەکرد، بەڵکو خودی حوسەین ﷺ گومانی خێری بە یەزید هەبوو کاتێك وتی: (یان ئەوەتا ڕێگەم بدەن بڕۆم بۆلای یەزید و بەیعەتی بدەمێ).

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە ئەڵێ: (بە ئیتفاقی ئەوانەی مێژوو دەگوازنەوە یەزید فەرمانی بە کوشتنی حوسەین نەکردووە، بەڵام بۆ ئیبن زیادی نووسی کە نەهێڵێت حوسەین ببێتە والی عێراق و کاتێکیش هەواڵی کوشتنی حوسەین

---

(١) با خوێنەری بەڕێز بەباشی ئەمە بزانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە هیچ شێوەیەك خۆشیان بە یەزیددا نایەت، هەروەکو لە سەلەفەوە هاتووە و فەرمویانە: بۆ کەسێك هەیە کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت ویەزیدی خۆش بوێت ؟! بەڵێ ئەهلی سوننە خۆشیان بە یەزیددا نایەت، بەڵام ئەوەی هەق بێت ڕوونی دەکەنەوە، چونکە هەق لەهەر کەسێکی تر عەزیزترە، جا ئەهلی سوننە نە زیاد ئەڵێن و نە کەم، نە خۆشمان ئەوێ و نە لەعنەتی لێ دەکەین، بەڵام ئەوەی کە نووسەر باسی دەکات ڕاستیەکە و ئەبێت ڕوون بکرێتەوە، هەق هەقە وئەبێت بگوترێت، چونکە خەڵکانی نەیار و ناحەز لە باسکردنی ئەمەدا مەرام و ئامانجی تریان هەیە. (وەرگێڕ) .

- بەڵکو باشتر وایە بڵێین (لا يُسبّ ولا يُحبَ مَحبة الصالحين) (م.خليل).

گەیشتە یەزید نارەحەتی خۆی دەرخست و گریانیش لـە مالەکەیـەوە بیسـترا وە یەکێکیانی بە دیل نەگرت و بەلکو رێزی لە ئەهل و بەیتەکەی گرت و رێگەشـی دان تا گەرانەوە شوێنی خۆیان.

ئەمما ئەو ریوایەتانەی باس لەوە دەکەن کـە بـێ رێـزی بەرانبـەر ئافرەتـانی خانەوادەی پەیامبەر ﷺ کردووە و وەکو دیلی جەنگ بـراون بـۆ شـام و لـەوێش بەهەمان شێوە بێرێزیان لە ئاست کراوە، ئەمانە هەر هەموو ووتەی پوچن، بەلکو بەنی ئومەییە بەنی هاشمیان زۆر بـە رێـزدار تەماشـا کـردوە، تەنانـەت کاتێـك حەجاجی کوڕی یوسـفی سـەقەفی رۆیشـت فاتیمـەی کچـی عەبـدوللای کـوڕی جەعفەری خواست، عەبدولمەلیکی کـوڕی مـەروان ئـەم کـارەی قبـوڵ نـەکرد و فەرمانی کرد بە حەجاج وازی لێ بێنێ و تەلاقیدا، جا ئەوان بـەنی هـاشـمیـان بـە گـەورە و گـران تــەمـاشـا کـردووە، تـەنـانــەت هـەرگیــز رۆژێــك لـە رۆژان هیچ ئافرەتێکی هاشمی نەکراوەتە کەنیزەك )[1]جا بۆیە ئافرەتی هاشمی لەو ماوەیەدا هەمیشە زۆر بەرێز و گرانەوە تەماشا کراوە.

یان دەگوترێ سەری حوسەین براوە بـۆ یەزیـد، ئـەمیش بـە هـەمان شـێوە ئیسپات نەبووە، بەلکو سەری حوسەین هەر لە لای عوبەیدوللا بـوو لـە کوفـە، پاشان حوسەین نێژرا و کەس شوێنەکەی نازانێت، بەلام ئەوەی مەشهورە هەر لـە کەربەلا لە شوێن کوشتنەکەی سپاردویانە.

---

(١) (منهاج السنة) (٤/٥٥٧ - ٥٥٩) بتصرف.




**هەڵوێستی ناوەند لە ئاست یەزید:**

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: خەڵك لە ئاست یەزید دوو پەڕ و ناوەندێکن:

**دەستەی یەکەم:** دەمارگریان بۆی هەیە و خۆشیان دەوێ و تەنانەت ئیددیعای پەیامبەرایەتی و مەعصومەتیشی بۆ دەکەن.

**دەستەی دووەم:** دەمارگریان لەسەری هەیە و ڕقیان لێیەتی و تەنانەت کافری دەکەن و وا دەبینن کە موونافیق بووە و لە ڕوکەش خۆی بە موسڵمان پیشانداوە و بەڵام بەدڵ موونافیق بووە و ڕقی لە پەیامبەر بووە ﷺ.

هەروەها -کاتێك حوسەین کوژراوە یان کاتێك کوشتاری خەڵکی حەرڕەی کردووە- ئەو شیعرە دەدنە پاڵی کە وتوویەتی:

لَيْتَ أَشْيَاخِي بِبَدْرٍ شَهِدُوا     جَزَعَ الخَزْرَجِ مِنْ وَقْعِ الاسَلْ
قَدْ قَتَلْنَا القَرْنَ مِنْ سَادَاتِهِمْ     وَعَدَلْنَاهُ بِبَدْرٍ فَاعْتَدَلْ
وَلَعِبَتْ هَاشِمُ بِالْمُلْكِ فَلا     خَبَرٌ جَاءَ وَلا وَحْيٌ نَزَلْ

هەروەها وتوویەتی:

لَمَّا بَدَتْ تِلْكَ الحُمُولُ وَأَشْرَفَتْ     تِلْكَ الرُّءُوسُ عَلَى رُبَى جَيْرُونِ
نَعَقَ الغُرَابُ فَقُلْتُ نُحْ أَوْ لا تَنُحْ وَلَعَتْ     فَلَقَدْ قَضَيْتُ مِنَ النَّبِيِّ دُيُونِي خَبَرٌ جَاءَ

ئینجا ئەڵێ [واتە ئیبن تەیمیە]: (هەردوو بۆچوونەکە هەڵەیە، ئەو پیاوە پاشایەك بووە لە پاشاکانی موسڵمانان و خەلیفەیەك بووە لە خەلیفە پاشاکان نە ئەمەو نە ئەوە.

سەبارەت بە کوشتنی حوسەین ئەوا بێگومان بە مەزڵومی کوژرا و شەهیدکرا هەروەك هاوشێوەکانی تری چۆن بە مەزڵومی کوژران و شەهید کران، کوشتنی حوسەینیش سەرپێچی کردنی خوا و پەیامبەرە بۆ ئەو کەسەی کوشتوویەتی یان هاوکاری کردووە یان پێی ڕازی بووە، ئەمەش کارەساتێك بوو تووشی موسڵمانان هات بە هۆی خێزانی وی و هی تریشەوە، بۆ خۆیشی شەهادەت و پلە بەرزی و پایە بڵندیە)[1].

---

(١) (مختصر منهاج السنة) (١/٣٤٦).

## ڕێگری لە نەفرەتکردن لە یەزید:

لەوانەیە لە گرنگترین ئەو ڕوداوانەی کە لە سەردەمی یزید دا ڕویدا بێت رووداوی (حەڕە)[١] و کوشتاری عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلی بوو بێت.

بەم هۆیەوە هەندێك نەفرەتکردن لە یەزیدی کوڕی موعاویە بە جائیز دەزانن، هەندێکی تریش بە پێچەوانەوە، جا ئەوەی نەفرەتکردن لە یەزید بە جائیز دەزانێت پێویستی بە سەلماندنی سێ شت هەیە :

**یەکەم:** بیسەلمێنێت کەوا فاسق بووە.

**دووەم:** بیسەلمێنێت کە ئەو لەو فاسقیەی تەوبەی نەکردووە، چونکە ئەگەر بێ باوەڕ تەوبە بکات خوای لێی وەردەگرێت، چ جای فاسق؟

**سێیەم:** بیسەلمێنێت نەفرەتکردن لە کەسێکی دیاریکراو جائیزە.

نەفرەتکردن لە مردوویەکی دیاریکراو جائیز نییە، کە نەخوا و نە پەیامبەری خوا ﷺ نەفرەتیان لێ نەکردبێت، لە پەیامبەری خواوە ﷺ چەسپاوە فەرمویەتی: «لا تَسُبُّوا الأَمْوَ اتَ فَإِنَّهُم قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»[٢]. واتە: (جوێن بە مردووان مەدەن، چونکە ئەوان ئەوەی کە پێشیان خستبوو پێی گەیشتن).

جا دینی خوایش، لەسەر جوێن بازی بەرپا نەبووە، بەڵکو لەسەر ڕەوشت جوانی بەرپا بووە، هەر بۆیە جوێندان لە دینی خوای گەورەدا بەهیچ شێوەیەك جێی نابێتەوە، بەڵکو پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ

---

(١) کاتێك خەڵکی مەدینە لەیەزید ڕاپەڕین، یەزیدیش بەو هۆیەوە سێ ڕۆژ مەدینەی حەڵاڵ کرد.

(٢) (صحيح البخاري) كتاب الجنائز، باب ما ينهى عن سب الأموات، حديث (١٣٩٣).

وَقِتَالُهُ كُفْرٌ) واتە: جوێندان بە موسڵمان فاسقێتیە و دەرچوونە لە فەرمانی خـوا و كوشتار لەگەڵ كردنیشی كوفرە)[1].

[هەروەها دەفەرموێ: (لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ ، وَلا اللَّعَّانِ ، وَلا الْفَاحِشِ ، وَلا الْبَذِيءِ) واتە: موسڵمان تانە وەشێنەر و نەفرەت وەشێنەر و جوێندەر و زمان پیس و بەد ئەدەب نییە].

وەكو دەردەكەوێت جوێندان بە موسڵمان فاسقێتیە، جا كەسیش نەیگووتووە یەزید لە دین دەرچووە، بەڵكو گەورەترینی ئەوەی لەسەری دەگوترێ: فاسق بووە.

ئەمەش هەروەكو ڕونمان كردەوە بەندە لەسەر سەلماندنی ئەو فاسیقێتیەی كە لە یەزید دا هەبووە، زانینی ئەوەش لای خوای بەرز و پیرۆزە.

ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (یەكەم سوپایەك كە غـەزای شـاری قەیسەر دەكەن خودا لێیان خۆش بووە)[2].

جا ئەم سوپایە بە سەركردایەتی یەزیدی كوڕی موعاویە بووە، لە ساڵی ٤٩ ك، دەڵێن هەندێك لە هاوەڵە بەڕێزەكانی لەگەڵدا بووە وەكو: ئیبن عومەر و، ئیبن زوبەیر و، ئیبن عەبباس و، ئەبوو ئەیوب.

ئیبن كەسیر دەڵێ: ( بەڕاستی یەزید هەڵەیەكی زۆر گـەنی كـرد كاتێـك لـە ڕوداوی (حەڕرە)دا فەرمانی كرد بە ئەمیری سوپاكەی موسلیمی كـوڕی عوقبـە،

---

(١) (صحيح البخاري)كتاب الايمان، باب خوف المؤمن أن يحبط عمله، حديث (٤٨).. و(صحيح مسلم)كتاب الايمان، باب بيان قول النبي ﷺ سباب المسلم فسوق وقتاله كفر حديث (٦٤).

(٢) (صحيح البخاري)كتاب الجهاد، باب ماقيل في قتال الروم حديث(٢٩٢٤).

سێ ڕۆژ مەدینە حەڵاڵ کا، کە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر سەحابە و منداڵی سەحابە کوژرا)[١].

جا پوختەی ووتە: ئەوەیە دەیدەینە دەست خواوە، هەروەکو زەهەبی لە بارەیەوە دەڵێت: (لا نسبە ولانحبە)[٢]، نە جوینی پێدەدەین نە خۆشمان دەوێ.

❊ ❊ ❊

(١) ( البداية والنهاية) (٨/٢٢٥).

(٢) (سير أعلام النبلاء) (٤/٣٦).

**هاوەڵ (صەحابی): لەڕوی زمانەوانیەوە:** بۆ هاوڕێ بەکاردێ، مانای تریشی هەیە کە خۆی لە ( پەیوەست بوون و ملکەچ بووندا) دەبینێتەوە[1].

لە ڕووی زاراوەیشیەوە: ئەو کەسەیە گەیشتبێتە پەیامبەرﷺو ئیمانی هێنا بێت و لەسەر ئیسلام مردبێ[2].

وبە چەند شێوازێکی دیش پێناسە کراوە.

**[چەند تێبینیەکی وورد لەسەر ئەم پێناسەیە :**

١. دەبینی دەڵێ : (گەیشتبێتە پەیامبەرﷺ)، ناڵێت پەیامبەری خوای ﷺ بینی بێت، یان چوبێتە دیدەنی، گەر وای بگوتبایە ئەو هاوەڵانەی نەدەگرتەوە کە نابینا بوون وەکو عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم..

٢. کە دەڵێت : (ئیمانی هێنا بێت)، ئەو کەسەی گەیشتبێتە پەیامبەر ﷺ بەڵام ئیمانی پێ نەهێنابێ، پێی ناوترێ صەحابی. وەکو ئەبو جەهل و هتد..

٣. کە ئەڵێ : (لەسەر ئیسلام مردبێت)، ئەو کەسەی گەیشتبێتە پەیامبەر ﷺ و ئیمانیشی پێ هێنابێ، بەڵام دوایی هەڵگەڕابێتەوە ئیتر لە ژیانی پەیامبەر ﷺ بێ یا لە دوای مردنی، ئەوا پێی ناگوترێت صەحابی].

صەحابە، لە ڕوی تێکەڵاوی کردنیان بۆ پەیامبەری خوا ﷺ و لە ڕوی فەزڵداریتیانەوە لای خوای گەورە جیاوازن -هەموویان وەکو یەك نین-. عەدالەتی

---

(١) (لسان العرب) (٥١٩/١).

(٢) «الاصا بة» (١٠/١).

سەحابەش لەلای ئەهلی سوننە وجەماعە شتێکی جێگیرە، هەروەك دواجار ووتەی زانایانی ئەهلی سوننەی لەسەر دێنینەوە.

## بەڵگەکان لەسەر عەدالەتی صەحابە:

خوای پایەبەرز دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح ١٨]. واتە: (سوێند بەخوا بێ گومان خوا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی کە لە ژێر دارەکەدا پەیمانیان پێدای، خوا زانی چی لە دڵیاندایە، بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ ناردن و پاداشتیانی بە سەرکەوتنێکی نزیك دایەوە).

خوای پاك و بێگەرد لەم ئایەتەدا ڕوونی دەکاتەوە کە ڕازی بووە لەو ئیماندارانەی وا لە ژێر دارەکەدا بەیعەتیان بە پەیامبەری خوا ﷺ داوە، چونکە زانیویەتی چی لە نێو دڵەکانیاندایە لە ئیمان و ڕاستگۆیی، بۆیە سەکینە و ئارامی بۆ ناردن، ئەوە شایەتی خوای باڵایە لەسەر ڕاستێتی ئیمانی ئەو هاوەڵانەی کە لە ژێر داری (بیعة الرضوان)دا پەیمانیان بە پەیامبەری خوادا ﷺ.

هەروەها لە پەیامبەری خواوە ﷺ سابت بووە کە فەرموویەتی: «لا یدخل النار أحد بايع تحت الشجرة إلا صاحب الجمل الأحمر»[1] واتە: (هیچ کەس لەوانەی بەیعەتیان لە ژێر دارەکە دا ناڕواتە دۆزەخەوە، تەنها کابرای خاوەن وشترە سورەکە نەبێت).

---

(١) (جامع الترمذي: كتاب المناقب، باب في فضل من بايع تحت الشجرة حديث (٣٨٦٣). وأصله في (صحيح مسلم): كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أصحاب الشجرة أهل بيعة الرضوان رضي الله عنه حديث (٢٤٩٦).

جیددی کوڕی قەیس ئەمەش یەکێکە لەو مونافیقانەی لەگەڵ پەیامبەری خوا ﷺ دەرچوون، ژمارەی ئەوانەی وا لە ژێر دارەکەدا پەیمانیان بە پەیامبەری خوادا ﷺ هەزار و چوار سەد کەس بوون، ئەشڵێن: هەزار و پێنج سەد. هەموو ئەمانە خوا خۆی شایەتی بۆ داون و دەیسەلمێنێ کە هەم دڵیان و هەم ڕوکەشیان وەکو یەکە، نیفاقیان بە هیچ شێوەیەك تیا نیە، تاکە کەسێکیان نەبێ ئەویش پەیامبەری خوا ﷺ باسی دەکا، کە لەگەڵیان بووە و پەیمانی نەداوە.

* خوای پایەبەرز دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ {الحديد ١٠}.

واتە: ئەوە چیتانە کەوا هیچ نابەخشن لە ڕێی خوادا، خۆ میراتی نێو ئاسمانەکان و زەوی بۆ خوا دەمێنێتەوە، یەکسان نین (چون یەك نین) ئەوانەتان کە لە پێش ڕزگاریی مەککەدا ماڵی بەخشیوە و جەنگاون، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر گەورە ترە لەوانەی کە دوای ڕزگاریی مەککە ماڵ و سامانیان بەخشیوە و جەنگاون، بە هەردوولا خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە وە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

ڕاستێتی ئەمەش ئەو فەرمایشتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِى مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ {الأنبياء ١٠٠ – ١٠٣}.

واتە: (ئەو دۆزەخیانە لە دۆزەخدا هەناسەی سارد و ئـاه هەڵکێشـانیان بـۆ هەیە، هیچ نابیستن * بێگومان ئەوانەی کە پێشتر لەلایەن ئێمـەوە بڕیـار دراوە کامەرانی (چاکە هێنانە ڕێیان) بۆ ببێت، ئەوانـە لـە دۆزەخ دوور دەخرێنـەوە * ئەوانە دەنگی بڵێسە و قرچەی ئاگری دۆزەخ نابیستن، بەڵکو ئەوان لەناو ئەو ناز و نیعمەتەی کە دڵیان حەزی لێیەتی بۆ هەتا هەتایی دەمێننەوە * وە ترسە هـەرە گەورەکەی قیامەت غەمباریان ناکـات، بـەڵکو فریشـتەکان بـە ڕووی خۆشـەوە پێشوازیان لێدەکەن و پێیان دەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کـە کـاتی خـۆی بـەڵێنتان پێدرابوو).

ئەمەش دیسانەوە شایەتیەکی ترە لـە خـوای پـاك و پـیرۆزەوە بـۆ هـەموو هاوەڵەکانی پەیامبەرﷺ، هەم ئەوانەی کە پێش فەتحی مەککە ماڵ و سـامانیان بەخشیوە و جەنگاون وە هەم ئەوانەی کە دوای فەتحی مەککـە مـاڵ و سـامانیان بەخشیوە و جەنگاون.

* هەروەها خوای پەروەردگار لە باسی دابەشکردنی دەستکەوتدا دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ {الحشر ٨}. واتە: (وە بۆ ئەو کۆچبەرە هەژارانەی لە ماڵ و سامانی خۆیان دوورخرانەوە و دەرکران و هەوڵی بەهرە و ڕەزامەندی ئەو دەدەن و یارمەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدن، بەڕاستی ئا ئەوانە ڕاستگۆن).

کە دەفەرموێ ﴿ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ﴾ بە تەمای پاداشت و ڕەزابوونی خوان (باسکردنی کردارەکانی دڵە کە خوای بەرز و پیرۆز بۆی قەرار

داون). پاشان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُو الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ {الحشر: ٩}. واتە: (وبۆ ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و لانکەی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران کردیانە بنکە و بارەگای باوەڕ، ئەوەی کۆچ بکات بۆلایان خۆشیان دەوێت و لە دڵ و دەرونیاندا هیچ جۆرە حەسودیەکی تێدا شك نابەن لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران درا لە فەزڵ و پلەوپایە و خۆنەویستی دەکەن و باوی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا ئەگەر چی خۆشیان موحتاج بن وپێویستیان پێی بێ وئەو کەسەی خۆی لە ڕژدی و ڕەزیلی بپارێزێت، بەڕاستی هەر ئەوانن سەرفرازان).

* هــەروەها خــوای پــەروەردگار لــە بــارەی ئوممــەتی موحەممــەدەوە ﷺ دەفــەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ {آل عمرا ١١٠}. واتە: (بەڕاستی ئێوە (موسڵمانان) باشترین ئوممەتێکن بــۆ خەڵکی هێنرابێتە دی، فەرمان دەدن بە چاکە و جڵــەوگیری دەکــەن لــە خراپــە و باوەڕی دامەزراو بەخوا دەهێنن، ئەگەر خاوەن کتێبەکان باوەڕیان بهێنایــە ئــەوە چاکتر بوو بۆیان، هەیانە ئیماندارن و بەڵام زۆربەیان لە فەرمانی خوا دەرچوون).

جا موستەحیلە ئەم ئوممەتەی کە خــوای گــەورە لــە بارەیــەوە فــەرمویێتی: چاکترین ئوممەتێکە لە بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی، موستەحیلە بەو شێوەیە بێت کە هەندێك لە گروپەکان ئــەیڵێن: (هــەر هــەموو کۆچــبەران و پشــتیوانان لــە دیــن

هەڵگەڕاونەتەوە تەنها سیان نەبێت)(١). ئەوانەی کە هەموویان هەڵدەگەڕێنەوە و تەنها سیانیان دەمێنێتەوە خوای گەورە لە بارەیانەوە نافەرموێ باشترین ئوممەتێکن لە بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی.

* پەیامبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: (لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُم أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ) واتە: (جوێن بە هاوەڵەکانم مەدەن، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە گەر یەکێکتان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ناگاتە مشتێکی ئەوان بەڵکو نیوە مشتێکیشی)(٢).

* هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (لە ڕۆژی قیامەتدا بانگی نوح دەکرێت ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم گوێڕایەڵتم و لە ژێر فەرمانی تۆم، خوا جل جلاله پێی دەفەرموێ: پەیامەکەت گەیاند؟ ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ. کە پرسیار لە ئوممەتەکەی نوح دەکرێت: ئایا پەیامەکەی پێ گەیاندن؟ دەڵێن: ئێمە پەیامبەرمان بۆ نەهاتووە، ئەوسات خوای پەروەردگار بە نوح دەفەرموێ: کێ شایەتی گەیاندنی پەیامەکەت بۆ دەدات؟ نوحیش دەفەرموێ: موحەممەد و ئوممەتەکەی، ئیتر ئەوانیش دێن و شایەتی بۆ نوح -علیه الصلاة والسلام- دەدەن، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمەش ئەو فەرمودەیەی خوای بەرز و پیرۆزە کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ

---

(١) (أصول الكافي) (٢/٢٤٤).

(٢) (صحيح البخاري: فضائل الصحابة، باب قول النبي لو كنت متخذا خليلا، حديث (٣٦٧٣).

وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ [البقرة:١٤٣]. واتە: (هەروەها بەو شێوەیەش کردمانن بە گەلێکی میانڕەو، تا ببنە شایەت بەسەر مەردومەوە و پەیامبەریش ﷺ چوادێر و شایەت بێت بەسەر ئێوەوە). پاشان پەیامبەری خوا ﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمووی: (الوسط: العدل) میانڕەو، یانی: دادگەر[١].

هەر لەو شتانەی کە بەڵگەن لەسەر عەدالەتی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەیە کە زانایان پێی هەستاون لە پاڵفتە کردنی ئەو ڕیوایەتانەی وا هاوەڵەکانی پەیامبەر ﷺ ڕیوایەتیان کردووە، دوای ئەو هەمووە، کەچی یەك سەحابیان نەبینیوە تەنانەت تاکە درۆیەکیشی بەدەم پەیامبەری خواوە ﷺ کردبێت، تەنانەت سەرباری دەرکەوتنی بیدعە لە دوا دواییەکانی سەردەمی هاوەڵاندا، کەچی نابینی تاکە هاوەڵێکیش لە نێو ڕیزی موبتەدیعەکان بوو بێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا هەڵیبژاردوون و هەڵیچنیوون بۆ هاوەڵێتی پەیامبەرەکەی ﷺ[٢].

---

(١) (صحيح البخاري: كتاب التفسير، باب و كذلك جعلناكم أمة وسطا، حديث (٤٤٨٧).

(٢) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەڵێ: (خوای گەورە تەماشای دڵی هەموو بەندەکانی کرد، بینی دڵی موحەممەد چاکترین دڵی نێو بەندەکانە، بۆیە بۆخۆی هەڵیبژارد و ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی پێ سپارد، پاشان تەماشای دڵی بەندەکانی خۆی کرد بینی دڵی هاوەڵەکانی باشترین دڵەکانی نێو بەندەکانێتی، بۆیە کردنی بە وەزیری پەیامبەرەکەی و لە پێناوی دینەکەی خۆیان دەدەنەکوشت...) ت.و. رواه الامام أحمد في ( مسنده ) (٣٧٩/١)، وقال العلامة أحمد شاكر (اسناده صحيح). (المسند) بتحقيقه رقم (٣٦٠٠)، وقال المحدث العلامة الألباني في (تخريج الطحاوية ص٤٧٠): (حسن موقوفا، أخرجه الطيالسي و أحمد وغيرهما بسند حسن، وصححه الحاكم و وافقه الذهبي، واشتهر على الألسنة مرفوعا، وفي سنده كذاب، والصحيح وقفه، وهما مخرجان في (الضعيفة) (٥٣٢-٥٣٣).

هەروەها پێویستە ئاگاداری شتێکی زۆر گرنگ ببین، ئەویش ئەوەیە کە هەر کەس عادل بێ ئەوە ناگەیەنێ کە ئەبێ مەعصومیش بێ، ئێمە ڕاستە ئەڵێین هاوەڵانی پەیامبەرﷺعادلن، بەڵام هەرگیز ناڵێین مەعصومن ئەوانیش مرۆڤن، پەیامبەری خواشﷺدەفەرموێت: (هەموو ئادەمی زادێك زۆر هەڵە دەکات[1] جا ئەوانیش ئادەمی زادن هەڵە دەکەن و دەشپێکن، ئەگەر چی هەڵەکانیان لە دەریای چاکەکانیان نوقم بووە، ڕەزای خوا لە هەموویان بێ و ڕازیان کا.

* عەللامە ئیبن عەبدولبەڕ دەڵێ: (هەموو ئەهلی هەقی نێو موسڵمانان کە ئەهلی سوننە و جەماعەن، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەر هەموویان عادلن)[2]

* ئیبن حەجەری عەسقەلانیش: ئەڵێ: (هەموو ئەهلی سوننەت کۆکن لەسەر عادلیەتی هەموویان، کەسیش پێچەوانەی ئەمەی نەگووتووە تەنها هەندێك لە موبتەدیعەکان نەبێ)[3].

بە هەمان شێوە: ئەلعێراقی، و جوەینی، و ئیبن سەلاح، و ئین کەسیر و ئەوانی تریش ئیجماعی موسڵمانانیان هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ هەر هەموویان عادلن[4].

---

(١) مسند أحمد: (٣/١٩٨).
(٢) الاستيعاب: (١/٨٠).
(٣) الاصابة: (١/١٧٠).
(٤) أنظر تفصيل ذلك في كتاب: (عدالة الصحابة رسول الله في الكتاب والسنة) باب الرابع، مبحث: عدالة الصحابة.

* خەتیبی بەغدادی دەڵێ: ( گریمان هیچ لەو شتانەی کە باسمان کرد[١]، نە لە لایەنی خوا و نە لە لایەنی پەیامبەرەوە ﷺ لە بارەوە نەگوترابێ، ئەوا ئەو حاڵ و بارەی کە تێیدا بوون؛ هەر لە کۆچکردن و جیهاد کردن و سەرخستنی پەیامبەر و ئیسلام و فیداکردنی گیان و ماڵ و سامان و کوشتاری باوك و برا ودڵسۆزیان بۆ دین و بە هێزی ئیمانیان و یەقینیان؛ هەر هەموو ئەمانە ئەوە یەکلا دەکەنەوە کە هاوەڵان عادلن و پاکن و، کە ئەمانە باشترینی نێو هەموو ئەو عادل و پاکانەی دوای خۆیانن کە دێن بۆ هەتا هەتایە)[٢].

* * *

---

(١) مەبەستی ئەو بەڵگانەیە وا باسی کردوە کە بەڵگەن لەسەر عەدالەتی هاوەڵان.

(٢)( الكفاية في علم الرواية ) ص٩٦.

## بەشی دووەم

کێتانە لە عەدالەتی هاوەڵان دەدات؟
-ڕەزای خوایان لێ بێت-

# باسی یەکەم

## تانە وەشێنەکان چیان دەوێ لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ ؟

دەتوانین تانە وەشێنەکان لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ بکەین بە دوو بەشەوە:
**بەشی یەکەم:** ئەوانەی تانەیان لێدەدەن بە هۆی شوبهەیەکەوە کە لێیان وەشاوەتەوە -لەوانەی کە پێشتر باسمان کردن-، هەروەها بەهۆی سەرلێشێواندنی زانای خراپەوە. **بەشی دووەم:** ئەوانەی تانەیان لێدەدن، بە هۆی ئەوەی کە ئەوان گوازەرەوەی ئەم دینەن -گوازەرەوەی قورئان و سوننەتن- جا کە متمانەمان بە گوازەرەوەکانی قورئان و سوننەت نەبوو بە هەمان شێوە متمانە بەو شتانەش ناکەین کە بۆمانی دەگوازنەوە، بە هۆی بوونی ئەو ئەگەرەی کە زیادیان خستبێتە سەری یان لێیان کەم کردبێتەوە، ئەمەش بەهۆی نا عادلیانەوە، ئا ئەمەیە مەترسیە ڕاستەقینەکە، چونکە ئەنجامی کۆتایی بریتییە لە تانەدان لە دینی خوا بە هۆی نەبوونی متمانە بە گوازەرەوەکەی. ئەبو زورعەی ڕازی: -لە چەند دێڕێکدا کە گەر بە ئاوی ئاڵتونیش بنوسرێ هەر زۆر نییە- دەڵێ: (ئەگەر کەسێکت بینی تانە لە هاوەڵانی پەیامبەرﷺدەدات ئەوە بزانە زیندیقە، چونکە قورئان لای ئێمە هەقە و سوننەتیش بە هەمان شێوە، ئەی تەنها گوازەرەوەی قورئان و سوننەتەکان هاوەڵانی موحەممەدنﷺ، ئەوانە دەیانەوێ شایەتەکانمان بریندارکەن بەڵکو قورئان سوننەت فەشەل بێنێ، بۆیە بریندارکردنی ئەوان ڕەواترە وئا ئەوانە زیندیقن)[1].

---

(١) (تاريخ دمشق) لابن عساكر (١٤١/٥٩).

# باسی دووەم

## ئەو تاقم و گروپانە کە تانەیان لەعەدالەتی هاوەڵان داوە لەگەڵ بەڵگەکانیان

ئەوانەی تانە لە عەدالەتی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ دەدەن چوار تاقمن:

تاقمی یەکەم: شیعە[١].

تاقمی دووەم: خەوارج[٢].

---

(١) بەکورتی و بە پوختی: ئەوانەن کە زیادەڕەوی دەکەن لە خانەوادەی پەیامبەر ﷺ، خیلافەت و ئیمامەت تەنها لە خانەوادە بەرێزەکەی پەیامبەردا ﷺ کورتهەڵدێنن، فەزڵی ئیمامی عەلی دەدەنە سەر هەموو هاوەڵاندا ﷺ.لە ڕیوایەتی صەحیحترین و ناودارترین کتێبیان -کە کافیە و خوا یاریێ بەتایبەت لە نامیلکەیەکدا باسی لێوە دەکەین-: ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عائیشە و حەفصە بە کافر دەزانن، بەڵکو هەموویان؛ هەروەك لە ڕیواتە صەحیحە -ناصەحیحە- کانی خۆیان هاتووە ئەڵێ: (هاوەڵان هەموویان هەڵگەڕاونەتەوە تەنها سیان نەبێ)، بە حەوتیش هاتووە، هەروەها قورئان بە دەستکاری کراو دەزانن. لە ڕووی قەدەرەوە دیدوبۆچونیان وەکو قەدەریەکان وان..

پێیان دەگوترێت شیعە (لایەنگر - پشتگیر - سەرخەر) بەهۆی لایەنگریان بۆ ئال و بەیت، پێشیان دەوترێت (رافضة - ڕەفزکەر) چونکە ڕەفزی زەیدی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان کرد، کاتێك پێیان وت چی دەڵێی لە بارەی ئەبوبەکر و عومەرەوە؟ ئەویش ستایشی کردن و وتی: ئەوە دوو وەزیرەکەی باپیری منن -یانی پەیامبەر ﷺ-، ئەوەبوو پشتیان تێکردو و ڕەفزیان کرد، بۆیە ناونران ڕافیزە.هەندێك ئەڵێن: ڕەفزکەر تەنها بەوانەیان ئەوترێ، کە بە ئاشکرا هاوەڵان بە کافر دەزانن و جنێویان پێ دەدەن، ئەمەش ڕای پەسەندە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوانەن کە خروجیان کرد لە ئیمامی عەلی ﷺ، هەرکەس تاوانێکی گەورە بکات بە کافری دەزانن و ئەڵێن: بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەروەها دەسەڵاتداری فاسق بە

**تاقمی سێیەم: نەواصب[(١)].**

**تاقمی چوارەم: موعتەزیلە[(٢)].**

**بەڵگەکانیان بۆ تانەدانیان لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ئەمانەن:**

**یەکەم: تاوان لە هەندێك لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ وەشاوەتەوە.**

**دووەم: ئەڵێن: هەیە لە هاوەڵان بە دەقی قورئان و سوننەت موونافیقە.**

**سێیەم: ئەڵێن: کەوتمان عەدالەت ئەبێ یەکسانی پلە و پایە هەبێ: جا مادام لای هەموومان یەکسانی پلە وپایە نیە، ئەوا بەهەمان شێوە عەدالەتیش نییە.**

---

کافر دەزانن بۆیە خروج لێکردنی بە حەڵاڵ دەزانن، هەروەها ئەمانیش ئیمامی عەلی و موعاویەو= =عەمرو ئەبو موسایان بە کافر دەزانی، حروریەیشیان پێ دەگوترێت -شوێنێکە نزیك کوفە- چونکە کاتێك خروجیان کرد لە ئیمامی عەلی رضي الله عنه دەرچوون بۆ ئەو جێگایە هەروەك پیشتر نووسەر باسی لێوە کرد. (وەرگێڕ)

(١) پێشتر نووسەر پێناسەی کردن.

(٢) ئەمانیش تاقمێکن شوێنکەوتووی(واصلی کوڕی عەتا)ن بڕوایان بەناوەکانی خوا جل جلالە هەیە بەڵام بڕوایان بە سیفاتەکانی نییە، ئەڵێن: خوا زانایە و بێ زانستە، حەکیمە و بێ حیکمەتە، بە توانایە و بێ توانین و ئەڵێن قورئان دروست کراوی خوایە نەك ووتە و فەرموودەی خوا، لە بارەی قەدەریشەوە دەڵێن مرۆڤ ئازادە چی بکات دەیکات سەربەخۆ لە قەزا و قەدەری خوا بە پێچەوانەی جەهمیەکانەوە هەر بۆیە پێیان دەوترێت قەدەریەکان، هەروەها بڕوایان بە کەرامات نییە، بۆیەش پێیان دەوترێ (المعتزلە - دوورە پەرێزگر)، چونکە ئەم (واصلە) لە مەجلیسی حەسەنی بەصری دادەنیشت، کاتێك حەسەن باسی ئەوەی کرد کە هەرکەس تاوانێکی گەورە بکات ئەوا ئیمانەکەی ناتەواوە وپێی کافر نابێ، واصلی کوڕی عەتا وتی: نەخێر بەڵکو (منزلة بین منزلتین) جێگایەکی نێوان هەردوو مەنزڵگاکە، کە مەبەستی بەهەشت ودۆزەخە، نە دۆزەخی یە، نە بەهەشتییە بەڵام دوایی هەر دەخرێتە دۆزەخەوە، ئیتر وازی لە مەجلیسی ئیمامی حەسەن: هێنا، بۆیە ناونران (المعتزلة). (وەرگێڕ)

**چوارەم: ئەڵێن: هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر عەدالەتی هەموو هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ.**

**خولاسەی وەڵامی ئەم بەڵگە لاوازانە بەم شێوەیەیە:**

*** سەبارەت بەوەی: هەندێکیان تاوانی کردووە ! !**

ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە تاوانکردن زیان بە عەدالەتیان ناگەیەنێت، بەڵکو ئەڵێین: عادلن و مەعصوم نین.

*** سەبارەت بەوەی: (هاوەڵان هەیان بووە مونافیق بووە) ! !**

ئەمەش ڕاست نییە، مونافیق بە هاوەڵ حیساب ناکرێ، چونکە پێناسەی سەحابی بریتییە: لە ئەو کەسەی گەیشتبێتە پەیامبەر ﷺ ئیمانی پێهێنا بێ و لەسەر ئیمانیش مردبێ، جا مونافیقەکان نە ئیمانیان هێناوە و نە لەسەر ئیمانیش مردوون، هەر بۆیە ئەم پێناسە نایانگرێتەوە.

*** سەبارەت بەوەی کە دەڵێن: (کە وتمان عەدالەت، ئەبێ لە پلە و پایەشدا یەکسان بن):**

ئەمەش ڕاست نییە و پێویستیش ناکا، بەڵکو ئێمە ئەڵێین عادلن و هەندێکیشیان لە هەندێکی تریان باشترن جا ئەبوبەکر لە هەموو هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ باشترە، ئینجا عومەر، ئینجا عوسمان، ئینجا عەلی، ئینجا باقی دە مژدە پێدراوەکە، پاشان ئەهلی بەدر، پاشان ئەهلی بەیعەی ڕیزوان و ئا بەو شێوەیە، مەبەست ئەوەیە هاوەڵان لە پلەوپایەدا وەکو یەك نین، هەروەك خوا - سبحانە- دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ {الحديد: ١٠}.

واتە: ئەوە چیتانە وا هیچ نابەخشن لە ڕێی خوادا، خۆ میراتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی لە نێویاندایە بۆ خوا دەمێنێتەوە، چون یەك نین ئەوانەتان کە لە پێش ڕزگاریی مەککەدا ماڵی بەخشیوە و جەنگاون، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر گەورە ترە لەوانەی کە دوای ڕزگاریی مەککە ماڵ و سامانیان بەخشیوە و جەنگاون، بە هەردوولا خوا بەڵێنی بەهەشتی داوە وە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

جا ئەگەر پەیامبەران لە فەزڵ و پلەوپایەدا وەکویەك نەبن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ [البقرة: ٢٥٣]. واتە: (ئەو پەیامبەرانەی کە باسکران ڕێزی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا).

ئەوا هاوەڵانیش بەهەمان شێوە وەکو یەك نین.

*** سەبارەت بەوەی کە ئەڵێن: (بەڵگەیەك نییە لەسەر عەدالەتی هەموو هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ):**

لەوەو پێش هەندێك بەڵگەمان لە قورئان و سوننەت هێنایەوە لەسەر عەدالەتیان.

بێگومان ئەوانیش هەندێك بەڵگەیان هێناوەتەوە.

بەڵام ئێمە پێش ئەوەی باسی ئەو بەڵگانەیان بکەین، باسی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و پیرۆز ئەکەین کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ [آل عمران: ٧].

واتە: (ئەو خوایە قورئانی ناردوەتە خوارەوە بۆت، هێندێکی ڕۆشن و موحکەمن، ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن، ئەوانی تر ئایەتانێکن مەبەستەکانیان ڕۆشن نین و موتەشابیهن، جا ئەوانەی کە دڵیاندا لاری و لادان هەیە دوای ئەو ئایەتانەی قورئان دەکەون کە موتەشابە وهاوشێوەن، بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسڵمانان و بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزوی ناپاکی خۆیان، لە حاڵەتێکدا کەس ڕاڤە کردنی نازانێ تەنیا خوا نەبێ، وە دامەزراوان لە زانستدا ئەڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوە بە ئایەتی موتەشابیە، هەمووی لە پەروەردگارمانەوەیە، بەڕاستی بێجگە لە خاوەن ژیریی و بیرەکان نەبێ بیر ناکەنەوە لە قورئان).

جا ئەوانەی باس لە ناعەدالەتی هاوەڵان دەکەن کۆمەڵێك شوبهەیان پێیە هەم لە قورئان و هەم لە سوننەت.

ئێستاش دەڕۆینە سەر باسی ئەو گومان و شوبهانە و بەر پەرچی دەدەینەوە:

❊ ❊ ❊

# شوبهەی یەکەم

## فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ لەسەر حەوز

ئـەڵێن: پەیامبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: (خـەڵکانێك دێـن بـۆ لام، دەیانناسمەوە و دەمناسنەوە، پاشان بـە توندی لـە حەوزەکـە دوور دەخرێنـەوە، منیش ئەڵێم: هاوەڵەکانم، پێم دەگوترێ: تۆ نازانی دوای تۆ چیان کرد)[1].

ئەم فەرموودەیە چەندین ڕێگا و چەندین ڕیوایەتی هەیە:

**لەوانە:** (من لەسەر حەوزم چاوەڕێ دەکەم بزانم کێ لە ئێوە دێ بۆلام، بـەڵام خەڵکانێکم لێ دەبرێن، منیش ئەڵێم: ئەی پەروەردگارم، لە منن و لە ئوممەتەکەی منن، پێم دەڵێن: ئایا نەتزانی دوای تـۆ چـیان کـردوە؟ سـوێند بـەخوا دوای تـۆ ئەوەندەی نەبرد هەڵدەگەرانەوە لە دینی خۆیان.

ئـیبن ئـەبی مولەیکـە -کـە هـەواڵخوانی فەرموودەکەیـە- وتـی: ئـەی پەروەردگارا پەنات پێ دەگرین لەوەی هەڵگەڕێینەوە)[2].

**و ڕیوایـەتی دووەم:** (ئـەمن پێشـتان دەکـەوم و لـە پێشـتانەوە لەسـەر حەوزەکەم، خەڵکانێك دێن بەڵام لێم دەبرێن، ئـەڵێم: پـەروەردگارم، هاوەڵـەکانم، هاوەڵەکانم، پێم دەگوترێ: تۆ نازانی دوای تۆ چیان کرد)[3].

**بۆ وەڵامی ئەم شوبهەیەش:**

---

(١) صحيح البخاري: كتاب التفسير، باب كما بدأنا أول خلق نعيده (٤٧٤٠).

(٢) صحيح البخاري: كتاب الرقاق، باب حديث في الحوض (٦٥٩٣).

(٣) صحيح مسلم: كتاب الطهارة، باب استحباب اطالة الغرة حديث (٢٤٩).

یەکەم: مەبەست لە هاوەڵ لێرەدا ئەو مونافیقانەن کە لە سەردەمی پەیامبەردا ﷺ خۆیان بە موسڵمان پیشانداوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ {المنافقون:١}. واتە: (ئەی پەیامبەر کاتێك دەغەڵ و دووڕوەکان بێنە لات، دەڵێن: شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پەیامبەری خوایت و خوا خۆی دەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەوی، خواش شایەتی دەدات کە ئەو مونافیقانە درۆزنن).

جا ئەمانە لەو مونافیقانەن کە پەیامبەری خوا ﷺ پێی نەزانیوون، هەروەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ [التوبة ١٠١]. واتە: (لەو عەرەبە دەشتیەکانەی کە لە دەورو بەرتاندان مونافیقانێك هەن وە هەندێ لە خەڵکی مەدینەش لەسەر دوو ڕوویی ڕاهاتوون و زرنگن لەو بارەیەوە، تۆ نایانناسی ئێمە چاك دەیانناسین، ئەوانە دووجار سزایان دەدەین، دواتریش دەگەڕێندرێنەوە بۆ سزایەکی گەورە). جا ئا ئەوانە لەو مونافیقانەن کە پەیامبەر ﷺ وایدەزانی لە سەحابەکانی ئەون، بەڵام واش نەبوون.

دووەم: مەبەست پێیان ئەوانەن کە لە دوای وەفاتی پەیامبەری خوا ﷺ هەڵگەڕاونەتەوە، ئەوەبوو زۆرێك لە عەرەب دوای وەفاتی پەیامبەر ﷺ هەڵگەرایەوە، بۆیە ئا ئەمانەن کە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (هاوەڵەکانم، پێی دەوترێ: تۆ نازانی دوای تۆ چیان کرد هەرکە بەجێیانت هێشت دوای تۆ هەڵگەرانەوە).

سێیەم: مەبەست پێی: واتای هاوەڵە بە شێوەی گشتی، یانی: هەر کەسێ هاوەڵی و هاوڕێیەتی پەیامبەری خوای ﷺ کردبێ با ئیمانیشی نەهێنا بێ، ئەمانە مانای هاوەڵ لە ڕوی زاراوەییەوە نایانگرێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە، کاتێك سەرۆکی مونافیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وتی: ﴿لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ﴾ [المنافقون٨]. واتە: هەرکە گەڕاینەوە بۆ مەدینە با دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان، لات و بێ ڕێزەکان وەدەرنێ). ئەم قسەیەیان بۆ عومەر گێڕایەوە، وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئیزن بدە با لە گەردنی ئەم مونافیقە بدەم، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (نا وازی لێ بێنە، با خەڵك نەڵێن موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت)[1].

دەبینی پەیامبەری خوا ﷺ دەیکات بە هاوەڵی خۆی، ئەمەش لەسەر واتا زمانەوانییەکەی نەك زاراوییەکەی، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی سەلول سەرۆکی مونافیقەکان بووە ولەو کەسانەیە وا خوا ڕیسوای کرد ونیفاقەکەی ئاشکرا کرد.

**چوارەم:** پێ ئەچێت مەبەست لە ووشەی (هاوەڵەکانم) هەموو ئەو کەسانە بێت کە هاوەڵێتی پەیامبەری خوا ﷺ دەکەن لە گرتنە بەری ڕێگاکەی پەیامبەر، ئەگەر چی نەشیان بینی بێت، بەڵگەش بۆ ئەمە ڕیوایەتی: (ئوممەتەکەم)، یان (ئەوانە ئوممەتی منن)ـە.

سەبارەت بەو ووتەیەی پەیامبەر ﷺ: **(دەیانناسمەوە)**، پەیامبەری خوا ﷺ خۆی ڕونی کردۆتەوە کە ئەم ئوممەتە دەناسێتەوە، وتیان: قوربان چۆن

(١) صحيح البخاري: كتاب التفسير، باب قوله ﴿ سواء عليهم أستغفرت لهم ﴾ حديث (٤٩٠٥).

دەیانناسیەوە و نەشیانت بینیوە؟ فەرموی: (بە شوێنەواری دەست نوێژەکانیانەوە دەیانناسمەوە)[(١)].

هەروەها ئەوەی کە ئەمە پشت ڕاست دەکاتەوە، تێگەیشتنەکەی ئیبن ئەبی مولەیکەیە -هەوالّخوانی فەرمودەکە- کاتێك کە ئەڵێت: (خوایە گیان پەنات پێ دەگرین لەوەی هەڵگەڕێینەوە) کەچی لە تابعینە.

دوای ئەوەش ئەم فەرمودەیە نە خەوارج و نە نەواصب و نە موعتەزیلە، هیچ کام لەمانە نەیانکردۆتە بەڵگە، تەنها شیعە نەبێت، بۆ هەڵگەڕانەوەی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ کردویانەتە بەڵگە.

ئەو کات پێیان دەوترێ: ئەی باشە چی عەلی و حەسەن و حوسەین و ئەوانی تریش لە ئەهل و بەیتی پەیامبەر ﷺ لەو هاوەڵانە دەردەکات؟ چی ڕێگرە لەوەی کە ئەمانیش لەوانە بن وا هەڵگەڕاونەتەوە؟

---

(١) (صحيح مسلم): كتاب الطهارة، باب استحباب اطالة الغرة والتحجيل في الوضوء، حديث (٢٤٩). ئەمەش دەقەکەیەتی: لە ئەبی هەرەیرەوەوە دەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ هات بۆ گوڕستان و فەرمووی: السلام عليكم، ماڵی گەلی ئیمانداران، ان شاء الله ئێمەش پێتان دەگەین و پێم خۆش بوو براکانمان ببینیایە) وتیان: بۆ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەی ئێمە برات نین؟ فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، براکانمان ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون)، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ چۆن کەسانێك لە ئومەتەکەت دەناسیەوە کە هێشتا نەهاتوون، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: (ئایا ئەگەر پیاوێك ئەسپێکی هەبێت نێوچاوانی سپی و لە پەلەکانی دا سپێتی هەبێت، لە نێوان کۆمەڵە ئەسپێکی ڕەشی زۆردا ناناسرێتەوە؟) وتیان: بەڵێ قوربان دەناسرێتەوە. ئەویش فەرمووی: (دەی ئەوانیش بە نێوچاو سپی و پەل سپی بە شوێنەواری دەست نوێژەوە دێن و من لە پێشیانەوە لەسەر حەوزەکەم، جا خەڵکانێك لە حەوزەکەم بەتوندی دوور دەخرێنەوە، هەروەکو چۆن حوشتری سەرلێشێواو پەڕاگەندە دەکرێت، بانگیان دەکەم: دەی وەرن، بەڵام پێم دەووترێت: بەڕاستی ئەوانە دوایی گۆڕان. منیش دەڵێم: (ئەو لاتر بچن، ئەولاتر بچن).

بەڵام ئێمە هەرگیز ئەوە ناڵێین، حاشا و دوور لەوان، تەنانەت ئێمە ئەوانە بە ئیمام دەزانین و ئـەڵێین بەهەشـتین، هـەروەکو پەیامبـەری خـوا ﷺ لـە بـارەی عەلییەوە ﷺ فەرمویەتی- کاتێك لەسەر کێوی (حیراء) بوون-: جێگیر بە ئـەی (حیراء) ئەوەی لەسەر پشتی تۆیە پەیامبەر و صدیق و شەهیدە)[1]. جا لەوکاتە عەلیش ﷺ لەگەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ بوو بۆیە لە ئەهلی بەهەشتە.

هەروەها لە پەیامبەری خواوە ﷺ سابت بووە کە فەرموویەتی: (حەسـەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن )[2].

**ئەگەر ڕەفزکەرەکان وتیـان:** ئەبوبـەکر و عومـەر و ئـەبا عوبەیـدە، بـاقی هاوەڵەکانی تری پەیامبەرﷺ، لەوانەن کە لە حـەوزی پەیامبـە رﷺ پەڕاگەنـدە دەکرێن؟ئەوکات چی ڕێگری نەواصبەکانە کە بڵێن: عەلیش بەهەمان شێوە لـەو کەسانەیە کە لە حەوز دوور دەخرێنەوە.

**خۆ ئەگەر ووترا:** عەلی فەزڵەکانی باسکراون و چەسپاون؟

**ئەوکات وەڵام دەدرێنەوە:** ئەی جا فەزڵی لەوە زۆرتر بۆ ئەبوبـەکر و عومـەر باسکراون و چەسپاون.

## شوبهەی دووەم

## خوای گەورە مەدحی هەموو هاوەڵانی نەکردووە

(١) صحيح مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل طلحة والزبير (٢٤١٧).

(٢) سنن الترمذي: كتاب المناقب، باب مناقب الحسن والحسين حديث (٣٧٦٨). سنن ابن ماجه: المقدمة باب فضل علي بن أبي طالب حديث (١١٨). مسند أحمد حديث (١٠٦١٦).

لەسەر ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴾ [الفتح: ٢٩].

واتە: (موحەممەد نێردراوی خوایە و ئەوانەشی لەگەڵیدان زۆر توند و تیژن بەرانبەر بێ باوەڕان و بە بەزەیی و میهرەبانن بەرامبەر یەکتری، دەیان بینیت خەریکی کڕنوش و سوژدە بردنن، هیوایان بەدەستهێنانی بەهرە و ڕەزای خوایە، نیشانەیان وا بە ناوچاویانەوە لە ئەنجامی سوژدە بردنیان و عیبادەت کردنیان، جا ئەمە نمونە و وەسفیانە لە تەوراتدا، نمونەشیان لە ئینجیلدا وەکو ڕوەکێك (کشتوکاڵێك) وایە تازە چەکەرەی کردبێ و سەوز بوبێت، ئەنجا چەکەرەکەی بەهێز کردبێ و قایم بووبێ و جا ڕاوەستابێ لەسەر لاسکە ڕێك و قنجەکەی، ئەوەندە جوان بێ جوتیارەکانی سەرسام کردبێ، ئەم وەسفە بۆ ئەوەیە خوا کافرانی پێ داخ لەدڵ بکات، جا خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە، بە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە).

ڕووکەشی ئایەتەکە مەدحکردنی هاوەڵانی پەیامبەرە ﷺ، بەڵام خوای پەروەردەگار هەروەکو لەو ئایەتەی کە پێشتر باسمان کرد دەفەمەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ [آل عمران٧].

جا ئەوانە ڕۆیشتوون بۆ دوا ووشەکانی ئەم ئایەتە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم ﴾. ئەڵێن: ﴿ مِنْهُم ﴾ (مِنْ) لێردا بـۆ: هەنـدێك (کەمێك)ە، کە (مِـنْ ) لێرەدا بە مانای هەندێك هاتبێت، ئـەوا بـەم شـێوەیەی لێدێ (جا خوا بەڵێنی داوە بە هەندێکیان لەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە و کـردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە...)، کەواتە ئەم ئایەتە هەندێکیان دەگرێتەوە و ئەوانی تریان نەخێر.

ئەمەش بۆ سەر لێ تێکدانە و درۆیە، تەنانـەت هەنـدێکیان لـەوەش زیـاتر سنوری بەزاندوە و یەکـدەنگی موفەسـیرەکانی هێناوەتـەو[1] لەسـەر ئـەوەی کـە ﴿مِنْهُم﴾ لێرەدا بۆ هەندێك (کەمێك)ـە، یانی: بەڵێنی بەهەندێکیان..، ئەمەش دیسانەوە درۆیە لە زۆر ڕووەوە:

یەکەمیان: (مِنْ) لێرەدا لەسەر ڕای زانایانی تەفسیر بـۆ (هەنـدێك) بـەکار نەهاتووە. بەڵکو ﴿ مِنْهُم ﴾ لێرەدا بۆ یەکێك لەم دوو واتایە بەکار هاتووە :

واتای یەکەم: لە ڕەگەز وشێوەی ئەوان (هاورەگەزی و هاوشێوەیی): هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴾. واتە: -حەج ئەوەبوو کە باسکرا- جا ئـەوەی سـنوورەکانی خـوا بپارێزێـت و بـە گەورەیان دابنێت ڕێزیان لێبگرێت، ئەوە چاکترە بۆی لای پەروەردگاری، و گۆشتی ئاژەڵ -مەڕ و بزن و مانگا و وشتر- حەڵاڵ کراوە بۆتان جگە لەوانەی کـە بۆتـان

---

(١) (ثم اهتديت) للمتشيع التيجاني (١١٧).

باس دەکرێ و قەدەغەکراوە، کەواتە خۆتـان لـە پیسـەکان لـە جـۆری بتـەکانی بپارێزن، هەروەها خۆتان دوور بگرن لە قسەی درۆ و هەڵبەستراو و ناڕەوا.

جا خوای گەورە مەبەستی لەوە نییە کەوا خۆمان لە هەندێ پیسی بپارێزین و لە هەندێکی تریشی نەخێر خۆمان بە دوور نەگرین، بەڵکو خوازراوە و داوامـان لێکراوە کە خۆمان لە هەموو پیسیەکان بە دوور بگرین، بۆیە ئەو فەرمایشـتەی خوا کە دەفەرموێ: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ﴾ واتە: خۆتان لە پیسی بـە دوور بگرن لە هاوشێوەکانی ئەم پیسیانە.

واتای دووەم: یان ئەوەتانێ (مِنْ) لێرەدا بۆ تەئـکـیـــــد بێ، هەروەکو ئەو ئایەتەی کە خوا ـ دەفـەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ واتە: (لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شـیفا و ڕەحمەت و میهرەبانییە بۆ ئیمانداران، بەڵام بۆ ستەمکاران هـیچ زیـاد ناکـات بێجگە لە خەسارەت مەندی نەبێت).

ئەمە یانی ئەوە نییە کە قورئان هەندێکی شـیفا بێـت وهەنـدێکی تـری وا نەبێ، هەرگیز، بەڵکو قورئان هەر هەمووی شیفا و ڕەحمەتە. جا ﴿مِنْ﴾ لێـرەدا بۆ جەخت کردنەوە و تەئکید کردنەوەیە، واتە: بە تەئکید قورئان هـەر هـەمووی شیفا و ڕحمەتە، ئەم ئایەتەش بە هەمان شێوە.

کەوابوو ئـەوەی کـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿مِنْهُمْ﴾ واتـە: لـە هاوشێوەکانیان، یان بە واتای: تەئکید کردنەوە لەسەریان ڕەزای خوا لە هەموویان بێت.

دووەمیان: دوای ئەوەش با تەماشایەکی سیاقێکی ئایەتەکە بکەین، هەر هەمووی مەدحە و هیچ سەرزەنشتێکی بۆ هەندێکیشیان تێدا نییە، بەڵکو مەدحی هەموویانی کردووە، هەروەك خوا خۆی دەفەرموێ: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا﴾ دەبینی تەزکیەی ڕوکەشیان دەکات بە کڕنووش بردن و ڕکوع بردن و ملکچ بوون، پاشان تەزکیەی هەناویان دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾ واتە: (هیوایان بەدەستهێنانی بەهرە و ڕەزای خوایە)نەك وەك ئەوەی کە لە بارەی مونافیقەکانەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ واتە: (بەڕاستی مونافیقەکان دەیانەوێ خوا بخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە، هەر کاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمبەڵی و سستی هەڵدەستن، ڕوپامایی بۆ خەڵك دەکەن و زۆر کەم یادی خوا دەکەن).

تەماشاکە چۆن وەسفی مونافیقەکان دەکات، تەزکیەی دڵ و هەناویان ناکات، بەڵکو بە درۆشیان دەخاتەوە، لە کاتێکدا لە ڕوکەشدا لەگەڵ ئیمانداران نوێژ دەکەن، بەڵام هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ خودا دەفەرموێ: (هیوایان بەدەستهێنانی فەزڵ و ڕەزای خوایە ).

هەر بۆیە گووتەی: ﴿مِنْهُمْ﴾ لە بۆ ڕەگەزی ئەوانە، یا لە بۆ تەئکید کردنەوەیە لەسەر حاڵ و باری ئەوان؛ ووتەی زۆربەی موفەسیرەکانە، بەڵکو ئەوەندەی من بزانم ووتەی هەموو زانا موفەسیرەکانی ئەهلی سوننەت و

جەماعەتە وەكو نەسەفی و ئیبن جەوزی و ئـیبن ئەلئـەنباری و زەمەخشـەری[1] و زەججاج و عەكبەری و نیسابوری و ئیبن كەسیر و تەبەری وئـەوانی تـریش، هـەر هەموو ئەمانە كاتێك باسی ئەم ئایەتە دەكـەن دەڵـێن: بـە دڵنیاییـەوە ( مِـنْ ) لێرەدا بۆ تەئكیدكردنەوەیە، یان بۆ هاوڕەگەزە و بـە مانـای (هەنـدێك ) بـەكار نەهاتووە، هەروەك هەندێك ئیددیعای دەكەن[2].

***

(١) هەموو ئەم موفەسیرانە لە ئەهلی سوننەت نـین، بـەڵكو زەمەخشـەری پێشـەوایەكە لـە پێشەوایانی موعتەزیلە هەروەها نەسەفیش. (م.خلیل)

(٢) وانظر (اعراب القرآن وصرفه وبیانه) لمحمود صافي ج٢٥/٢٦ ص٢٧٢.

# شوبههەی سێیەم

## لە عومرەی حودەیبییەدا پەیامبەریان ﷺ تورە کردووە

دوا ئەوەی پەیامبەری خوا ﷺ ئاشتەوایی حودەیبییەی لەگەڵ قورەیشدا بەست و گەڕایەوەو عومرەی نەکرد، فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی هەڵسن سەریان بتاشن و ئاژەڵەکانیان سەر ببڕن، ئەوەبوو کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ تورە بوو.

خەڵکانێك دەڵێن: کەسێك کە پەیامبەری خوا ﷺ تورە بکات مەحاڵە عادل بێت.

**وەڵامی ئەمەش:**

**یەکەم: باسی حاڵ و باری هاوەڵان لە حودەیبییەدا:**

عورووەی کوڕی مەسعود بە قورەیش دەڵێ: (ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا چوومەتە لای پاشاکان، لای قەیسەر لای کیسرا لای نەجاشی، دە بەخوا پاشایەکم نەبینیوە دەوروبەرەکەی بەگەورەی ڕاگرن بە ئەندازەی بە گەورە ڕاگرتنی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەد، دە بەخوا تفێك ناکات ئیلا دەکەوێتە نێو دەستی یەکێکیانەوە و دەیهێنێت بە دەموچاو و لاشەی خۆی و ئەگەر فەرمانێکیان پێ بکات یەکسەر دەست پێشخەری لە جێبەجێ کردنی دەکەن، ئەگەریش دەست نوێژی بگرتایە وەخت بوو بکەنە شەڕ لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی، گەر قسەی بکردایە بێ دەنگ دەبوون بە ئەندازەیەك ئەوەندە گەورە و

شکۆدار بوو لە پێش چاویان بە پڕی تەماشای نێو چاوانیان نەدەکرد)[1] جا بۆیە کارەکە لە سەرپێچی کردنی فەرمانی پەیامبەری خوا ﷺ نەبووە، بەڵکو لە شەیداو شەوقی هاوەڵان بووە بۆ حەرەمی ماڵی خوا و حەزیان ئەکرد کە پەیامبەری خوا ﷺ ڕەئی بگۆڕیایە، یان خوای بەرز و پیرۆز وەحی دابەزاندایە و فەرمانی بە پەیامبەر ﷺ بکردایە کە بڕواتە مەککەوە. لەبەر ئەمە دواکەوتن لە جێبەجێکردنی فەرمانەکەی پەیامبەری خوا ﷺ، بەڵگەی ئەمەش داناییەکەی ئوم سەلەمە بوو ڕەزای خوای لێبێ، کە کاتێك ئەوەی بینی بە پەیامبەری خوای ﷺ وت: تۆ سەری خۆت بتاشە و ئاژەڵی خۆت سەر ببڕە[2]

ئەوەبوو پەیامبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە و سەری تاشی و ئاژەڵەکەی سەربڕی، هەر کە ئەو کارەی کرد هەموو هاوەڵان هەستان و سەریانتاشی و ئاژەڵیان سەربڕی بەبێ دووبارە فەرمان پێکردنەوە، کەوابوو مەسەلەکە سەرپێچی کردن نەبووە هەر کە پەیامبەری خوایان ﷺ بینی سەری تاشی و ئاژەڵەکەی سەربڕی، زانیان کارەکە تەواوبووە و دەرفەتێك نەماوەتەوە بۆ پاشیمان بوونەوە، بۆیە ڕاستەخۆ هەستان سەریان تاشی و ئاژەڵیان سەربڕی و وەڵامی فەرمانەکەی

(١) صحيح البخاري: كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد حديث (٢٧٣١ و ٢٧٣٢).

(٢) ئەوە پەیامبەری خوایە ﷺ بە قسەی ژن دەکات و پرسی پێ دەکات، نە وەك هەندێك فەرمودەی چعیف ئەڵێ پرس بە ژن بکە و بە قسەی مەکە، ئەمە ووتەی کوردەواری خۆشمانە، ئەمەش ڕاستیەکەو ئەبێ گوتری، لە ڕۆژێکدا کە لەسەر ئافرەت تانەی زۆر لە ئیسلام دەدەرێت، ئێمەیش پێیان ئەڵێین: ئەوە گەورە و سەروەرەکەمانە ﷺ پرسی کردوون و بە قسەی کردوون، خوای تەعالاش دەفەرموێ: (نمونەی چاولێکەری و سەرمەشقی چاك لە پەیامبەردایە ﷺ لە بۆ ئێوە). (وەرگێڕ)

خوایان دایەوە و خواش -سبحانە- ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاندنە خوارەوە: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا﴾ {الفتح:١٨}. واتە: (سوێند بەخوا بێ گومان خوا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی کە لە ژێر دارەکەدا پەیمانیان پێدای، خوا زانی چی لە دڵیاندایە، بۆیە سەکینە و ئارامی بۆ ناردن و پاداشتیانی بە سەرکەوتنێکی نزیك دایەوە). هەروەها ئەو فەرمایشتەشی دابەزاندە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ {الفتح ٢٩}.

بەو بۆنەوەیەوە هەموو سورەتی فەتحی دوای ئاشتەوایی حودەیبیە دابەزاندە خوارەوە و ناوی فەتحیشی لێناوە، هەر ئەوەش فەتحی ڕاستەقینەیە کە خوای گەورە بۆ پەیامبەرەکەی ﷺ ئەنجامیدا.

**بە هەمان شێوە ئەڵێین:** ئەم مەسەلەیەش تەنها شیعە دەیکەنە بەڵگە، نە نەواصب و نە خەوارج و نە موعتەزیلە هیچ کامیان ئەم فەرموودەیەیان نەکردۆتە بەڵگە.

بە شیعەش دەڵێین: باشە عەلیان لەگەڵدا بوو یان نا؟!

بە ئیجماعی سوننە و شیعە عەلیان ﷺ لەگەڵدا بووە، تەنانەت نووسراوی صولحەکەی نێوان پەیامبەر ﷺ و سوهەیلی کوڕی عەمر ئەو نووسیەوە، عەلیش

بەهەمان شێوە نە ئاژەڵی سەربڕی نە سەری تاشی، جا ئەوەی زەم بێ بۆ هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ زەمیشە بۆ عەلی ﷺ، بەڵام ئێمە نە سەرزەنشتی عەلی دەکەین و نە سەرزەنشتی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ.

هەروەها عەلیشﷺ لەم کاتەدا فەرمانی پەیامبەری خوای ﷺ ڕەتکردەوە، ئەو کاتەی پەیامبەر ﷺ پێی ووت ناوەکەی بسڕێتەوە، ئایا ئەویش لەسەر ئەوکارەی لۆمە دەکری ![1].

* * *

(١) ئەم جۆرە ووتانەی نوسەر، تەنها لە ڕوانگەی جەدەلەوە دەیهێنێتەوە، وەگەرنا لە بیروباوەڕی ئێمەدا ڕق لێبوونی ئیمامی عەلی ﷺ نیشانەی مونافیقەکانە، جا بەکارهێنانی ئەم شێوازە لەم جێگایەدا زەرورە و هەموو دەرگایەك لە نەیارەکانی دەبەستێت، چونکە گەر بڵێن ئەو کارەی هاوەڵان هەڵەیە بەهۆی سەرپێچیەکەیانەوە ! ئەوا خودی ئیمامی عەلی ﷺ سەرپێچی کردووە، خۆ ئەگەر وتیان ئەویش هەڵەی کردووە ئەوا هەر لە بنەڕتەوە مەزهەبەکەی خۆیان لەبن دێنن، چونکە لە بنچینەکانی مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی: عەلی مەعصومە و نابێ هەڵە بکات ! یان ئەوەتا بێتە ڕیزی ئەهلی هەقەوە، ئەمەش ئەو ئامانجەیە کە ئێمە پەنجە و قەڵەمانی لە پێناودا شەکەت دەکەین، بە کورتی نووسەر لە کەواو سەڵتەکەی خۆی دێتە دەر و جلوبەرگەکەی ئەوان لەبەر دەکات، بەڵکو جلوبەرگەکەی خۆیان ببینن تا بزانن تا چەند پەسەندە؟! (وەرگێڕ)

# شوبهەی چوارەم

## ئەو گومانەیان: کە پەیامبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەوانەی بەشداری سوپاکەی ئوسامە ناکەن، کەچی ئەبوبەکر و عومەر بەشداریان نەکردووە:

ئەوان ئەڵێن: پەیامبەری خوا ﷺ سوپای ئوسامەی ئامادەکرد، جا لە نێو سوپاکەدا ئەبوبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدە و زۆربەی هاوەڵانی تێدا بووە و پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (نەفرەتی خوا لەوەی لەگەڵ سوپای ئوسامەدا ناڕوات).

ئەوەبوو کاتێک پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد سوپاکەی ئوسامە بەڕێکەوت، نە ئەبوبەکر و نە عومەر لەگەڵیدا دەرنەچوون، ئەڵێن: کەوابوو لەسەر زووبانی پەیامبەری خوا ﷺ هەردووکیان نەفرین لێکراون.

**وەڵام:**

**یەکەم:** ئەڵێین ئەمە درۆیە، سابت نەبووە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی: (نەفرەتی خوا لەوەی لەگەڵ سوپای ئوسامەدا ناڕوات)، بەڵێ پەیامبەری خوا ﷺ سوپاکەی ئوسامەی ئامادەکردوە بەڵام نەفرینی نەکردووە لەوەی دوا بکەوێت لێی.

**دووەم:** ئەبوبەکری صدیق ﷺ لە نێو سوپاکەی ئوسامە نەبووە، ئاخر چۆن لە نێو سوپاکەی ئوسامە بووە کەچی لەولاوە هەر دوازدە ڕۆژی نەخۆشیەکەی

پەیامبەرﷺ پێش نوێژی بە خەڵك كردووە؟ چۆن لەگەڵ سوپاكە دەریدەكات و لێرەشەوە فەرمانی پیش نوێژیكردنی پێ دەكات؟

بە نیسبەت عومەرەوە، بەڵێ ئەو لە نێو سوپاكەی ئوسامە بووە، بەڵام كاتێك پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد و هێشتا سوپاكە بەڕێ نەكەوتبوو، ئەبوبەكر ڕۆیشت بۆلای ئوسامە و ئیزنی لێخواست كە عومەر لەلای بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی لە كاروبارەكانیدا پرس و ڕاوێژی پێبكات.

ئەمەش لە نیشانەكانی ڕەوشت بەرزی ئەبوبەكرە، وەگەرنا دەیتوانی عومەری كوڕی خەتتاب گلداتەوە بەبێ ڕوخسەت خواستن لە ئوسامەي.

ئەویش ڕوخسەتی دا و عومەر لەلای ئەبوبەكری صدیق مایەوە.

ئا ئەمەیە چیرۆكی ئوسامە، نەك ئەوەی ئیدیعای دەكەن[1]

❊ ❊ ❊

---

(١) انظر: (تاريخ الطبري) (٢/٤٢٩)، و(الكامل) (٢/٢١٥)، و(البداية والنهاية) (٥/٣٠٢) وما بعدها.

# شوبهەی پێنجەم

## کوشتنی مالکی کوڕی نوەیرە لە لایەن خالدی کوڕی وەلیدەوە

کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد زۆرێك لـە عـەرەب هەڵگەڕانـەوە، ئەبوبەکر چەند سوپایەکی نارد بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڵگـەڕاوەکان، یـەکێك لـە فەرماندەی ئەو سوپایانە خالدی کوڕی وەلید بوو، ئەبوبەکری صـدیق نـاردی بـۆ کوشتاری موسەیلەمەی درۆزن ئەوەی کە بانگەشەی پەیامبەرایەتی دەکرد، خالد توانی سەربکەوێت بەسەریدا لە شەڕێکی زۆر گەورەدا کە پێی دەگوترێت جەنگی (ئەلحەدیقە).

پاشـان خالـد هـەڵی کوتایـە سـەر ئـەو هـۆزە عەرەبانـەی کـە لـە دیـن هەڵگەڕابوونەوە، ئەگەر گەڕانەوە بۆ دیـن ئـەوە چـاکە وە گـەرنا شـەڕی لەگـەڵ دەکردن، جا لەوانەی کە خالدی کوڕی وەلید چوو بۆیان هۆزەکەی مـالکی کـوڕی نوەیرە بوو، چونکە ئامادە نەبوون زەکات بە ئەبوبەکری صدیق بدەن، بەڵکو هـەر نەیان دەدا.

ئـەوەبوو خالـدی کـوڕی وەلیـد هاتـە لایـان و پێـی ووتـن: کـوا زەکـاتی ماڵەکانتان؟ ئەوە چیتانە وا جیاوازیتان خستۆتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە؟!

مالکی کـوڕی نـوەیرە وتـی: لـە ڕاسـتیدا ئێمـە ئـەو پارەیـەمان دەدا بـە هاوەڵەکەتان تا لە دونیا بوو ئەوەتا مرد، ئیتر ئەبوبەکر چیەتی چی دەوێ؟

خالدیش تورە بوو و وتی: بۆ ئەوە هاوەڵی ئێمەیە و هاوەڵی تۆ نییە، بۆیە فەرمانی کرد بە ضیراری کوڕی ئەزور لە گەردنی دا.

هەندێکی تر ئەڵێن: مالك شوێنی ئەو (سەجاح)ـە کەوتووە کە بانگەشەی پەیامبەرایەتی کردوە[١]

هەروەها ڕیوایەتێکی تر هەیە ئەڵێ: دوای ئەوەی خالد قسەی لەگەڵ کردن و ڕێگری ئەو کارەی لێکردن و بەشێکی زۆریانی بە دیل گرت، بە سەربازەکانی وت: دیلەکان گەرم کەنەوە، چونکە شەوێکی سارد بوو، جا لە زمانی (سەقیف)دا، پیاوەکە گەرم کەرەوە، یانی: بیکوژرە[٢]، وا تێگەیشتن خالد مەبەستی کوشتنە، ئیتر هەموویانیان کوشت بەبێ فەرمانی خالدی کوڕی وەلیدا.

کام لەم سێ شتە ڕوویدا بێت، ئەوا کوشتنیان یا هەق بووە یا ئەوەتا تەئویل بووە، ئەمەش نابێتە عەیبەیەك بۆی.

سەبارەت بەو قسەیەیان کەوا: خالدی کوڕی وەلید دوای ئەوەی مالکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە، لە هەمان شەودا ڕۆیشتۆتە لای خێزانەکەی، ئەمە درۆیە، چونکە دوای ئەوەی خالد کوشتاری کردن و ئافرەتەکانیانی بە دیل گرتن، ئەمیانی بۆخۆی گلدایەوە، ئەمیش دیلی جەنگە. بەڵام ئەوەی هەر لە هەمان شەودا ڕۆیشتبێتە لای یا لەبەر ژنەکەی کوشتبێتی، ئەمانە هەمووی درۆن[٣].

---

(١) ئیبن طاووس یەکێکە لە زانایانی شیعە ئەڵێ: (هۆزی تەمیم و زەیات هەڵگەڕانەوە و پاشان مالکی کوڕی نوەیرەی یەربوعیان کرد بە گەورەی خۆیان). بڕوانە کتێبی: ((فصل الخطاب في اثبات تحريف كتاب رب الأرباب)) ص ١٠٥.

(٢) لە کوردی خۆشماندا یەکێك یەکێك بکوژێ دەوترێ ساردی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٣) انظر (البداية و النهاية) (٦/٣٢٦).

خالدی کوڕی وەلید ﷺ تێکۆشەری ڕێی دینی خوا ئەڵێ: (ئەگەر لە شەوێکی پڕسەرماو سۆڵەی سەخت بەیانی لە نێو دوژمندا بکەمەوە پێم خۆشترە لەوەی بۆکێکم بۆ بهێنن یان مژدەی کوڕێکم پێ بدەن)[1].

بەڕاستی ئەو پیاوە یەکێکە لە فەرمانداره هەرە گەورە و مەزنەکان، پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێ: (خالد شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا، لەسەر موشریکەکان هەڵێکێشاوە )[2].

کاتێکیش خالد ئەم کارەی ئەنجامدا -کوشتنی مالکی کوڕی نوەیرە و هاوڕێکانی-عومەری کوڕی خەتتاب بە ئەبوبەکری وت: خالد لابە، شیرەکەی خوێن ڕێژە. ئەبوبەکر وتی: (نە بە خوا شتی وانابێ!! ئەو شمشێرێکە خوا هەڵێکێشاوە لەسەر موشریکەکان )[3].

خۆ ئەگەر ئەوان ئەوەی ئەبوبەکر بە ناڕەوا دەزانن لە نەکوشتنی بکوژەکەی مالکی کوڕی نوەیرە، ئەی بۆ ئەوەی عەلی بۆ هیچ ناڵێن کە بکوژەکانی عوسمانی نەکوشت، خۆ عوسمان هاوەڵ و زاوای پەیامبەرە ﷺ و خەلیفەی موسڵمانانە، لە کاتێکدا مالکی کوڕی نوەیرە گومان لە ئیسلام بوونەکەی هەیە، بۆیە ئەگەر عەلی ﷺ عوزری هەبێ ئەوا ئەبوبەکریش بەهەمان شێوە عوزری هەیە.

---

(١) انظر (البداية و النهاية ) (٧/١١٧).

(٢) (صحيح البخاري): كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب خالد بن الوليد، حديث (٣٧٥٧)، الفقرة الاولي من الحديث. والحديث رواه ابن عساكر كاملا (٨/١٥)، وانظر سلسلة الصحيحة (١٢٣٧). وانظر: ( تاريخ الطبري) أحداث سنة ١١هـ ذكر البطاح وخبره، و ( البداية والنهاية )، خلافة أبي بكر: فصل مقتل مالك بن نويرة.

(٣) ( الكامل في التاريخ) لابن الأثير (٢/٢٤٢) بتصرف.

هەروەها کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب گەیشت بە موتەمیمی کوڕی نوەیرەی برای مالك، پێی وت: چی ئەڵێی لە بارەی براکەتەوە؟

موتەمیم وتی :

وَكُنَّا كَنَدْمَانَيْ جَذِيمَةَ حِقْبَةً مِنَ الدَّهْرِ حَتَّى قِيلَ: لَنْ يَتَصَدَّعَا
فَلَمَّا تَفَرَّقْنَا كَأَنِّي وَمَالِكًا لِطُولِ اجْتِمَاعٍ لَمْ نَبِتْ لَيْلَةً مَعًا

ئێمە وەکو دوو هاودەمەکەی جەزیمە

زەمانێك پیکەوە بووین تا وترا جیا نابنەوە

کاتێکیش جیابووینەوە وەکو ئەوەی

من ومالك شەوێکیش پێکەوە کۆنەبوبێتینەوە

عومەر وتی: دە بەخوا منیش حەزم دەکرد وەك ئەوەی تو ئاوا هۆنینەوەم بۆ زەیدی برام بگوتبایە[1]، موتەمیم وتی: ئەگەر براکەی من لەسەر ئەوە بمردایە کە براکەی تۆ لەسەری مرد هۆنراوەم بۆ نەدەگوت. عومەر وتی: کەس وەك تۆ سەرخۆشی براکەمی لێنەکردم.

جا ئەم زەیدە لە جەنگی یەمامەدا لە شەڕی هەڵگەڕاوەکان لەگەڵ بەنی حەنیفەدا شەهید بوو.

❊ ❊ ❊

(١) (الكامل في التاريخ) لابن الأثير (٢/٤٢٤).

# شوبههەی شەشەم

## کوشتنی حیجری کوڕی عەدی لە لایەن موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە

**ئەڵێن:** موعاویە بە ناهەق هەستاوە بە کوشتنی حیجری کوڕی عـەدی کـە یەکێکە لە هاوەڵانی پەیامبەرﷺ. **منیش ئەڵێم:** جارێ حیجـری کـوڕی عـەدی جیاوازی هەیە لەوەی کە ئایا سەحابەیە یا تابعی، جمهوری زانایان لەسەر ئـەوەن کە حیجری کوڕی عەدی شوێنکەوتەیە و هاوەڵ نییە، ئەمەش بۆچوونی بوخاری و ئەبی حاتیمی ڕازی و ئین حیببان و ئیبن سەعد و خەلیفەی کوڕی خەیات وئەوانی تریشە، هەر هەمویان وتوویانە: حیجری کوڕی عەدی لە شـوێنکەوتووان بـووە و هاوەڵ نەبووە[1]

### بۆچی موعاویە حیجری کوڕی عەدی کوشت؟

حیجری کوڕی عەدی لە شوێنەکەوتووانی عەلی کوڕی ئەبو تالب بـووە ولـە شەڕی صیففینیشـدا لـەنێو سـوپاکەی بـووە، دوای وازهێنـانی حەسـەن لـە بـۆ موعاویە و هێور بوونەوەی بارودۆخەکە، کـە نـاونرا سـاڵی کۆمـەڵ (الجماعـة )، موعاویە هەستا و زیادی کوڕی باوکی (إبن أبیه)، یان زیادی کوڕی ئەبو سوفیان ـ هەروەك دوایی باسی لێوە دەکەین- کرد بە والی کوفە، حاڵی خەڵکی کوفـەش لای کەس شاراوە نییە، هەر ئەوان عەلیان کوشت و ناپاکیان لە حەسـەنی کـوڕی

(١) (الاصابة) (١/٣١٣).

کرد و غەدریان بەرامبەر حوسەینی کوڕی کرد و دوایش کوشتیان، لە سەردەمی عومەریشدا تانەیان لە ویلایەتەکەی سەعد دا، تانەیان لە ویلایەتەکەی وەلیدی کوڕی عوقبە دا، تانەیان لە ویلایەتەکەی ئەبو موسای ئەشعەری دا، بەڵکو هەرگیز کەس ڕازی نەکردوون مەگەر بە هێزی شمشێر نەبێت. جا ئەم زیادە لە لایەن عەلیەوە کرابوو بە والی بەصرە، کەواتە زیاد لە والیەکانی عەلی کوڕی ئەبو تالبە رضي الله عنه[1]. کاتێکیش موعاویە هات لەسەر والیەتی بەسرە هێشتیەوە و کوفەشی بۆ زیاد کرد. ئەوەبوو ڕۆژێك زیاد هەستا و ووتاری هەینی خوێندەوە، ئەڵێن: درێژەی بە ووتارەکە داوە، حیجری کوڕی عەدیش هەستاوە و وتوویەتی: نوێژ، نوێژ. بەڵام زیاد هەر بەردەوام بوو لەسەر ووتارەکەی، حیجری کوڕی عەدی هەستا و کەوتە بەرد تێگرتنی، ئیتر شوێنکەوتەکانی حیجری کوڕی عەدیش هەستان بە بەردباران کردنی، ئەویش هەر خەریك ووتاردانە، دوایی زیاد هەستا موعاویەی لە باسەکە ئاگادار کردەوە، ئەویش فەرمانی کرد حیجری کوڕی عەدی بۆ بهێنن و پاشان فەرمانی کوشتنی دا، چونکە دەیویست ئاژاوە بنێتەوە[2]. موعاویەش دەیویست فیتنە و ئاژاوە بنبڕ بکات بۆیە فەرمانی کرد بکوژرێت، کاتێکیش عائیشە لە موعاویەی پرسی: بۆچی حیجری کوڕی عەدیت کوشت؟ موعاویە وتی: واز لە من و حیجر بێنن تا لای خوا بەیەك دەگەینەوە[3].

ئێمەش ئەڵێین: واز لە خۆیی و حیجر بێنن تا لای خوا بەیەك دەگەنەوە.

---

(١) (تاريخ خليفة بن خياط) (ص ٢٠١ - ٢٠٢).
(٢) (الاصابة١/٣١٣)، (سير أعلام النبلاء ٣/٤٦٦ - ٤٦٣)، (البداية والنهاية ٨/٥٢).
(٣) (البداية والنهاية) (٨/٥٥)، و (العواصم من القواصم) (ص ٢٢٠).

# شوبهەی حەوتەم

## ستەمی ئەبوبەکر لە میراتەکەی فاتیمە

**ئەڵێن:** دوای وەفاتکردنی پەیامبەر ﷺ فاتیمە هاتەلای ئەبوبەکری صدیق و داوای میراتەکەی پەیامبەری ﷺ لێکرد، بەڵام ئەبوبەکر هەقەکەی پێنەدا.

ئەوانەی ئەمە دەکەنە بەڵگە دیسانەوە شیعەکانن و، جیاوازن لە ئاراستەکردنی داواکاریەکەی فاتیمە بۆ فەدەك[1] هەندێکیان ئەڵێن: فەدەك میراتی پەیامبەری خوابووە ﷺ بۆ فاتیمە.

ئەوانی تر ئەڵێن: ئەمە دیاریەکە پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا بەخشیویێتی بە فاتیمە.

ئەگەر لەسەر قسەی یەکەم بێت -کە فەدەك میراتی پەیامبەری خوایە ﷺ: ئەوە لە ڕیوایەتە صەحیحەکەدا هاتووە: (دوای وەفاتکردنی پەیامبەری خوا ﷺ، فاتیمە هاتەلای ئەبوبەکر و داوای ئەو میراتەی لێکرد کە لە پەیامبەری ﷺ دەیکەوێت لە فەدەك و بەشی پەیامبەر ﷺ لە خەیبەر و شتەکانی تریش، بەڵام ئەبوبەکری صدیق وتی: ئە من گوێم لە پەیامبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ((إنا لا نُورَث ما تركناه صدقةٌ))[2]. واتە: (لە ڕاستیدا ئێمە میراتمان نییە، ئەوەشی بەجێی دێڵین خێر و صەدەقەیە). یان «ما تَركْنا صدقةٌ»[3]. واتە: (ئەوەی بەجێی

---

(١) فەدەك ناوی زەویەکە پەیامبەری خوا ﷺ لە یەهودیەکانی خەیبەر دەستی کەوت.

(٢) (صحيح مسلم): كتاب الجهاد والسير، باب حكم الفيء حديث(١٧٥٧).

(٣) (متفق عليه): (صحيح مسلم)، كتاب فرض الخمس، باب فرض الخمس، حديث (٣٠٩٣)، (صحيح مسلم): كتاب الجهاد والسير، باب قول النبي لانورث حديث(١٧٥٩).

دیلّین صەدەقەیە). یان: «ما تركنا فهو صدقة» واتە: (ئەوەی بەجێی دەهێڵین ئائەوە خێروصەدەقەیە)[(١)]. بە سێ ڕیوایەت.

ئەبوبەكر ئاوهای ووت بە فاتیمە -ڕەزای خوا لە هەردوكیان بێت-، لە ریوایەتێكی ئەحمەدیشدا هاتووە ئەفەرموێ: «إنّا معشر الأنبياءِ لا نُورَث»[(٢)]، واتە: (ئێمەی گرۆی پەیامبەران میراتمان نییە).

بەڵام ڕیوایەتەكەی هەردوو صەحیحەكە: «إنا لا نُورَث ما تركناه صدقة» واتە: (لە ڕاستیدا ئێمە میراتمان نییە، ئەوەشی بەجێی دیلّین خێر و صەدەقەیە)، بەو هۆیەوە فاتیمە دڵی لە ئەبوبەكر ما -تورە بوو-.

ئیتر یان ئەوەتا ئەو پێی وا بووبێ ئەبوبەكر هەڵە لە فەرموودەكەی پەیامبەر ﷺ گەیشتووە، یان ئەوەی هەڵە بیستوویەتی، بەڵام ئەم ئەو فەرمایشتە گشتییەی پەروەردگاری كردە بەڵگە كە دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ {النساء:١١}.

واتە: (خوا ئامۆژگاریتان دەكات (میراتی) ڕۆڵەكانتان، بۆ نێرێك هەیە (لە میرات) بە وێنەی بەشی دوو مێ، خۆ ئەگەر تەنها ئافرەت بوون (دووان و) زیاد

(١) متفق عليه: (صحيح مسلم)، كتاب المناقب، باب مناقب قرابة رسول الله ح رقم (٣٧١٢)، (صحيح مسلم): كتاب الجهاد والسير، باب قول النبي لانورث حديث (١٧٥٨).
(٢) (مسند أحمد) (٣/٢٥٥).

لە دووان، ئەوا دوو بەش لە سێ بەشی ئەوەی مردوەکە بەجێی هێشتووە بۆیان هەیە، بەڵام ئەگەر یەك ئافرەت بوو ئەوا نیوەی میراتەکەی بۆ هەیە وە شەش یەك بۆ هەرکام لە دایك و باوکی مردوەکە هەیە لەوەی کە بەجێی هێشتووە، ئەمە ئەگەر مردوەکە منداڵی هەبوو، بەڵام ئەگەر مردوەکە منداڵی نەبوو منداڵی نەبوو دایك و باوکی میراتگری بوون، ئەوا سێ یەك بۆ دایکەکەیەتی، بەڵام ئەگەر چەند برایەکی هەبوو ئەوا شەش یەك بۆ دایکەکەیەتی، ئەمە لە پاش دەرکردنی وەسیەتێك کە لە لایەن مردوەکەوە وەسیەتی پێ کرابێ، یان دانەوەی قەزرێك کە لە سەری بێت، باوکەکانتان و کوڕەکانتان نازانن کامیان بە سوودترن بۆتان، ئەو دابەشکردنە لە لایەن خواوە پێویست کراوە بۆتان، بەڕاستی خوا هەمیشە زانای دانایە).

لە ڕاستیدا ئەهلی سوننە لەم مەسەلەیەدا بەدوای عوزردا ناگەڕێن بۆ ئەبوبەکر، بەڵکو بۆ فاتیمە بەدوای عوزرێکدا دەگەڕێن، چونکە ئەوان وا دەبینن ئەبوبەکر فەرموودەیەکی کردۆتە بەڵگە خۆی لە پەیامبەری خواوەﷺ بیستوویەتی، کە ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی ، عەبباس، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و زوبەیری کوڕی عەوام، هەر هەموو ئەمانە فەرمودەکەیان لە پەیامبەری خواوەﷺ گێڕاوەتەوە، کە ئێمە میراتمان نییە، ئەوەشی بەجێی دێڵین صەدەقەیە.

کە فاتیمە ڕەزای خوای لێبێ بەم قسەیە قایل نەبووە، ئەهلی سوننە ڕۆیشتوون بەدوای عوزرێك بگەڕێن بۆ فاتیمە، نەك بۆ ئەبوبەکر، چونکە ئەوان پێیان وا نییە لێرەدا ئەبوبەکر هەڵەیەکی لە ئاست فاتیمە کردبێت.

**هەروەها ئەڵێن:** فاتیمە تووڕەبووە لە ئەبوبەکر!!

**ئێمەش ئەڵێین:** تووڕەبوونی فاتیمە هیچ زیانێك بە ئەبوبەكر ناگەیەنێ گەر خوا لێی ڕازی بووبێ، خوای پایەبەرز دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ {الفتح:١٨}.

واتە: (سوێند بێت خودا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی کە لە ژێر دارەکەدا بەیعەتیان پێدای، خوا زانی چی لە دڵیاندایە، بۆیە سەکینە و ئارامی دابەزاندە سەریان و پاداشتیانی بە سەرکەوتنێکی نزیك دایەوە).

ئەوبەكریش لەو ڕۆژەدا لە پێشەوەی ئەو ئیماندارانە بوو کە بەیعەتیان دا بە پەیامبەر ﷺ، هەر کەسێك خوای بەرز و پیرۆز لێی ڕازی بێ و پەیامبەری خوا ﷺ لێی ڕازی بێ، تووڕەبوونی هیچ کەسێك زیانی پێناگەیەنێت.

**هەروەها ئەڵێین:** ئەگەر هەر کەسێك خۆی بخاتە شوێنەکەی ئەبوبەکر، فاتیمە -ڕەزای خوای لێبێت- بێت بۆلای و داوای میراتی لێبکات، لە کاتێکدا گوێبیستی پەیامبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویەتی: (میراتمان نییە)، ئایا فەرموودەی پەیامبەر ﷺ پێش دەخات، یان ڕەزای فاتیمە -ڕەزای خوای لێبێ-؟

* **هەروەها** لە بارەی ئەوەی کە فاتیمە دڵی لە ئەبوبەکر ماوە ! !

ئەڵێین: ئەوەی دەردەکەوێت ئەم دێڕە [فاتیمە لە ئەبوبەکر توڕەبوو]، لە زیادەکان و پێوەلکان (ادراج)ـەکانی زوهریە[1] و لە ئەسڵی ڕیوایەتەکەدا نییە.

---

(١) ئیمامی زوهری ڕەحمەتی خوای لێبێ مەشهورە بەمە، دوای گێڕانەوەی فەرموودەکە یان لەو نێوەندەدا، قسەیەك دەکات بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بدات کە ئەوە سەر بە فەرموودەکە نییە و قسەی خۆیەتی. لەمەوە بۆت دەردەکەوێت فەرموودەی (مُدرج): بریتییە لەو زیادەیەی، کە= =هەواڵخوانەکان دەیخەنە سەر فەرموودەکە بەبێ ئاماژە بۆ کردنی، بەهۆی ڕاڤەی فەرموودەکەوە

ئێستاش زیاتر و درێژ تر بەرپەرچی ئەم بەڵگەیە دەدەینەوە:

*** سەبارەت بەوەی کە دەڵێن: میرات بووە!!**

ئەڵێین: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إنا لا نُورَث ما تركنا صدقةٌ» یانی ئەوەی بەجێی دێڵین ئەوە صەدەقەیە، لەبەر ئەو ڕێگایانەی فەرموودەکەدا کە لە لای موسلیم هاتووە ئەفەرموێ: «ما تركنا فهو صدقةٌ» واتە: (ئەوەی بە جێی دێڵین ئەوە صەدەقەیە).

هەندێك دەستکاری فەموودەکەیان کردوە و دەڵێن: «ما تركنا صدقةً»، ئەو (ما) دەکەنە نەرێ، بە واتای: هیچ صەدەقەیەکمان جێ نەهێشتووە !!

بەڵام ئەهلی سوننە لێرەدا ئەو (ما) دەکەنە «مَوْصُولَة»، ئەمەش ڕیوایەتی صەحیحە هەروەك لە (الصحيحين) دا هاتووە «ما تركنا صدقةٌ» بە مەرفوعی[1]، ئەوەشی پشتگیری ئەم ڕیوایەتە دەکات، ڕیوایەتی: «ما تركنا فهو صدقةٌ» (ئەوەی بەجێی دێڵین ئەوە صەدەقەیە).

پەیامبەری خوا سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ میراتی نییە، تەنانەت لەسەر ڕای ڕاست هەموو پەیامبەرانیش میراتیان نییە.

بۆ ئەم مەبەستە ئەوان ئەو فەرمایشتەی خوای مەزن دەکەنە بەڵگە وا لە بارەی زەکەریاوە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴾ {مريم٥-٦}. واتە:

---

بێت یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر، ئیتر ئەو زیادەیە هەندێك جار لە سەرەتایە و هەندێك جار لە ناوەڕاست و هەندێك جار لە کۆتایی. (وەرگێڕ)

(١) ڕەفعی لە ڕوی ئیعرابەوە نەك لە ڕووی عیلمی حەدیسەوە. (وەرگێڕ)

(بەڕاستی ئەمن لە خزم و خوێش وعەشیرەت دەترسم دوای مردنم (کە سەرگەردان بن و پەیڕەوی دینەکە نەکەن) (کەسیشیان بە شایستە نازانم بۆ پێشەوایەتی کردن) وە خێزانەکەشم نەزۆکە (منداڵی نابێت)، سا داواکارم لە بەخششی خۆت بەهرەوەرم بکە و منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە تا میراتگری من و بنەماڵەی یەعقوب بێت و وای لێبکە ئەی پەروەردگارا! کە خۆت وخەڵکیش لێی ڕازی بن).

**دەڵێین:** لێرەدا خوا باسی میرات دەکات، جارێکی تریش باسی میرات دەکات، کە لە بارەی سولەیمانەوە دەفەرموێ: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾ {النمل ١٦}. واتە: (و سولەیمان بووە میراتگری داود...)

**بەڵام تەفسیری ئەم دوو ئایەتە بەم شێوەیەیە:**

* سەبارت بە ئایەتی یەکەمیان: ﴿يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ﴾، **ئەڵێین:**

**یەکەم:** بۆ پیاوچاکێکیش شیاو نییە کە داوای منداڵ بکات لە خوای گەورە بۆ ئەوەی ببێت بە وارسی پارەکەی بە تەنها، ئیدی چۆن ئەمە بە شیاو بزانین بۆ زەکەریا کە پەیامبەرێکی بەرێزە، کە داوای منداڵ لە خوای گەورە بکات بەڵکو ببێت بە وارسی پارەکەی؟ !

**دووەم:** ئەوەی کە مەشهورە [بەڵکو لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە] زەکەریا پیاوێکی هەژار بووە و دارتاشی کردوو[1]، جا تۆ بڵێی: زەکەریا چەندی پارە و ماڵ هەبوو بێ، تا داوا لە خوا بکات میراتگرێکی پێ ببەخشێ.

(١) ئەوەتا لە فەرمودەدا هاتووە: «كان زكريا نجارا»، واتە: (زەکەریا ئیشی دارتاش بووە). رواه مسلم، كتاب الفضائل باب زكريا عليه السلام (٢٣٧٩).

بەڵكو لە پەیامبەرانی خواﷺ ئەسڵ ئەوەیە كەوا ماڵ وسامان لای خۆیان گل نادەنەوە، بەڵكو لە كاری خێردا دەیبەخشنەوە.

سێیەم: ئەوەشی كە سیاقی ئایەتەكە مەبەستێتی هەر ئەمەیە، كە دەفەرموێ: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، واتە: (تا ببێتە میراتگری من و نەوەی یەعقوب ). دەی نەوەكانی یەعقوب چەندێك دەبن؟ هەی هو تا بگات بە یەحیا -یەحیا لە كوێ و نەوەكانی یەعقوب لە كوێ؟!-(١)

ئالی یەعقوب بریتین لە: موسا، داوود، سولەیمان، یەحیا، زەكەریا، لەگەڵ گەلەكانیاندا، تەنانەت هەموو پەیامبەرەكانی نەوەی بەنی ئیسرائیل لە نەوەی یەعقوبن، چونكە ئیسرائیل یەعقوبە، ئەمە چ جای باقیەكەی تری بەنی ئیسرائیل كە پەیامبەر نەبوون، دەی كەواتە دەبێ بەشە میراتەكەی پەیامبەر یەحیا بكاتە چەند؟

بۆیە پەیامبەر یەحیا بێ بەش (محجوب) دەبێت بە هۆی بوونی فەرعی وارسەوە، جا گومانی تێدا نییە كە دەفەرموێ: ﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ ڕەدی ئەو وتەیە ئەداتەوە كە ئەڵێ: مەبەستی میراتگری ماڵ و سامان بووە. كە ئەو بەتەنها ناوی یەعقوبی هێناوە؛ چونكە یەعقوب پەیامبەرە و زەكەریاش بە هەمان شێوە، جا بۆیە مەبەستی میراتی پەیامبەرایەتی و زانست و دانایی بووە [نەك ماڵ و سامان].

(١) یەحیا ئەو پەیامبەرەیە كە خوای گەورە دەیبەخشێتە زەكەریا دوای ئەوەی كە دوعاكەی قبوڵ دەكا. (وەرگێڕ)

**چوارەم:** ئەو فەرموودەیەی پەیامبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: (ئێمەی گرۆی پەیامبەران میراتمان نییە )، یان ئەوەی کە دەفەرموێ: (ئێمە میراتمان نییە، ئەوەی بەجێی دێڵین صەدەقەیە )، لە فەرموودەی تردا هاتووە[١]: (لە ڕاستیدا پەیامبەران نە دینار و نە درهەمیان بە میراتی بە جێ نەهێشتووە، بەڵکو تەنها زانستیان بە میرات بەجێ هێشتووە[٢].

* بەڵام سەبارەت بە ئایەتی دووەم: ﴿وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾ واتە: (و سولەیمان بووە میراتگری داود...). ئەمەش بە هەمان شێوە میراتی ماڵ و سامان نییە، بەڵکو میراتی پەیامبەرایەتی و دانایی و زانستە، لەبەر دوو شت :

**یەکەم:** مەشهورە کە داوود سەد ژن و سێ سەد کەنیزەکی هەبووبێ، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر منداڵیشدا، ئیتر چۆن بەس سولەیمان ئەبێتە میراتگری؟ تەنانەت براکانی سولەیمانیش میراتیان ئەکەوێ، جا بە تایبەت ناوهێنانی سولەیمان لە کاتێکدا میراتگری تری لەگەڵدایە زۆر گونجاو نییە. جا ئەگەر مەبەستی میراتی ئاسایی بوایە، ئەوا باسکردنی لە قورئان بێ سود دەبوو وە دەبووە (دەست خستنی بە دەست هاتوو) (تحصیل حاصل)، چونکە میراتگرتنی ماڵ و سامان

---

(١) یەکێك لە زانا هەرە ناودارەکانی شیعە، بەڵکو ناودارترین وگەورەترین مەرجەع بە اتفاق -در حال حازر-، خاوەنی کتێبی (الحكومات الاسلامیه)، کاتێك باسی فەزڵی عیلم دەکات ئەم فەرموودەیە دێنێتەوە وبە صەحیحی دادەنێت، بەڵام کاتێك باسی ئەم مەسەلەیە دەکات -مەسەلەی میرات و فەدەك و زوڵمی ئەبوبەکر لە فاتیمە.- ئەڵێ ئەم فەرموودەیە ضعیفە و کاری پێ ناکرێ !!؟ ﴿ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾. (وەرگێڕ).

(٢) أَخْرَجَهُ أَبُو داود فِي «السُّنَن»، كِتَاب العلم، بَاب الحث عَلَى طلب العلم حَدِيث (٣٦٤١)، وَإِسْنَاده صَحِيح..

شتێکی ئاسایی[1]. کەوابوو بێگومان خوای گەورە شتێکی تری مەبەست بووە و بۆیە تایبەت باسی کردووە، کە ئەویش میراتی پیغەمبەرایەتیە.

* سەبارەت بەو گووتەیەیان کە دەڵێت: دیاریەك بووە پەیامبەرﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا بەخشیویەتی بە فاتیمە، ئەوە (کاشانی)یە لە تەفسیرەکەی خۆیدا ڕیوایەت دەکات کە: (پەیامبەری خوا ﷺ دواى فەتحى خەيبەر و دواى ئەوەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴾[الاسراء ٢٦]، بانگی فاتیمەی کرد و فەدەکەکەی پێدا)[2].

**با لێرەدا هەندێك بوەستین:**

یەکەم: ئەم چیرۆکە درۆیە، ئەم ئایەتەش لەوکاتەی ئەو باسی دەکات دانەبەزیوە و پەیامبەریشﷺ هیچی نەداوە بە فاتیمە (خوا لێی ڕازی بێ و ڕازی کا)، ڕاستەکە ئەوەیە کە فاتیمە وەکو میرات داوای فەدەکی کردبێ نەك وەکو دیاری، ئینجا فەتحی خەیبەر لە سەرەتای ساڵی حەوتی کۆچی دا بووە، زەیبەبی کچی پەیامبەریشﷺ ساڵی هەشتی کۆچی وەفاتی کردوە[3].

---

(١) بێگومان هەر باوکێك دەمرێت منداڵەکانی میراتەکەی بەش دەکەن و ئیتر هیچ پێویست بە هەواڵدان ناکات، باس بکرێت و باس نەکرێت میرات هەر بەش دەکرێت و وەرەسە دەیبات، جا سولەیمانیش لێرەدا بە ئاسایی بەشی خۆی دەبات، بۆیە دەبێتە هەواڵدان لەسەر شتێك کە زانراوە و پێویست بە هەواڵدان ناکات، بۆیە ئەبێ مەبەست پێی شتی تر بێ. (وەرگێڕ)

(٢) (تفسیر الصافی) (١٨٦/٣). [کاشانی زانایەکی شیعە مەزهەبە].

(٣) (سیر أعلام النبلاء) (٢٥٠/٢)، (الاصابة) (٢٠٦/٤).

هەروەها ئوم کەلسومی کچی پیغەمبەر ﷺ لە ساڵی نۆی کوچیدا وەفاتی کردو[1].

ئاخر چۆن دەبەخشێتە فاتیمە و لەولاشەوە ئوم کەلسوم و زەینەب بێبەش دەکا؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا تۆمەتبارکردنی پەیامبەری خوایە ﷺ بەوەی کە جیاوازی کردووە لە نێوان منداڵەکانی.

* کاتێك کە بەشیری کوڕی سەعد هات بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پەیامبەری خوا باخچەیەکم بەخشیوەتە کوڕەکەم پێم خۆشە ئامادە بیت (ببیتە شاهید).

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ وتی: نەخێر.

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆ، من ئامادەی ستەم نابم (نابمە شاهید بەسەر ستەمەوە)[2].

دەبینی ناوی لێنا ستەم، ئەمەش تەنها بە فەزڵدانی هەندێك لە منداڵەکان بەسەر هەندێکی تریانەوە، ئەم پەیامبەرە بەڕێزە ﷺ ئامادەی ستەم نابێت، ئەی خۆی بەدەستی خۆی ستەم دەکات؟!

هەرگیز، ئەسڵەن ئێمە لە کاری وا بەپاکی ڕادەگرین سەلات وسەلامی خوای لەسەربێ.

---

(١) (سير أعلام النبلاء) (٢/٢٥٠)، (الاصابة) (٤/٢٠٦).

(٢) (صحيح مسلم) كتاب الهبات، باب كراهة تفضيل بعض الأولاد في الهبة حديث (١٦٢٣).

دوای هەموو ئەمانەش، ئەگەر دیاری بووبێت، یان ئەوەتا وەری گرتووە یان ئەوەتا وەری نەگرتووە.

ئەگەر وەری گرتووە چۆن دێ داوای دەکات؟ ئەگەریش وەری نەگرتبێ، خۆ دیاری ئەگەر ڕاستەخۆ وەری نەگری وەکو ئەوە وایە هەر نەدرابێ.

لەسەر هەر کام لەم دوو ووتەیە بێت، میرات بێ یان دیاری چونیەکن و یەکسانن، ئەوە هەر گووتەیەکی نارێکە و پوچە، ڕاستیەکەی ئەوەیە نە میرات بووە و نە دیاری.

ئەم مەسەلەیە سەیر لەوەی دایە، دوای وەفاتی ئەبوبەکری صدیق ﷺ عومەر بوو بە خەلیفە، پاشان عوسمان، پاشان عەلی، گریان کرد فەدەك هی فاتیمەیە ؓ ئیتر بە میرات بێ یان بە دیاری، هەر دەبێتە مولکی فاتیمە، فاتیمەش دوای وەفاتی باوکی ﷺ بە شەش مانگ وەفاتی کرد، کەوابوو فەدەکەکە بۆکێ دەمێنێتەوە؟

بۆ وەرەسە دەمێنێتەوە، کەوابوو عەلی ﷺ چواریەکی بۆ دەبێت بە هۆی بوونی فەرعی وارسەوە، حەسەن و حوسەین و زەینەب و ئوم کەلسومیش ي باقیان بۆ دەمێنێتەوە، [بە دەستوری] (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الانْثَيَيْنِ) (بۆ نێرێك هەیە لە میرات بە وێنەی بەشی دوو مێ).

جا کاتێك عەلی ڕەزای خوای لێبێ بوو بە خەلیفە فەدەکی نەدا بە منداڵەکانی، ئەگەر ئەبوبەکر ستەمکار بێ، عومەر ستەمکار بێ، عوسمان ستەمکار بێ؛ بەهۆی گرتنەوەی فەدەك لە خاوەنەکەی خۆی، ئەی بۆچی ئەو

حوکمـه سەرناکێشـێت بـۆ عــەلیش، چـونکە ئـەویش فـەدەکی گرتۆتـەوە لـە خاوەنەکەی خۆی و نەیداوەتەوە منداڵەکانی فاتیمە؟!

* فەدەك خۆی سەرەتا بە دەست پەیامبەری خواوە بوو ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد کەوتە دەست ئەبوبەکر، پاشان کەوتە دەسـت عومـەر، لـە سەردەمی عومەردا عەبباس و عەلی هاتنە لای و داوایان کرد بەدەستی ئەوانەوە بێت ئەویش پێی دان، پاشان کەوتە لای عەلی و هەرلای ئەو مایەوە تـا وەفـاتی کرد ساڵی٤٠ك، پاشان کەوتە دەست حەسەن، پاشان حوسەین و پاشان حەسەنی کوڕی حەسەن، ئەنجا عەلی کوڕی حوسەین، پاش ئەویش زەیدی کوڕی حەسەن(١).

* بەڵام ئێمە هەر هەموویان پاك ڕادەگرین، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلیي لەگەڵ هەموو ئەوانەی فەدەکیان بە دەستەوە بـوو هـەتا زەیـدی کـوڕی حەسەن هەر هەموویان پاك ڕا دەگرین و کەسیان بە ستەمکار لە قەڵەم نـادەین. جا فەدەك نە دیاری بووە و نە میراتی پەیامبەر ﷺ.

**دووەمین:** چۆن پەیامبەری خوا ﷺ لەسەر ئەو دونیا نەویستیەی خۆیەوە ئەو هەموو ماڵ و سامانە بەجێ دێڵێ؟ بەڵگەی ئەمەش :

١. فەرموودەکەی ئوم سەلەمە کە تێیدا هاتووە: (پەیامبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆلای و دەم و چاوی تێك چوو بوو، ئەڵێ: وام زانی هی ئێش وئازارە، بۆیە وتم: ئەی پەیامبەری خوا دەبینم دەم و چـاوت گـۆڕاوە، ئـێش و ئـازارت هەیـە؟

(١) (فتح الباري) (٦/٢٣٩)، حديث رقم (٣٠٩٤).

فەرمووی: نا، بەڵکو ئەو حەوت دینارەی کە دوێنێ بۆیان هێنناین، شەومان بردە سەر و نەمان بەخشی[(١)].

٢. پەیامبەری خوا ﷺ وەفاتی کردوە و قەڵغانەکەی بارمتە بووە لە لای یەهودیەك لە بەرانبەر سی صاع کە بە قەرز لێی وەرگرتوو[(٢)].

توخوا کەسێك فەدەك و بەشی خەیبەری هەبێ، قەڵغانەکەی دەکاتە بارمتە لە بەرانبەری چل صاع؟!

* و لە فاتیمەوە دەگێڕنەوە: کە کاتێك فەدەکیان پێ نەداوە، تووڕە بووە و ڕۆیشتووە بۆ سەر قەبرەکەی باوکی و سکاڵای خۆی لاکردوە!!

ئەمە درۆیە و هەر ڕاست نییە، ئەسڵەن شتی وا لە فاتیمە هەر ناوەشێتەوە و شیاوی ئەو نییە ڕەزای خوای لێبێ و ڕازی کا، ئەوەتا خوای بەرز و پیرۆز لە بارەی یەعقوب ئەو بەندە ساڵحە ئەو پەیامبەرە بەڕێزە، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾[(٣)] {يوسف٨٦}.

---

(١) رواه أحمد (٤/٣١٤)

(٢) رواه البخاري: كتاب الجهاد، باب ماقيل في درع النبي ﷺ (٢٩١٦).

(٣) واتە: (ئەمن سکاڵای خەم و پەژارەی خۆم هەر لای خوا دەکەم و لە لایەن خوداوە شتانێك دەزانم ئێوە نایزانن).

ئەوەشی کە مەشهورە دواجار ئەبوبەکر ڕازی کردووە، هەروەك زۆرێك لە زانایان ئەمەیان لە شەعبی یەوە بە مُرْسَلـێکی صحیح[1] دەرهێناوە، شەعبیش یەکێکە لە گەورە تابعیەکان، ئیتر خواش زاناترە بە هەقیقەتی مەسەلەکە.

هەروەها مەشهورە: کە ئەسمائی کچی عومەیس فاتیمەی شۆردبێت، ئەسمائیش خێزانی ئەبوبەکری صیددیقە، ئاخر چۆن ئەکرێ خێزانەکەی ئەبوبەکری صیددیق بیشوات و ئەبوبەکر بە مردنی نەزانێت؟ ڕاست ئەوەیە: کە بە شەو نێژراوە و ئیزنی ئەبوبەکر نەدراوە.

عائیشەش هەروەها بەشەو نێژراوە، تەنانەت گەورەی هەموو مرۆڤایەتی پەیامبەری خواﷺ بەشەو نێژراوە.



(١) بۆ زانینی مرسل بڕوانە ل٢٨) پەراوێزی (١).

# شوبهەی هەشتەم

## عومەر لە بارەی بەیعەتەکەی ئەبوبەکرەوە وتوویەتی: ڕێکەوت بووە!

**ئەڵێن:** عومەر ﷺ لە بارەی بەیعەتەکەی ئەبوبەکری صدیقەوە وتوویەتی: ڕێکەوت بووە (فَلْتَةً )[١].

**ئەڵێین:** بەڵێ ئەمە ڕاستە، لە عومەرەوە چەسپاوە کە وای گووتووە، بەڵام ڕێگە بدەن تەواوی چیرۆکەکە لە صەحیحی بوخاری دا بخوێنینەوە :

لە ئیبن عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: هەواڵ گەیشتە عومەری کوڕی خەتتاب کەوا خەڵکانێك ئەڵێن: گەر عومەر بمرێ ئەوا بەیعەت دەدەم بە فلان کەس و بەیعەتەکەی ئەبوبەکر ڕێکەوت بووە (فَلْتَةً )، کە ئەم وتەیە گەیشتە عومەری کوڕی خەتتاب [خەڵکی کۆکردەوە و] وتی: پێم گەیشتووە هەندێکتان وتوویەتی: بەخوا ئەگەر عومەر بمرێ بەیعەت دەدەمە فلان کەس، جا با کەس بەوە فریو نەخوات بڵێت: بەیعەتەکەی ئەبوبەکر هەڵکەوتە بووە و بڕاوەتەوە، ئەگەر چی واش بووە، بەڵام خوا شەڕ وخراپەکەی پاراست و دایمرکاندەوە، ئەنجا کەسیشتان تێدا نییە وەکو ئەبوبەکر کە شایستەی ئەوە بێت ملی بۆ ببڕدرێتەوە[٢] [١].

---

(١) فلتة: هەڵکەوت، ڕێکەوت، لە ناکاو، یان نامادە باشی بۆ نەکراو. (وەرگێڕ)

(٢) بە مانای: ئەو کەسەی کە ئێستا پلە وپایەی لە هەمووان زۆر تره هێشتا ناگاتە پلەو پایەی ئەبوبەکر، جا بۆیە با کەس هیوای ئەوەی نەبێت بەیعەتی پێبدرێت بەو شێوەی کە بە= =ئەبوبەکر درا، لە سەرەتاوە لە نێو خەڵکێکی کەمدا بەیعەتی پێدرا دواجار هەموو بە بێ جیاوازی

پاشان باسی ڕۆیشتنەکەی خۆیی و ئەبوبەکر دەکات بۆ سەقیفەی بەنی ساعیدە، تا دەگاتە ئەوەی ئەڵێ: چەند قسەیەکەم ئامادەکردبوو دەمویست بە پێش چاوی ئەبوبەکرەوە بیلێم، هەر خۆم ڕەچاوی زوو تورە بوونیشم دەکرد.

کە ویستم قسە بکەم، ئەبوبەکر وتی: پەلە مەکە، ئیتر منیش حەزم نەکرد تورەی بکەم.

ئەبوبەکر دەستی کرد بە قسە کردن، بەڕاستی زۆر لە من نەرمتر و ئارامتر بوو، سوێند بەخوا شتێکی جێ نەهێشت لەوەی لە دڵی خۆم ئامادەم کردبوو ئیلا بە باشتریشەوە عەرزی کردن، پاشان بێ دەنگ بوو، پێی ووتن: هەموو ئەو چاکانەی کە لە بارەی خۆتانەوە باستان کرد بێگومان ئێوە ئەهلی ئەوەن، بەڵام ئەم کارە بە تەنها هی قوڕەیشە، ئەوان لەماڵ ڕەچەڵەکەوە باشترینی عەرەبن، جا من ڕازیم بە یەکێك لەم دوو پیاوە -مەبەستی: عومەر و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە-، بەیعەت بە هەر کامێکیان ئەدەن بیدەن، پاشان دەستی من و ئەبو

---

کە زانیان ئەبوبەکرە بەیعەتیان پێداو کەس خۆی جیا نەکردەوە، پێویستی بە دووبارەڕاوێژکردنەوە نەکرد، جا ئەمەی بۆ ئەم لوا بۆ کەسی تر دەست نادات. ئەمە ماناکەی، بەڵام ئەم دێڕە لە چییەوە هاتووە: (کەستان نییە وەکو ئەبوبەکر کە شایستەی ئەوە بێت ملی بۆ ببڕدرێتەوە)؟ ئبین حەجەر ئەڵێ: چونکە ئەگەر کەسێك تەماشای پێشبڕکێ کەر بکات ملی درێژ دەکاتەوە بزانێ ئایا بۆی دەست ئەدا لە کەوتنە پێشی ئەوەی کە دەیەوێ بکەوێتە پێشیەوە، ئەگەر ئەوەی نەتوانی ئەوا پێی دەڵێن: ملی بڕایەوە. یان ئەوەی: مل بۆ تەماشا کردنی دوو پێشبڕکێ کار درێژ دەکرێت هەتا لە بەر چاو نامێنن و وون دەبن، جا ئەم لە جیاتی نەبینین مل بڕینی بەکار هێنا. بڕوانە شەرحی ئەم حەدیسە لە فتح الباری. (وەرگێڕ)

(١) واتە شەڕو خراپەی بەیعەتەکە، کە ئەگەر ئەوە نەکرایە پێ دەچوو شەڕو خراپەی زۆرتری لێ بوایەتەوە. (وەرگێڕ)

عوبەیدەی گرت و خۆیشی لە ناوەڕاستمان بوو، لە ڕاستیدا هیچ قسەیەکیم پێ ناخۆش نەبوو ئەمەیان نەبێت، دە بەخوا ئەگەر بدرێت لە گەردنم بەس پێی تاوانبار نەبم، پێم خۆشترە لەوەی ببم بە فەرمانڕەوای گەلێك ئەبوبەرکیان تێدا بێ.

عومەریش وتی: سوێند بەخوا ئێمە هیچ شتێك لەو شتانەی کە لەو کاتەدا پێوەی سەرقاڵ بووین بە ئەندازەی پێشینەداری ئەبوبەکر (سابقة أبی بکر) بەهێز نەبوو لە لامان، ترساین کە بەجێیان بێڵین و بەیعەت بەکەس نەدرێ دوای ئێمە بڕۆن بەیعەت بدەنە یەکێك لە خۆیان، ئیتر ئەو کاتە یا بەیعەتمان دەدا لەسەر ئەوەی کە پێی ڕازی نین، یان ئەوەی ڕوبەڕویان بوەستاینەوە، ئەوەش هەر دەبووە شەڕ و ئاژاوە، بۆیە هەر کەسێك بەیعەتی دا بە موسڵمانێك بەبێ پرس و ڕاوێژی موسڵمانان، با نە ئەو بەیعەت بدات و نە ئەوەی بەیعەتی پێ دەدرێت ڕازی بێت نەوەك هەردووکیان بە کوشتن بچن[1].

ئەمە چیرۆکی بەیعەت پێدانەکەیە، بەڵێ هەڵکەوتە و لە ناکاو بووە، بەڵام قسە و باسێك و چیرۆکێکی دووری هەیە کە بە درێژی لە باسی سەقیفەی بەنی ساعیدەدا باسمان لێوە کرد، ئەمەش نابێتە تانە و عەیبە بەسەر عومەری کوڕی خەتتابەوە رضي الله عنه.

* * *

---

(١) صحيح البخاري: كتاب الحدود، باب رجم الحبلى من الزنى اذا احصنت، حديث (٦٨٣٠).

# شوبهەی نۆیەم

## ئەو درۆیەیان کە ئەڵێن عومەر وتوویەتی:

## پەیامبەری خوا ﷺ وڕێنە دەکا

ئەڵێن: فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﭬ کە دەڵێ: ( کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا بوو، چەند پیاوێك لە خزمەتیدا بوون عومەریان تێدا بوو، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: هەستن تیانوسێك بێنن نوسراوێکتان بۆ دەنوسم هەرگیز گومڕا نابن ).

عومەر وتی: پەیامبەری خوا ﷺ ناساغە، قورئانتان لایە، کتێبەکەی خوامان بەسە، ئیتر ئەوانەی لەماڵەکەدا بوون کردیان بە غەڵبە غەڵب، هەندێکیان دەیوت: بڕۆنە پێشەوە با پەیامبەری خوا نوسراوێکتان بۆ بنوسێ کە هەرگیز گومڕا نەبن، هەندێکی تریان قسەکەی عومەری دەکرد، ئیتر کە غەڵبە غەڵبەکە زیادی کرد و دوو بەرەکی کەوتە نێوانیانەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەستن)[1].

جا تانەیان لە هاوەڵانی پێغەمەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا لەوە خۆی دەبینێتەوە کە پێیان وایە عومەر ووتبێتی: (پەیامبەری خوا وڕێنە دەکا)[2].

---

(١) (متفق عليه): (صحيح البخاري) كتاب العلم، باب كتاب العلم حديث (١١٤). و (صحيح مسلم)، كتاب الوصية، حديث (١٦٣٧)

(٢) فاسألوا أهل الذكر) للمتشيع التيجاني ص (١٤٤ - ١٧٩) وعزاه الى البخاري كذبا وزورا.

لە ڕاستیدا ئەمە درۆیە و بە دەم عومەرەوە دەکرێ !! عِومەر هەرگیز نەیگوتوە پەیامبەری خوا وڕێنە دەکات، بەڵکو ڕیوایەتەکە کە لە هەردوو صەحیحەکە و ئەوانی تریشدا هاتووە عومەر وتوویەتی: ( ناساغە و ئێش و ئازاری هەیە )، چونکە لەو کاتەدا لە نەخۆشی مردندا بووە بۆیە زۆر سەخت و بە ئێش بووە لەسەر پەیامبەری خوا ﷺ. وفەرمودەکەی عائشەش ئەمەی ڕوون کردۆتەوە: کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ لە هۆش خۆی چووە و پاشان هاتەوە هۆش، فەرمووی: خەڵك نوێژیان کرد؟ عائشە پێی وت: قوربان چاوەڕوانی جەنابتن.

پاشان ئاویان بۆ هێنا و دەستنوێژی گرت، پاشان هەستا ویستی بڕوا بۆ نوێژ دووبارە لە هۆش خۆی چوەوە و کەوت، هەم بە خەبەر هاتەوە و فەرمووی: خەڵك نوێژیان کرد؟ وتیان: قوربان لە چاوەڕوانی تۆدان، فەرمووی: ئاوم بۆ بێنن، ئەوانیش ئاویان بۆ هێناو دەست نوێژی شۆرد، پاشان هەستا ویستی بڕوا بۆ نوێژ دیسانەوە کەوت، دایك و بابم بە قوربانی بێ.

کە سێیەم جار کەوت و بەخەبەر هاتەوە، فەرمووی: خەڵك نوێژیان کرد؟

وتیان: لە چاوەڕوانی تۆدان قوربان.

فەرمووی: بڵێن بە ئەبوبەکر با ئەو نوێژ بە خەڵکی بکات[1].

(١) متفق عليه: (صحيح البخاري) كتاب الأذان، باب انما جعل الامام ليؤتم به، حديث (٦٨٧). و (صحيح مسلم)، كتاب الصلاة، باب استخلاف الامام اذا عرض له عذر، حديث (٤١٨).

بەڵێ لەوێدا یەکێك وتوویەتی: وڕێنە دەکات، بەڵام نەك عومەر.

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ دەڵێ: پەیامبەری خوام ﷺ بینی ئێش و تایەکی زۆر توندی هەبوو، وتم: ئەی پەیامبەری خوا ئێش و تاکەی گیانت زۆر سەختە، ئەویش فەرمووی: من بە ئەندازەی دوو کەس لە ئێوە ئێش و تام هەیە، ئیبن مەسعودیش پێی وت: بۆ ئەوەیە کە تۆ دووقات پاداشتت دەگات؟ فەرمووی: بەڵێ(١).

وەك ڕۆشنە پەیامبەری خوا ﷺ ئێش و تایەکی زۆر توندی هەبووە، کە عومەریش بیستوویەتی پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: هەستن با نوسراوێکتان بۆ بنوسم، دڵی بۆ پەیامبەری خوا ﷺ سوتاوە و وتوویەتی: پەیامبەری خوا ناساغە و ئێش و ئازاری هەیە، کتێبەکەی خوامان بەسە.

ئەڵێم: ئەمەش ڕێکی ئەو ئایەتەیە خوای پایە بەرز دەفەرموێ: ﴿وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ {المائدة:٣}. واتە: (ئەمڕۆ دینەکەم بۆ کامڵ کردن و ناز و نیعمەتی خۆمم بە تەواوەتی بەسەر ڕژاندن و ڕازی بووم بەوەی کە ئیسلام دینتان بێت).

پەیامبەری ئازیزیش ﷺ دەفەرموێت: (سوێند بەخوا شتێکم بەجێ نەهێشتووە لە خوا و بەهەشت نزیکتان کاتەوە ئیلا پێم گوتوون و بۆم باسکردوون، وە هیچ شتێکم بەجێ نەهێشتووە لەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوون

---

(١) متفق عليه: (صحيح البخاري) كتاب المرضى، باب أشد الناس بلاء، حديث (٥٦٤٨). و (صحيح مسلم)، كتاب البر والصلة، باب ثواب المؤمن فيما يصيبه من مرض، حديث (٢٥٧١).

ئیلا فەرمانم پێکردوون و پێم ڕاگەیاندوون، وە هیچ شتێکم بەجێ نەهێشووە لەوەی کە خوا نەهی لێکردوون ئیلا منیش نەهیم لێکردوون[1] کەواتە شتێك لە دیندا نەماوەتەوە پەیامبەری خوا ﷺ ڕوونی نەکردبێتەوە.

کەوابێ ئەو نوسراوە چییە کە پەیامبەری خوا ﷺ ویستوویەتی بینوسێتەوە؟

لە عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە ﷺ ئەڵێ: لە لای پەیامبەری خوا بووم ﷺ فەرمانی پێکردم کە (طبق)ێکی[2] بۆ بێنم تا شتێکی تێدا بنوسێ هەرگیز ئومەتەکەی گومڕا نەبێ، منیش ترسام تا طبقێك بێنم گیانی دەربچێت، بۆیە وتم: ئەی پێغەمەری خوا ﷺ بڵێ، من لەبەر دەکەم و بە ئاگام، فەرمووی: ( وەسیەتتان پێ دەکەم بە نوێژ و زەکات و کەنیزەکەکانتان )[3].

**جا ئەگەر بڵێن:** سەحابەکان سەرپێچی فەرمانی پەیامبەریان ﷺ کردوە تیانوسەکەیان بۆ نەهێناوە.

**ئەوا ئەڵێین:** عەلی یەکەم کەسە سەرپێچی کردووە، چونکە لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ ڕاستەوخۆ فەرمان بەو کراوە تیانوسێك بهێنێت، بۆ نەیهێنا؟! جا ئەگەر لەبەر ئەم کارە لۆمەی هاوەڵانی پەیامبەرمان کرد ﷺ، ئەوا عەلی ﷺ لە پێشترە بۆ ئەم لۆمەیە!!

بەڵام هەق ئەوەیە لۆمەی هیچ لایەك ناکرێ لەبەر چەند هۆیەك:

---

(١) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٤/٤١٧ تحت حديث ١٨/٩٠).

(٢) طبق واتە: كتف: کەتفیش ئێسکی حوشترە یا شەك، کە ووشکەوە دەبوو لەسەریان دەنوسی. (وەرگێڕ).

(٣) (مسند أحمد )، مسند العشرة المبشرين، مسند علي (٦٩٣).

یەکەم: ئەوەتا خودی عەلی ﷺ لەم فەرمودەیەدا ئەڵێ: ترسام تا تیانووسەکەی بۆ بهێنم گیانی دەرچێ، بۆیە وتم: ئەی پێغەمەری خوا ﷺ بڵێ، من لەبەر دەکەم و هۆشیارم، ئەویش فەرموویەتی: (وەسیەتتان دەکەم بە نوێژ و زەکات و کەنیزەکەکانتان). کەوابوو پەیامبەری خوا ﷺ ئەوەی وتووە کە ویستوویەتی بنوسرێتەوە.

دووەم: ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ ویستوویەتی بنوسرێتەوە، یا واجب بووە یا سوننەت، جا ئەگەر وتیان: واجب بووە و لەو شتانەیە کە لە شەریعەتدا گەیاندنی واجبە، ئەوا ئەبێتە تانە لە پەیامبەری خوا ﷺ ولە بۆ ئەو خوایەش — سبحانە وتعالی- کە دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ دینەکەم بۆ کامڵ کردن.

خۆ ئەگەر وتیان: سوننەتە !! ئەوا ئەڵێین: ئێمەش هەر وامان ووتوە.

سێیەم: هاوەڵەکان وەکو بەزەیی هاتنەوە وتوویانە با نەکرێت نە وەکو سەرپێچی.



# شوبهەی دەیەم

## عومەری کوڕی خەتتاب نەهی کردووە لە موتعەی حەج و موتعەی ئافرەتان، لە کاتێکدا حەڵاڵن، ئیتر چۆن عومەر شتێك حەڕام دەکات کە خوا حەڵاڵی کردووە

**یەکەمیان: موتعەی حەج:**

**ئەڵێین:** گریمان عومەر هەڵەی کرد لەم کارەیدا، ئەوا چی بووە؟!

ئێمە بانگەشەی مەعصومیەت بۆ عومەر ناکەین، بەڵکو ئەڵێین هەڵە دەکات وەك چۆن باقی هاوەڵەکانی تریش هەڵە دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا وامان دانا کە هەڵەی کردبێ.

لە صوبەی کوڕی مەعبەدەوە بە عومەری وتووە: ئیحرامم بەست بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە (واتە بە تەمەتوع)[1]، عومەر پێی وت: ڕێنمایی کراوی بۆ سوننەتی پەیامبەرەکەت)[2]. ئەوەتا عومەر وا دەبینێت کە ئەمە سوننەتە، تەنانەت مەدحی کابراش دەکا و ڕێگری لێ ناکا، پێشی دەڵێ: (ڕێنمایی کراوی بۆ سوننەتی پەیامبەرەکەت).

---

(١) حەجی تەمەتوع: ئەوەیە: لە یەکێك لە مانەگەکانی حەجدا بە نیەتی عومەرە ئیحرام دەبەستێت، پاشان دەڕواتە مەککەوە و عومەرەکەی بەجێ دەهێنێت، پاشان خۆی لە ئیحرامەکە دەکاتەوە، ئیتر هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت تا ئەو کاتەی حەج دەکات، بەڵام سەربڕینی لەسەر واجبە..). موتعەش: واتا خۆشی و ڕابواردن. (وەرگێڕ)

(٢) أخرجه أحمد (١/٢٥).

هەروەها لە سالمەوە: پرسیار لە ئیبن عومەر کرا لە بارەی موتعەی حەجەوە، ئەویش وتی ئەبێ بکرێت، پێیان وت: تۆ موخالەفەی باوکت دەکەی.

وتی: باوکم وای نەوتووە؟ ئەو وتوویەتی: (عومرە لە حەج جیا بکەنەوە)، کەچی ئێوە کردوتانە بە حەرام و سزاشی لەسەر دەدەن، بێگومان خوا - حەڵاڵی کردوە، پەیامبەریش ﷺ کاری پێکردووە، ئەوان هەر وازیان لێ نەهێنا، ئەویش وتی: کتێبەکەی خوا لە پێشترە بۆ شوێنکەوتن یا عومەر؟[١].

کەواتە عومەر مەبەستی چی بووە؟ عومەر نەیدەویست ماڵی خوا ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ساڵ لە عومرە کردن چۆڵ ببێت، چونکە ئەگەر وا بوایە، کە خەڵك دەرئەچوون بۆ حەج کردن عومرەشیان لەگەڵ دەکرد بەمەش دەگوترێ (تەمەتوع)، ئیتر دوای ئەوە خەڵك نایەن بۆ ماڵی خوا، لەبەر ئەمە عومەر ویستی حەج بکەن بە ئیفراد[٢]، ئیتر دوای ئەوە دێنەوە بۆ عومرە کردن لە سەفەرێکی سەربەخۆدا بۆ ئەوەی ماڵی خوا چۆڵ نەبێت.

ئەم نەهیەی عومەریش لە بەر حەرامێتی کارەکە نەبووە، بۆچوونێك بووە و پێی وابووە وا باشترە، ئەمەش نابێتە عەیبە بە سەریەوە، هەروەکو پێشتر باسی ئەوەمان کرد کاتێك صوبەی کوڕی مەعبەد بە تەمەتوع حەجی کرد، پێی وت: ڕێنمایی کراوی بۆ سوننەتی پەیامبەرەکەت ﷺ.

## دووەمیان: موتعەی ئافرەتان

ڕێگری کردن لە موتعەی ئافرەتان لە خودی عەلیەوە رضي الله عنه جێگیر بووە، کاتێك بیستی ئیبن عەبباس موتعەی ئافرەتان بە حەڵاڵ دەزانێ، وتی: (لەسەر خۆ

(١) (سنن البيهقي) (٥/٥١). وقال الألباني في مقدمة صفة الصلاة (رجاله ثقات).

(٢) ئەمەش جۆرێکی دیکەیە لە جۆرەکانی حەج کردن (وەرگێڕ).

به ئەی کوڕی عەبباس، به تەئکید پێغەمەری خواﷺ له ڕۆژی خەیبەردا نەهی لەوە و له گۆشتی گوێدرێژی ماڵی کرد)(١).

ئەم فەرمودەیە تەنانەت له کتێبه باوەڕ پێکراوەکانی خۆشیاندا هەیە(٢).

به هەمان شێوە فەرمودەکەی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ئەڵێ : (پەیامبەری خوا ﷺ موتعەی قەدەغه کرد له ساڵی ئەوتاسد(٣)، [واته ساڵی فەتحی مەککه]، به هەمان شێوە فەرمودەکەی سەبورەی جوهەنیش که ئەڵێ: (پەیامبەری خوا ﷺ موتعەی له ساڵی فەتح قەدەغه کرد.(٤) له ڕیوایەتێکی تردا: ( من پێشتر ئیزنی موتعەم پێدابوون، بەڵام ئەوە خوا حەرامی کرد هەتا ڕۆژی قیامەت)(٥).

دوای ئەوەش عومەر که نەهی کردووە له موتعە، کەواته عومەر چی کردووە؟ عومەر ڕێگری له شتێك کردووە که پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووە، که خوای پایەبەرز نەهی لێکردووە هەر وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴾ {المؤمنون٥-٧}(٦). دەبینی خوای گەورە ناوی لێناون دەستدرێژی کەر.

(١) (صحيح مُسلم)، كتاب النكاح، باب نكاح المتعة، حديث (١٤٠٧) (٣١).
(٢) وسائل الشيعة (١٢/٢١).
(٣) (صحيح مُسلم)، كتاب النكاح، باب نكاح المتعة، حديث (١٤٠٥) (١٨).
(٤) (صحيح مُسلم)، كتاب النكاح، باب نكاح المتعة، حديث (١٤٠٦) (٢٠).
(٥) (صحيح مُسلم)، كتاب النكاح، باب نكاح المتعة، حديث (١٤٠٦) (٢١).
(٦) واته: -خوا جل جلاله باسی سیفات و ئاکاری ئیمانداران دەکات- و ئەونەی که پارێزەری داوێنی خۆیانن * مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ کەنیزەکێك که بووبن به خاوەنیان ئەوە بەڕاستی ئەوانه سەرزەنشت ناکرێن * جا ئەوەی نیازی جگه لەو دووانه بکات * ئەوا ئەو کەسانه دەستدرێژی کەرن..

ئەوان ئەو ئایەتە بە بەڵگە دەهێننەوە کە پەروەردگاری پیرۆز دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ {النساء: ٢٤}.

واتە: (هەروەها حەرام کراوە لێتان) ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان هەیە جگە لەوانەی بوونەتە موڵکتان (واتە کەنیزەکەکانتان) (ئەو حوکمانەی باسکران) پێویست کراو و نوسراوی خوایە لە سەرتان، جگە لەوانەی کە باسکران حەڵاڵە بۆتان کە بە ماڵ و داراییەکانتان خوازبێنی ئافرەتان بکەن، بە مەرجێ داوێن پاك بن و داوێن پیس نەبن[1]، جا ئەوەی کە لەزەتتان لێوەرگرتن لەو ئافرەتانە ئەوا مارەییەکەیان پێ بدەن کە فەرز کراوە لە سەرتان، هیچ تاوانیشتان لە سەر نییە لە کەمکردنەوەی ئەو مارەییەی کە لەسەری رێککەوتبون، بەڕاستی خودا هەمیشە زانای کار دروستە).

ئەو قیرائەتە دەکەنە بەڵگە کە دەڵێت: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾. ئەڵێین: ئەم قیرائەتە موتەواتر نییە، نە لە قیرائاتی سەبعدا هەیە و نە لە قیرائاتی عەشریشدا، بەڵکو قیرائەتێکی شازە [قیرائەتی شازیش کاری پێ ناکرێ].

سەرباری ئەوەش دژی فەرمودەی پەیامبەری خوایە ﷺ، ئیتر بە فەرمودەکەی عەلی بێت، یان فەرمودەکەی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع یان سەبورەی جوهەنی، یا ئەوانی تر.

---

(١) لە ڕیوایاتی خودی ئەو موتعەدیعانەدا هاتووە کە جائیزە و دەکرێ موتعە لەگەڵ داوێن پیسیشدا بکرێ، کەچی ئەم ئایەتەی کە ئەوان بە بەڵگەی دەهێننەوە، ئەفەرموێ: ئەبێ داوێن پاك بێ (مُحصن) بێ، ئەمە گریمان ئەم ئایەتە بەڵگە بوو بۆیان کە بەڵگە نییە. (وەرگێڕ)

# شوبهەی یازدەیەم

## تۆمەتبارکردنی عائیشه و حەفصه بە کافر بوون

**ئەڵێن:** لە بارەی ئەم فەرمودەیەی پەروەردگارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١﴾ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ {التحريم ١-٤}.

واتە: (ئەی پەیامبەر بۆشتێك لە خۆت حەرام دەكەیت كە خوا بۆی حەڵاڵ كردوویت، تۆ ڕەزامەندی ژنەكانت دەوێ لە كاتێكدا خوا لێخۆشبوی میهرەبانە * بەڕاستی خوا هەڵوەشاندنەوی سوێندەكانتانی بۆ بڕیارداون بە كەفارەتدانی خوا كارساز و دۆستی ئێوەیە، هەر ئەویش زانای كاربەجێیە * كاتیك پەیامبەر ﷺ قسەیەكی بە نهێنی لای هەندێك لە خێزانەكانی دركاند، جا ئەو ژنە باسەكەی گەیاندە هاوسەرەكەی ، خواش پەیامبەری ﷺ ئاگادار كرد، پەیامبەر ﷺ هەندێك لە قسەكانی باس كرد و بێدەنگ بوو لە هەندێكی تری، ئەنجا كە پێی ووت، ژنەكەی وتی: كێ ئەمەی پێگەیاندیت، فەرمووی: خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم * ئەگەر هەردووكتان ئەی عائیشە و حەفصە دەگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەوا جێی خۆیەتی، چونكە بە ڕاستی دڵەكانتان لایدا لە هەق و ڕاستی، خۆ ئەگەر هەر بەردەوام بن و پشتی یەكتر بگرن دژ بە

پەیامبەر ﷺ، چونکە بێگومان خوا پشتگیری ئەوە، هەروەها جوبرەئیل و ئیمانداره چاکەکان، فریشتەکانیش لەوەودوا پشتیوانی ئەون).

**ئەڵێن:** ﴿ صَغَتْ ﴾ ( لایدا ) واتە: (لایداوە بۆ کوفر )، جا ئـەڵێن: ئەمـە ئایەتانێکە لە بارەی هـەردوو خێزانەکـەی پەیامبـەر ﷺ عائیشـە و حەفصـەوە دابەزیوە.

**ئێمەش ئەڵێین:** لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە، ئەڵێ: گوێم لە عائیشە بوو ئەیوت: (پەیامبـەر ﷺ لـە لای زەینـەبی کچـی جەحشـی خێزانـی کـە کچـی پوریشێتی دەمایەوە و هەنگوێنی دەخوارد، جا من و حەفصـە ئامانـەتمان دابـە یەکترا کە ئەگەر پەیامبەری خوا ﷺ هات بۆلای هەرکامان با پێی بڵێـت: ئەمـە چییە ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بۆنی مەغافیرت[1] لێدێ، بۆ مەغافیرت خواردوە؟ ئەوەبوو ڕۆیشتە لای یەکیکیان و ئـەویش ئـەوەی پێگوتبـوو، پەیامبـەریش ﷺ فەرمووی: قەیناکا، هیچ نییە لە لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوێنم خواردووە، ئیتر دڵنیابە نایخۆم )[2].

پەیامبەری خوا ﷺ لە لای حەفصەی کچی عومەردا بـوو، پێـی وت: ( بـۆ کەسی نەگێڕیتەوە، ئیتر ناڕۆمەوە ) بەڵام ئەم ڕۆیشت بۆ عائیشەی گێڕایەوە کەوا لە پلانەکەی سەرکەتوو بووە وپەیامبەری خـوا ﷺ وازی لـە هـەنگوێن خـواردن هێناوە وئیتر کاری وا ناکا، خوای پەنـهـانزان ئەم ئایەتـەی دابەزانـدە خـوارەوە:

---

(١) ناوی جۆرە دارێکە..

(٢) (صحيح البخاري): كتاب الطلاق، باب لم تحرم ما أحل الله لك (٥٢٦٧).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ...... وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ {التحريم ١-٤}.

* ﴿إِنْ تَتُوبَا﴾ ئەگەر هەردووکتان تەوبە دەکەن، یانی: ئەگەر تەوبە دەکەن لەو کارە، کە بریتییە لە غیرەی ژنان و شتەکانی تریش. ...

* ﴿صَغَتْ﴾ یانی: لە هەق لایدا لەم کارە، چونکە کارەکە هەڵەیە، بەڵام مالت = لایداوە، مانای کفرت = کوفری کردوە، ناگەیەنێت، ئاخر چۆن لە کاتێکدا ئەوانە خێزانی پەیامبەری خوان ﷺ، ئەوان دایکی ئیمانداران، ئەوانەن کە خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە پەیامبەر کەسیان لێ تەڵاق نەدات و هەروەها فەرمانی پێدەکات هیچ ئافرەتێك نەخاتە جێگایان و ژنیان بەسەردا نەهێنێت، خوای پایە بەرز دەفەرموێ: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا﴾ {الأحزاب ٥٢}، واتە: (لەم ساتە بە دواوە هیچ ئافرەتێکت بۆ حەڵاڵ نییە وە نە خێزانی تر بێنی لە جێگەیان..)، لەوەو دوا خوای دانا ڕێگەی ژنهێنانی پێداوە، ئەمەش لەسەر ڕەئی ڕاسترین. مەبەست ئەوەیە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر بوونی غیرە لە نێوان ئافرەتاندا کە شتێکی ئاساییە و خوارسکە، تەنانەت خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ دوو گروپ بوون.

ئەوەتا عائیشە -ڕەزای خوای لێبێ- بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: خێزانەکانی پەیامبەری خوا ﷺ دوو گروپ بوون، گروپێکیان عائیشە و حەفصە و صەفیە و سەودەی تێدا بووە.

گروپەکەی تریشیان: ئوم سەلەمە و باقی ئافرەتەکانی تری پەیامبەر ﷺ - ئوم حەبیبە جوەیریە، مەیمونە، زەینەب- ی تێدا بووە.)

تەنانەت موسڵمانانیش ئاگاداری خۆشەویستی پەیامبەری خوا ﷺ بوون بۆ عائیشە، بۆیە هەر موسڵمانانێك بیویستایە دیاریەك بۆ پەیامبەری خوا ﷺ بێنێ، دوای دەخست تا کاتی ماڵی عائیشە دەهات، ئەو کات خاوەن دیاریەکە دیاریەکەی دەنارد بۆ ماڵەکەی عائیشە. ئەمە وایکرد گروپەکەی ئوم سەلەمە بێنە لای ئوم سەلەمە و بڵێن: بڕۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵدا بکە با بە خەڵك بڵێ: هەر کەسێ دیاری دێنێ بۆ پەیامبەری خوا ﷺ با لە هەر کام لە ماڵەکانی خێزانەکانیدا بوو بیهێنێ.

ئوم سەلەمەش ئەمەی گەیاندە پەیامبەری خوا ﷺ، بەلام پەیامبەر ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە، هاتن پرسیاریان لێکرد، وتی: وەڵامی نەداومەتەوە، وتیان: قسەی لەگەڵ بکە، کە سیرەکە پێی گەیشتەوە قسەی لەگەڵ کرد، دیسانەوە وەڵامی نەدایەوە، پرسیاریان لێکرد، وتی: وەڵامی نەداومەتەوە، وتیان: قسەی لەگەڵ بکە تا وەڵامت ئەداتەوە، کە سیرەکە پێی گەیشتەوە قسەی لەگەڵ کرد، فەرمووی: لە بارەی عائیشەوە ئازارم مەدەن، بە ڕاستی لە نێو جێگەی هیچ کام لە ئێوە وەحی بۆ من دانەبەزیوە، تەنها عائیشە نەبێت. ئوم سەلەمە وتی: پەنا ئەگرم بەخوا لە ئازاردانت ئەی پێغەمبەی خوا ﷺ.

پاشان گروپەکەی ئوم سەلەمە ڕۆیشتنە لای فاتیمە ﵂ و داوایان لێکرد بڕواتە لای پەیامبەر ﷺ، ئەویش ڕۆیشت و پێی وت: خێزانەکانت خوا دێننە حاجەت کە دادگەر بیت لەگەڵ کچەکەی ئەبوبەکر، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی:

کیژۆڵەکەم، ئەوەت خۆشناوێت من خۆشم بوێت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دە ئا ئەمەت خۆش بوێ -واتە عائیشە-. فاتیمەش ل گەڕایەوە بۆلایان و باس و خواستەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش وتیان، دیسانەوە بگەڕێوە بۆلای، بەڵام فاتیمە ڕەدی کردەوە.

دوای ئەو ئینجا زەینەبی کچی جەحشیان نارد، هاتە لای پەیامبەر و زۆر بە توندی و ڕەقی قسەی کرد، وتی: خێزانەکانت خوا دێننە ڕجاکار لەوەی دادگەر بیت لەگەڵ کچەکەی ئەبو قوحافەدا[1]، ئەڵێ: دەنگی بەرز کردەوە و قسەی کردە عائیشە، عائیشەش لە تەنیشتی پەیامبەری خواوە ﷺ دانیشتووە، تەنانەت جوێنێکیشی پێدا، پەیامبەری خواش ﷺ تەماشای عائیشە دەکا بزانێ وەڵامی ئەداتەوە یان نە!، ئەوەبوو عائیشە دەستی کرد بە قسەکردن و وەڵامی زەینەبی دەدایەوە تا زەینەبی کپ کردەوە. پەیامبەری خوا ﷺ تەماشایەکی عائیشەی کرد وفەرمووی: (ئەوە کچی ئەبوبەکرە)[2].

مەبەست ئەوەیە ئافرەتەکانی پەیامبەر ﷺ هەوێ بوون، لە نێوانیان هەوەش شتی زۆر ڕوو دەدات، هەروەها ئێمە ئەڵێین: بەڵێ، حەفصە و عائیشە هەڵەیان کردوە، بەڵام بەو کردارەیان کافر نەبوون.

❊ ❊ ❊

---

(١) ئەبو قوحافە باوکی ئەبوبەکرە ڕەزای خوا لە هەردوکیان بێت.

(٢) ( متفق عليه): صحيح البخاري: كتاب الهبة، باب من أهدى إلى صاحبه، حديث (٢٥٨١)، و (صحيح مسلم): كتاب فضائل الصحابة، باب في فضائل عائشة، حديث (٢٤٤٢).

# شوبهەی دوازدەیەم

## موعاویە زیادی کردۆتە کوڕی خۆی

ئەڵێن: موعاویە ڕۆیشتووە زیادی کوڕی باوکی کردۆتە کوڕی خۆی، لە ڕاستیدا خۆی کوڕی ئین عوبەیدی سەقەفیە، کەچی موعاویە پێی وتووە: زیادی کوڕی ئەبو سوفیانە.

**ئێمەش ئەڵێین:** زیاد بە هیچ شێوەیەك کوڕی عوبەیدی سەقەفی نەبووە، بەڵکو تەنها بە زیادی کوڕی باوکی و زیادی کوڕی سومەییە ناسراوەتەوە، چونکە زیاد بە زینا لە سومەییە بووە (زیاد منداڵی زینایە، بەڵام هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنی چونکە تاوانی ئەمی تێدا نەبووە)، جا لە لەسەردەمی نەفامیدا هەندێك پیاو دەهاتنە لای سومەییە، ئەبوسوفیانی باوکی موعاویەش یەکێك بووە لەوانە (ئەم زینایە لە سەردەمی ئیسلامدا نەبووە لە سەردەمی نەفامیدا بووە، جا ئەوان موشریك بوون، خۆ زیناکردن لە هاوبەش پەیدا کردن تاوانتر نییە)، ئەم زیادە والیەك بووە لە والیەکانی عەلیﷺ، پیاوێکی زمان پاراو و وتاربێژ و قسەزان بووە.

باوکی موعاویە بە موعاویەی وتووە کەوا زیاد کوڕێتی و لە سومەییەیە، کوڕی زینایە بەڵام بە صەحیحی و لە پشتی ئەمە و هەرگیز هیچ کەس نەیوتووە زیاد کوڕی منە، دوای ئەوەش سومەییە مێردی نەبووە تا بڵێین (الولد للفراش وللعاهر الحجر ).

واتە: منداڵ بۆ سەرجێگە -مێردی شەرعی-یە و بۆ شەڕواڵ پیسیش بەرد[١]، جا ئەم مێردیشی نەبووە، ئافرەتێك بووە ئەبوسوفیان لەگەڵیدا جووت بووە و زیادی لێ بووە، موعاویەش وتوویەتی کوڕی باوکمە، کاتێکیش هەواڵی ئەوە گەیشتە موعاویە، کە ئیبن عامر ئەم کارەی موعاویەی پێ باش نییە.

موعاویە وتی: ئەی ئیبن عامر، تۆ ئەوەت وتوە لە بارەی زیادەوە کە وتووتە؟ بەڵام سوێند بەخوا عەرەب باش دەزانێ، کە من لە نەفامیدا زۆر ڕێزی خۆمم گرتووە، کە ئیسلامیش هات زیاتری کرد و کەمی نەکر، جا من نە بەزیاد زۆر بووم لە کەمیەوە ونە پێی سەربەرز بووم لە سەرکزیەوە، تەنها هەقێکی خۆی بووە زانیومە ولە جێی خۆی دامناوە[٢].

ئەوانەی تانە لەم کارەی موعاویە دەدەن، لەو ڕووەوە ڕەخنەکە دەگرن کە ئایا جائیزە بۆ میراتگر کەس بباتەوە سەر پشتی باوکی و لە میرات بەشداری کا یان نە؟

ئەمەش مەسەلەیەکی فیقهی ئیجتهادیە، ئیمامی مالك و... هتر ناوی زیاد بە: زیادی کوڕی ئەبو سوفیان ئەبەن.

ئا ئەمە ئەو مەسەلەیەیە کە موعاویەی پێ عەیبدار دەکەن ﷺ.

❊ ❊ ❊

---

(١) فەرمودەیەکی صەحیحە، واتاکەی: منداڵ بۆ ئەو مێردەیە، کە سەرجێگەی شەرعی دەکات لەگەڵ ئافرەتی منداڵ بوو، بۆ شەڕواڵ پیسەکەش بەردی حەد هەیە، کە بریتیە لە حەدی زیناکەر. وتراویشە: بەردی بۆ هەیە، مەبەستی: هیچی بۆ نیە، بەردی بۆ هەیە. (وەرگێڕ)

(٢) (تاريخ الطبري) (٥/٢١٤)

# پوختە

**لە کۆتاییدا ئەڵێین:**

گریمان ئەوانەی کە باسکران یا ئەوانەی تر کە باس نەکراون سەرپێچین و لە هەندێ هاوەڵی پەیامبەر ﷺ وەشاونەتەوە، باشە چی ڕێگرە لەوەی خوا لەو سەرپێچیانە خۆش ببێت؟ بۆ لێخۆشبونیش هۆکاری زۆر هەنە: سیان لەلایەن خودی سەرپێچیکەر، سیان تریش لە لایەن خەڵکەوە، چوار لە لایەن خواوەندی بەرزو مەزنەوە :

**❊ لە لایەن خودی سەرپێچی کەرەوە:**

**١. تەوبە کردن:** ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ {الفرقان:٧٠}. واتە: (جگە لە کەسێ نەبێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ و کاروکردەوەی چاکی کردبێ، ئا ئەوانە خواخراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە).

**٢. داوای لێخۆشبوونکردن:** ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾ {نوح:١٠}. واتە: (پێم ووتن: داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبووە).

**٣. چاکە سڕینەرەوەکان** «الحسنات الماحية»: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ {هود:١١٤}.

واتە: (چونکە بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان دەسڕنەوە).

## * لە لایەن خەڵکەوە:

### ٤. دوعا بۆکردنی ئیمانداران:

پەروەردگاری مەزن ئەفەرموێ ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ {الحشر:١٠}

واتە: (ئەوانەش لە پاش ئەمانەوە (موهاجرین و ئەنصار)ەوە هاتوون ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە ئێمە و لەو برایانەمان کە پیشکەوتوون لە ئیمان هێنانـدا خۆشببە وە هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانــەوە دەربـارەی ئیمانـداران، ئـەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرتۆی بە سۆز و میهرەبانی).

**٥. هەدیەکردنی کردەوەی چاکە بۆی:** پەیامبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: (خوایە ئەمە لە بری موحەممەد و ئالی موحەممـەد و لـە بـری ئەوەشـی قوربـانی نەکردووە لە ئوممەتی موحەممەد)[1].

هەروەها فەرمودەی: (خوایە گوێڕاڵتم و لەژێر فەرمانتم خوایە ئەمە لە بـری شیبریمە)[2].

ئەم مەسەلەیەش خیلافی لەسەرە و زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کـە هەدیـە کردنی عیبادەت سوود بە مردوو دەگەیەنێت[3].

---

(١) أخرجه أحمد ٣٥٦/٣، وإسناده حسن.

(٢) أخرجه أبو داود: كتاب الحج، باب الرجل يحج عن غيره ح ١٨١١.

(٣) ڕای زۆری زانایان لەسەر بابەتێك، نیشانەی ڕاستی و ڕەوایەتی بابەتەکە نیە، واتە: وا نیە لە هەرکوێ ڕای جمهوری عولەما هەبوو ئیتر هەقیش لەوێیە. (وەرگێڕ)

**٦. شەفاعەتی پەیامبەرمان موحەممەد ﷺ و جگە لەویش لە ڕۆژی قیامەتدا.**

*** لە لایەن خوای تەعالاوە:**

**٧. ئەو موسیبەتانەی تاوان دەسڕنەو لە دونیادا:** پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە) موسڵمان تووشی هیچ ناڕەحەتی و ماندوویی و پەژارە و خەفەت و ئازار و خەمێك نابێت، هەتا ئەگەر دڕکێکیش بچەقێت بە لەشی دا ئیلا خوا بە هۆیەوە لە گوناهەکانی دەبورێ[1].

**٨. سزای گۆڕ:** تەنانەت هەندێك جار دەبێتە پاراستن لە عەزابی ئاخیرەت، ئەمەش بەپێی تاوانەکان.

**٩. لە گۆڕەپانی قیامەت:** کاتی تۆڵەسەندنەوەی نێوان موسڵمانان و لێبووردن: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ﴾ {الأعراف:٤٣}. واتە: (هەرچی ڕق و کینە هەبوو لە دڵیاندا لە ئاست یەکتری، هەموویمان دەرهێنا).

**١٠. لێخۆشبوونی خوا:** ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾.

واتە: (بەڕاستی خوا خۆشنابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر خۆش ئەبێ بۆ هەر کەسێك ویستی لێ بێ)[2].

---

(١) أخرجه البخاري: كتاب المرضى، باب ما جاء في كفارة المرضى ح ٥٦٤١ و مسلم في كتاب البر، باب ثواب المؤمن فيما يصيبه ح ٢٥٧٣.

(٢) **یازدەهەم: دوعا بۆکردنی فریشتەکان (هەڵگرانی عەرش):** خوای تەعالا لە سورەتی غافردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ=

# ڕێخۆشکار

هەموو ئەهلی سوننەت و جەماعەت کۆکن لەسەر ئەوەی کە جێنشینی دوای پەیامبەر ﷺ ئەبوبەکرە.

بەڵام شیعە لەمەدا پێچەوانەی خەڵکیان وتووە، ئەڵێن: عەلی لە ئەبوبەکر وعومەر وعوسمان لە پێشتر بووە بۆ خیلافەت ، و هەر ئەویش خەلیفەی ڕاستەوخۆی دوای پەیامبەرە ﷺ بەبێ بەین، بۆ ئەمەش هەندێك بەڵگەیان لە قورئان و سوننەتدا هێناوەتەوە ئیتر ئا لە صەحیحی بوخاری و موسلمدا بێت یاخود لە کتێبە فەرمودەییەکانی تردا. جا ئەو بەڵگانە ئێمە باسی گرنگترینیان و صەحیح ترینیان دەکەین و پاشان ڕوونی دەکەینەوە کە تاچەند بۆ مەبەست و مەرامەکانی ئەوان دەشێن.

هەروەها ئەڵێین: عەلی ﷺ پێویستی بە سنور بەزاندن نییە، چونکە ئەو بۆخۆی زاوای پەیامبەری خوایە ﷺ باشترین کچی خێزانی بووە کە فاتیمەی گەورەی ئافرەتانی بەهەشتە و کوڕی مامی پەیامبەری خوایە ﷺ، چوارەم خەلیفەی ڕاشیدیە، فەزڵ و چاکەکانیشی زۆر زۆرن، بەڵام مەسەلەکە لە باسکردنی فەزڵەکانی عەلی دا ﷺ نییە، ئەمە شتێکە و بڕاوەتەوە، مەسەلەکە بریتیە لە تەماشاکردنی ئەم فەزڵانە کە ئایا بەڵگەن بۆ لە پێشتری عەلی بۆ خیلافەت وەك لەوانەی پێش خۆی یان نا؟

جا دەتوانین بەڵگەکانی ئەوانەی کە عەلی لە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان لە پێشتر دەزانن بۆ خیلافەت، بکەین بە دوو بەشەوە: نەقڵی و عەقڵی:

**بەشی یەکەم: بەڵگە نەقڵیەکان.**

کە لەمانەی خوارەوە پێکهاتووە:

١. فەرمودەکەی غەدیر

٢. فەرمودەی پۆشاکەکە و ئایەتی موباهەلە.

٣. ئایەتی ویلایە.

٤. فەرمودەی مەنزیلە.

٥. ئایەتی ذوي القربى.

٦. فەرمودەی سەقەلەین.

٧. فەرمودەی عەلی لە منە و منیش لە عەلیم.

٨. فەرمودەی الاثني عشر.

٩. فەرمودەی مدينة العلم.

١٠. فەرمودەی الانذار يوم الدار.

**بەشی دووەم: بەڵگە عەقڵیەکان.**

کە لەمانەی خوارەوە پێکهاتووە:

١. ئازاترین کەس بووە لە دوای پەیامبەری خواﷺ.

٢. زاناترین کەس بووە.

٣. نزیکترین نەسەبی هەبووە لە پەیامبەری خواوەﷺو زاواشی بووە.

٤. یەکەم کەس بووە موسڵمان بووە.

٥. هەرگیز سوژدەی بۆ بت نەبردووە.

# بەشی یەکەم

## بەڵگە نەقلیەکانی ئەوانەی عەلی لە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان لە پێشتر دائەنێن بۆ خیلافە لەگەڵ ڕەواندنەوەیان

# باسی یەکەم

## فەرموودەکەی غەدیر

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەر خوا ﷺ لە نزیك ئاوێك لە نێوان مەککە و مەدینەدا کە پێی دەوترا (خُم) هەستایە سەر پێ و وتارێکی دا، سوپاس و ستایشی خوای کرد و ئاموژگاری کرد و فەرمووی: (پاشان: بێدار بن ئەی خەڵکینە من مرۆڤێکم و نزیکە نێرراوی پەروەردگارم بێ بۆلام و بە دەمیەوە بچم و دونیا بە جێ بهێڵم، جا من دوو شتی سەنگینتان لە نێو بە جێ دێڵم، یەکەمیان قورئانەکەی خوایە، کە ڕێنموونی و ڕوناکی تێدایە وە دەست بگرن بە قورئانی خواوە و شوێنی بکەون)، ئینجا هانی خەڵکیدا لەسەر دەستگرتن بە قورئانەوە، پاشان فەرمووی: (و ئەهلو بەیتەکەم (کەس وخزمانم)، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم).

حوصەینی کوڕی سەبورە بە زەیدی ووت: ئەی زەید، ئەهلو بەیتەکەی پەیامبەر ﷺ کێن؟ خێزانەکانی لە ئەهل و بەیتی نین؟

وتی: خێزانەکانی لە ئەهل و بەیتی وین، بەڵام ئەهلو بەیتەکەی ئەوانەن کە لە دوای خۆی خێر و صەدەقەیان لەسەر حەرامە.

پرسی: ئەی ئەوانە کێن؟

وتی: بریتین لە ئالی عەلی و ئالی عەقیل و ئالی جەعفەر و ئالی عەبباس.

حوصەین وتی: هەر هەموو ئەمانە صەدەقەیان لەسەر قەدەغە کرابوو؟ وتی: بەڵێ[١].

لە لای بێجگە موسلیم وەکو تورموزی[٢] و ئەحمەد[٣] و نەسائی لە (الخصائص)[٤] و حاکمدا[٥]، زیادەیەك هاتووە کە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «**مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيّ مَوْلاهُ**»، واتە: (هەرکەس من دۆستیم ئەوا با عەلیش دۆستی بێت).

* هەروەها زیادەی تریش هاتوون وەك: « **اللَّهُمَّ وَالِ مَنْ وَالَاهُ، وَعَادِ مَنْ عَادَاهُ، وَانْصُرْ مَنْ نَصَرَهُ، وَاخْذُلْ مَنْ خَذَلَه، وَأَدِرِ الْحَقَّ مَعَهُ حَيْثُ دَارَ** » (خوایە هەرکەس دۆستایەتی دەکات دۆستایەتی بکە و هەرکەس دوژمنایەتی دەکات دوژمنایەتی بکە، هەرکەس سەری دەخات سەری خەی، هەرکەس سەر شۆڕی دەکات سەرشۆڕی بکەی، و هەقی لەگەڵ بسوڕێنە بۆ هەر کوێیەك سوڕا)، چەندین زیادەی تریش کە ئێستا باسکردنیان بێ سوودە.

* سەبارەت بە زیادەی: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيّ مَوْلاهُ» لە لای تورموزی و ئەحمەد و نەسائی و حاکم و ئەوانی تریشدا بە چەند سەنەدێکی صەحیح هاتووە.

* بەڵام زیادەکانی تر، وەك: « **اللَّهُمَّ وَالِ مَنْ وَالَاهُ، وَعَادِ مَنْ عَادَاهُ** » (خوایە هەرکەس دۆستایەتی دەکات دۆستایەتی بکە و هەرکەس دوژمنایەتی

---

(١) (صحيح مسلم): كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل علي، حديث (٢٤٠٨).
(٢) (جامع الترمذي)، كتاب المناقب، باب مناقب علي، حديث (٣٧١٣).
(٣) أخرجه أحمد في ( المسند) (٥/٣٤٧).
(٤) (خصائص علي) (ص ٩٦، حديث ٧٩).
(٥) ( المستدرك) (٣/ ١١٠).

دەكات دوژمنایەتی بكە)، هەندێك لە زانایان بە صەحیحی داناوە بـەڵام ڕاسـت ئەوەیە كە صەحیح نییە.

* بەڵام زیادەی: « **وَانْصُرْ مَنْ نَصَرَهُ، وَاخْذُلْ مَنْ خَذَلَه، وَأَدِرِ الْحَـقَّ مَعَـهُ حَيْثُ دَارَ** » (هەركەس سەری دەخات سەری خەی و هەركەس سەر شۆڕی دەكات سەرشۆڕی بكەی، و هەقی لەگەڵ بسوڕێنە بۆ هەر كوێیەك سوڕا) زیادەیەكـە بـە درۆوە نراوە بە دەم پیغەمبەری خواوە ﷺ.

ئەم فەرمودەیە شیعەكان دەیكەنە بەڵگە بۆ ئەوەی كە عەلی خەلیفەیە دوای پەیامبەر ﷺ، لەو ڕوانگەیەوە كە ئەفەرموێ: «مَنْ كُنْتُ مَـوْلاهُ فَعَلِـيٌّ مَـوْلاهُ»، ئەوان ئەڵێن كە پەیامبەر ئەفەرموێ: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ» یانی: عـەلی خەلیفەیە، چونكە وشەی (المولی) بە واتای والی دێت، ئەوەش بریتیە لـە گـەورە (سید) كە ئەبێت گوێڕایەڵی بكرێت، بەڵگەكەیان لەم ڕووەوەیە.

هەروەها لە عەلی یەوە رضي الله عنه هاتووە كە لە (ڕەحبە)دا لـە كوفـە وتوویـەتی: كێ گوێی لە پەیامبەر بوو ﷺ لە ڕۆژی (غـەدیر خُـم) دا پێـی وتم: «مَـنْ كُنْـتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ»؟ ئەوەبوو دوازدە كەس بەس لە ئەهلی بەدر شایەتیان بۆدا[1].

*** هۆكاری گوتنی ئەم ووتەیەی پەیامبەر ﷺ بە عەلی:**

ئەوان وا ئەزانن پەیامبەری خوا ﷺ ئەو هەموو خەڵكەی لەو شوێنەدا و لەو شەقەی گەرمایەدا تەنها بۆ ئەوە ڕاگرتووە، یانی: لە ناوچـەی ( جوحفـە )دا كـە (غدیر خُم )ی لێیە، هـەروەها ژمارەیـان گەیشـتۆتە زیـاتر لـە سـەد هـەزار -

(١) السلسلة الصحيحة حديث (١٧٥٠).

هـەروەها شـوێنی جیابوونـەوەی حاجیـان بـووە -، جـا پەیامبـەری خـوا ﷺ کۆیکردبونەوە تەنها بۆ ئەوەی ئەم شتەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە بریتییە لە: «مَـنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ»، لەگەڵ زیادکردنی ئەوزیادانەی کە پێشتر باسکران.

بەڵام ڕاست ئەوەیە کە هۆکاری وتنی حەدیسەکە لەبەر دووشت بووە :

یەکەم: لە بورەیدەی کـوڕی حەصـیبەوە ﷺ دەڵـێ: خالـدی کـوڕی وەلیـد پیاوێکی نارد بۆلای پەیامبەر ﷺ بەڵکو کەسێکی بۆ بنێرێ بە مەبەستی بردنی پێنج یەك (الخُمس)ـەکە[1]، ئەوەبوو عـەلی هـات و خومسـەکەی جیـاکردەوە و پاشان کەنیزەکێکی لە خومسەکە هەڵبژارد و چووە لای، بورەیدە ئەڵێ: لەبەرئەوە ڕقم لە عەلی هەستا و ڕۆیشت خۆشی شۆرد[2].

بە خالدم ووت: ئەتو سەیری ئەمە ناکەیت؟!

دوای کە هاتینەوە بـۆلای پەیامبـەری خـوا ﷺ، باسـەکەم بـۆ گێڕایـەوە، پەیامبەری خوا ﷺ بە بورەیدەی فەرموو: بورەیدە ئـەتو ڕقـت لـە عەلیـە؟ وتم:

---

(١) پەیامبەری خوا ﷺ خالدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ غـەزاکردنی (یەمـەن)، دوای ئـەوەی سەرکەوت ناردی بـە دوای پەیامبـەری خـوادا ﷺ کـە یـەکێك بنێرێـت بـۆ بردنـی پێـنج یـەکی دەستەکەوتەکان، ئەوەبوو پەیامبەر ﷺ عەلی نادر.

(٢) چونکە کاتێك عەلی ﷺ خومسەکەی جیاکردەوە، کەنیزەکێکی بۆخـۆی لـێ هەڵبـژارد و ڕۆیشتە لای، پاشان هاتە دەرەوە و خۆی شۆرد.

بەڵێ، فەرمووی: (ڕقت لێ نەبێ، چونکە لە خومسدا لەوە زیاتریشی بۆ هەیە[١] لە ڕیوایەتێکدا پەیامبەر ﷺ پێی فەرمووە: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيّ مَوْلاَهُ»[٢]

دووەم: ئەبی سەعیدی خودری رضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا عەلی رضي الله عنه نەیهێشتووە سواری ووشترە خێریەکان (إبل الصدقة) بن (کاتێك لە یەمەن بوون) و پیاوێکێشی کرد بە فەرماندار بە سەریانەوە و خۆی ڕۆیشت بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ لە مەککە، کاتێك لە ڕێگەدا گەیشتن پێی، دەبینێ ئەوەی کە کردبووی بە فەرماندار ڕێگەی پێداون، ئیتر کە ئەوانی بینی و وشترەکانی بینی شوێنەواری سواربوونیان پێوە دیارە، تورە بوو وسەرزەنشتی کابرای کرد.

ئەبو سەعید ئەڵێ: (کە گەڕاینەوە باسی ئەو دەردەسەری وتەنگانەییەمان بۆ پەیامبەری خوا ﷺ گێڕایەوە کە بەدەست عەلیەوە چەشتمان)، لە ڕیوایەتی تردا هاتووە ئەڵێ: (پۆشاك بووە ویستوویانە لەبەری کەن بەڵام عەلی نەیهێشتووە)، پەیامبەری خوایش ﷺ فەرمووی: (ئەی سەعدی کوڕی مالك (کە ئەبوسەعیدە) واز لەو قسانەت بێنە لە ئاست عەلی برای خۆت، دە بەخوا ئەزانم کە ئەو چاکی کردووە لە ڕێگای خوادا).

ئین کەسیر ئەڵێ: سەنەدەکەی (جَيِّدَ)ەو لەسەر مەرجی نەسائیە و بەیهەقی و.. هتد دەری هێناوە.

---

(١) (صحيح البخاري) كتاب المغازي، باب بعث علي وخالد الى اليمن، حديث (٤٣٥٠).
(٢) (جامع الترمذي) كتاب المناقب، باب مناقب علي، حديث (٣٧١٢).

هەروەها ئیبن کەسیر ئەڵێ: کاتێك (وتی وتـی) لـە نێـو سـوپاکەدا لەسـەر عەلی ﷺ زۆر بوو، بـەهۆی ئـەو ڕێگریـەی لـە سـواربوونی وشـترە خێریـەکان، هەروەها بەهۆی ئەو پۆشاکانەی کە لێی وەرگرتنەوە دوای ئەوەی جێگرەکەی پێی دابوون، -والله أعلم ـ کاتێك پەیامبـەری خـوا ﷺ لـە حەجەکـەی گەڕایـەوە و مەناسیکەکانی بەجێهێنا و بەرەو مەدینـە کەوتـە ڕێ، دایـان بـەلای (غـەدیری خُم)دا، لەوێ پەیامبەری خوا ﷺ هەستایە سەرپێ و وتارێکی بـۆ دان و ئەسـتۆ پاکی عەلی ﷺ ڕاگەیاند، قەدری بەرز نرخاند و فەزڵی ئەوی بە بیر هێنانەوە، بۆ ڕەواندەنەوەی ئەوەی لە دڵی خەڵکێکی زۆر دروست بوو بوو[١]

کەواتە: ئەمە هۆکاری ووتنی فەرمودەکە بووە، ئەوان باسی عەلیان کردووە، هەر بۆیە دەبینی پەیامبەری خوا ﷺ قسـەکانی دوادەخـات هـەتا گەڕایـەوە بـۆ مەدینە، لە مەککەدا لە ڕۆژانی میندا یان لە ڕۆژانـی عەرەفـەدا باسـی نـەکرد بەڵکو دوای خست بۆ دوای گەڕانەوە، لەبەر چی؟ لەبـەر ئـەوەی ئـەم مەسـەلەیە تایبەتە بە خەڵکی مەدینەوە، چونکە ئەوانەی قسـەیان لەسـەر عـەلی کـرد ﷺ خەڵکی مەدینە بوون و ئەوان لە غەزاکە لەگەڵ عەلی بوون.

(غەدیری خُم) یش لە جوحفەدایە نزیکەی دوو سەد و پـەنجا کیلۆمـەتر لـە مەدینەوە دوورە، ئەوەشی کە ئەڵێت شوێـنی جیابوونەوی حاجیانە درۆزنە، چونکە شوێنی کۆبوونەوەی حاجیان مەککەیـە، هـەرگیز شـوێنی جیابوونـەوی حاجیـان ناکەوێتە دەرەوی مەککە بە دووری دوو سەد و پەنجا کیلۆمەترەوە هەرگیز، دوای

---

(١) (البداية والنهاية) (٥/٩٥).

ئەوەش خەڵکی مەککە هەر لە مەککە دەمێننەوە، خەڵکی طائف دەگەڕێنەوە بۆ طائف، خەڵکی یەمەن دەگەڕێنەوە بۆ یەمەن، خەڵکی عێراق دەگەڕێنەوە بۆ عێراق، ئیتر ئا بە وشێوەیە هەر کەسێك حەجەکەی تەواو بکات دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، هەروەها خێڵە عەرەبەکانیش بەهەمان شێوە دەگەڕێنەوە لای بژێوی خۆیان، جا بۆیە کەس لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ نەبووە تەنها خەڵکی مەدینە و ئەوانەی لەسەر ڕێگای مەدینەن نەبێ، هەر ئەمانەش بوون پەیامبەری خوا ﷺ ووتاری بۆدان و تێیدا فەرمووی: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاَهُ فَعَلِيّ مَوْلاهُ».

جا جیاوازی نێوان سوننە و شیعە لە تێگەیشتنی فەرمودەکەی پەیامبەرە ﷺ نەك لە جێگیر بوونەکە[1].

شیعە ئەڵێن: «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيّ مَوْلاهُ»، یانی هەرکەس من والی و فەرمانڕەوابیم ئەوا عەلیش والی و فەرمانڕەوایەتی، بەڵام ئەهلی سوونە ئەڵێن: مانای «مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيّ مَوْلاهُ»، یانی: (الموالاة)کە بریتییە لە سەرخستن و خۆشویستن، کە پێچەوانەی ڕق لێبوون و دوژمنایەتیە، لەبەر چەند شتێك:

یەکەم: لەبەر ئەو زیادەیەی وا هاتووە، ئەوەی کە وتم هەندێك لە زانایان بە صەحیحیان زانیوە، کە ئەفەرموێ: (اللهم وال من والاه وعاد من عاداه) واتە: (خوایە دۆستایەتی هەرکەس بکە دۆستایەتی دەکات وە دوژمنایەتی هەرکەس بکە دوژمنایەتی دەکات)، جا دۆستایەتی (الموالاة) و ڕقەبەرایەتی (المعاداة)

---

(١) واتە قسە لەوە نیە کە فەرمودەکە صەحیحە یان زەعیفە، لە تێگەیشتنە لە: واتای مەولا. (وەرگێڕ)

لێرەدا شەرحی وتەکەی پێشوترە کە دەفەرموێ: «فعلي مـولاه»، بۆیـە ئەمـە لـە بارەی خۆشویستنی عەلیەوەیە رضي الله عنه.

دووەم: ڕاوەستانەکەی پەیامبەر ﷺ لەبەر عەلی نەبووە، ئەگەرچی عەلی رضي الله عنه شایستەی ئەمە ولەمەش زیاترە، بەڵام ڕاوەستانەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ حەوانـەوە بووە، سەفەر کردن لە مەککەوە بۆ مەدینـە دوور ودرێـژە و نزیکـەی پێـنج بـۆ حەوت ڕۆژی پێدەچێ، پەیامبەر ﷺ زیاتر لە جارێك لەو ماوەیـەدا ئیسـراحەتی دەکرد، هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ باسی قورئان و ئال و بەیتەکەی بـۆ خـەڵك کرد و بە بیریـانی هێنایـەوە کـە پێویسـتە ڕێزیـان لێبگیرێـت و بـە شـکۆمەند ڕابگیرێن و شوێنیان بکەون، دوای ئەوە ئاگاداری کردنەوە سەبارت بەوەی لەگـەڵ عەلی رضي الله عنه ڕویداوە و فەرمووی: ((مَنْ كُنْتُ مَوْلاَهُ فَعَلِيّ مَوْلاَهُ)).

سێیەم: واتای وشەی (مَوْلاَهُ).

ئیبن ئەسیر ئـەڵێ: «المَـوْلي يَقَـعُ عَلَـى الـرَّبِّ، والمَالـك، والمُـنْعِم، والنَّاصـرِ، والمُحِـبِّ، والحَلِيـفِ، والعَبْـدِ، والمُعْتِـقِ، وابـنُ العَـمّ، والصِّـهْرِ»[1]. واتـە: (المَـوْلَى) بـەمانای: پـەروەردگار (پـەروەردەکار) و، دەسـەڵاتدار و، نیعمـەت بـەخش و، سەرخەر و، خۆشەویست و، هاوپەیمان و، بەنـدە و، ئـازادکراو و، کـوڕی مـام و، زاواش بەکاردێ، هەموو ئەمانە عەرەب وشەی (مَوْلَى)ی بۆ بەکاردێنێ.

چوارەم: فەرمودەکە هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئیمامەت تێدا نییە، چونکە ئەگەر پەیامبەری خوا ﷺ مەبەستی خیلافەت بوایە ئەوا وشەیەکی بەکارنەدەهێنا ئـەو هەموو مانایە لە خۆ هەڵگرێ کە ئیبن ئەسیر باسی کرد، ئەو کاتـە باشـتر وابـوو

(١) (النهاية في غريب الحديث والأثر) (٥/٢٢٨).

بڵێ: (دوای خۆم عەلی خەلیفەی منە)، یا (دوای من عەلی ئیمامە)، یا (ئەگەر مردم سەمع وتاعەتان بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالب بێ)، بەڵام پەیامبەری خوا ﷺ هەرگیز هیچ کام لەم وشە یەکلا کەرەوانەی بەکار نەهێناوە کە جیاوازی ناهێڵێ ئەگەر هەبێ، بەڵکو تەنها فەرمووی: (خوایە دۆستایەتی هەرکەس بکە دۆستایەتی دەکات وە دوژمنایەتی هەرکەس بکە دوژمنایەتی دەکات)[1]

خوای پایە بەرز دەفەرموێ: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ {الحديد: ١٥}. واتە: (جا ئەمڕۆ هیچ بریتیەك وەرناگیرێ نە لە ئێوە و نە لەوانەی کە کوفریان کردوە، جێگەتان ئاگری دۆزەخە، ئەوە دۆست و مەولاتانە، ئای سەرەنجامێکی چەند خراپە).

دەبینی خوای گەورە جل جلالە ناوی ئاگرەکەی ناوە (مَوْلَى) بەهۆی توندی پێوە لکانی و یەکگرتنییەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا -خوا پەنا بدات-.

پێنجەم: دۆستایەتیکردن (مُوالاة) وەسفێکی چەسپاو و هەمیشەییە بۆ عەلی، چ لە ژیانی پەیامبەردا و، چ دوای مردنی و هەروەها دوای مردنی عەلیش رضي الله عنه، جا عەلی هەر دۆست و خۆشەویست و مەولای ئیمانداران بووە لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ و مەولای ئیمانداران بووە لە دوای وەفاتی پەیامبەر ﷺ ولە دوای مردنی خۆیشی رضي الله عنه هەر مەولای ئیمانداران بووە، ئێستاش هەر

---

(١) نوری تەبرەسی کە یەکێکە لە گەورە زانایانی شیعە ئەڵێ: (پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی غەدیردا بە ڕاشکاوی و بە بێ یەکلایی کردنەوە خیلافەتی دوای خۆی نەداوە عەلی، بەڵکو بە وتەیەك ئاماژەی بۆ کرد کە موجمەلە و بەشدارە لەگەڵ چەندین واتای تردا، و بۆ دیاریکردنی مەبەست لەو فەرمودەیەدا پێویستیمان بە چەندین قەرینە دەبێت) ت.و، بڕوانە (فصل الخطاب) (٢٠٥/٢٠٦).

مەولامانە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ [المائدة:٥٥].

واتە: (بێگومان دۆست و پشتیوانی ئێوە تەنها خوا و پەیامبەرەکەیی و بڕوادارانن، ئەوانەی کە نوێژەکانیان بە ڕێك وپێکی بەرپا دەکەن و زەکات ئەدەن وبەردەوام ملکەچی فەرمانی خوان).

عەلیش ﵁ لە پێشەوایانی ئیماندارانە.

شەشەم: پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر مەبەستی (والی) بوایە نەیدەفەرموو (مَوْلَی)، بەڵکو دەیفەرموو (والی)، چونکە وشەی (مَـوْلَی) و ووشەی (والی) دوو شتی جیاوازن.

(والی) لە (الوِلاَية)ەوە هاتووە کە بریتیە لە (الحُکْم)، بەلام (مَوْلَی) لە (الوَلاَية) ەوە هاتووە کە بریتیە لە دۆستایەتی وخۆشویستن وسەرخستن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ [التحريم:٤].

واتە: (ئەگەر هەردووکتان (ئەی عائیشە و حەفصە) دەگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەوا جێی خۆیەتی، چونکە بە ڕاستی دڵەکانتان لایدا لە هەق و ڕاستی، خۆ ئەگەر هەر بەردەوام بن و پشتی یەکتر بگرن لە ئاست پەیامبەر ﷺ، ئەوا بێگومان خوا پشتگیری ئەوە، هەروەها جوبرەئیل و ئیماندارە چاکەکان، فریشتەکانیش لەوەودوا پشتیوانی ئەوون).

(مَوْلاُه) لێرەدا مەبەست خۆشویستن و سەرخستن و پشتگیری کردنە.

خوای پاك و بێ پەڵە لەبارەی گەلەكەی ئیبراهیمەوە ﷺ دەفەرموێ:﴿ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ﴾ {آل عمران: ٦٨}.

واتە: (بێگومان نزیكترین كەس لە ئیبراهیمەوە ئەوانەن كە وەختی خۆی شوێنی كەوتن و پەیڕەویان كرد، هەروەها ئەم پەیامبەرە و ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە وە خوا دۆستی بڕوادارانە).

ئەمە ماناكەی ئەوەنیە كە ئەوان سەرۆك و والی ئیبراهیم بوویێتن، نەخێر بەڵكو ئیبراهیم ئیمام و سەرداری ئەوان بووە.

* ئیمامی شافیعی لەبارەی فەرمودەكەی زەیدەوە ئەڵێ: (مەبەست پێی پشتیوانی كردن و سەرخستنی ئیسلامە هەروەك خوای پایەبەرز ئەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴾ {محمد:١١}. واتە: (چونكە بێگومان خوا پشتیوانی ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە وە بێگومان كافرانیش هیچ پشتیوانێكیان نییە)[١]. هەر بۆیە فەرمودەكە ئاماژەی بۆ ئەوە تێدا نییە كە عەلی ﷺ دوای پەیامبەری خوا ﷺ ببێتە خەلیفە، بەڵكو تەنها ئاماژەی ئەوەی تێدایە كە عەلی ﷺ دۆست (وەلی)ـەكە لە وەلیەكانی خوا و پێویستە دۆستایەتیمان بۆی هەبێت كە بریتیە لە خۆشەویستن و سەرخستن و پشتگیری كردن.

* * *

(١)ـ( النهاية في غريب الحديث والأثر) (٥/٢٢٨).

# باسی دووەم

## فەرمودەی کراسەکە و ئایەتی موباهەلە

ئەم فەرمووده‌یە عائیشە -ڕەزای خوای لێبێ- ڕیوایەتی ئەکات[1] و ئەڵێ: (بەرە بەیانێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو و بوردەیەکی سوفیی[2] لەسەر شان بوو، پاشان عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینیی خستە ژێر کراسەکەوە و فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ {الأحزاب:٣٣}. واتە: (بەڕاستی ئەی ئەهل و بەیتی پەیامبەرﷺ خوا دەیەوێ ئێوە لە هەر جۆرە پیسی و گوناهێك دوور بخاتەوە و پاك و خاوێنتان بکاتەوە بە تەواوەتی).

جا ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خوای پەروەردگار ویستویەتی لە پیسی و تاوان پاکیان کاتەوە، هەرچیش خوا بیەوێ ئەبێ، ئەگەریش خوا لە پیسی و تاوان پاکی کردنەوە ئەوا ئەبنە مەعصوم، کە بوونیش

---

(١) هەروەك ئەبینیت فەرمودەکە دایکی ئیمانداران (عائیشەی کچی صیددیق) -خوا لە هەردوکیان رازی بێ- ڕیوایەتی دەکا، جا با هەر کەسێکی بە ویژدان ببینێ کە چۆن فەزڵەکانی ئال و بەیت -ڕەزای خوایان لێبێ- ڕیوایەت دەکات ، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا خەڵکانێك کە لەخوا ناترسن بە ناوی خۆشویستنی ئال و بەیتەوە تانەی لێدەدەن؟! ئەوەش ئیمامی موسلیمە: فەرمودەکە لە صەحیحەکەی خۆیدا بە ژمارەی (٢٤٢٤) بۆمان ڕیوایەتی دەکات و نەیشاردۆتەوە هەروەکو هەندێك بوختی بە زانایانی ئەهلی سوننەوە دەکەن. هەر خوایش پشتوپەنایە.

(٢) لەبەر ئەمە فەرموەدەکە ناونرا فەرمودەی کراسەکە.

بە مەعصوم ئەوا پێویستە ئەوان لە پێشتر بن بۆ خیلافەت وەك لە غەیری ئەوان. ئەمەش بانگەشەیەكی ناڕاستە و پووچە لە زۆر ڕووەوە:

**یەكەم:** ئەم ئایەتە كە ناسراوە بە ( ئایەتی پاككردنەوە) (آية التطهير )، خۆی لەسەر خێزانەكانی پەیامبەر ﷺ دابەزیوە، هەروەكو خوا دەفەرموێت: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ {الأحزاب:٣٣}. واتە: (ئەی ژنانی پەیامبەر ﷺ ئێوە وەك هیچ یەك لە ئافرەتانی دیكە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن، كەواتە بە خەمزە و نازەوە قسە مەكەن، نەوەكو ئەوەی كە دڵی نەخۆشە بوورێژێت و نیازی خراپ بكات وقسەی چاك و بەجێ بكەن وە لە ماڵەكانی خۆتاندا بمێننەوە و زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن وەكو خۆدەرخستنی ئافرەتانی نەفامی پێش ئیسلام * وە نوێژ بەرپا بكەن و زەكات بدەن وگوێڕایەڵی خوا و پێغەمەمبەرەكەی بكەن، بەڕاستی ئەی ئەهل و بەیتی پەیامبەر ﷺ خوا دەیەوێ ئێوە لە هەر جۆرە پیسی و گوناهێك دوور بخاتەوە و پاك و خاوێنتان بكاتەوە بە تەواوەتی * وە بیركەنەوە لەوەی كە دەخوێندرێت لە ماڵەكانتاندا لە ئایەتەكانی خوا و فەرمودەكانی پەیامبەر ﷺ و فەرامۆشی مەكەن، بەڕاستی خوا ووردبینی ئاگادارە).

لە ڕاستیدا هەر كەسێك بە ووردی سیاقی ئەم ئایەتانە دەخوێنێتەوە، دڵنیا ئەبێت لەوەی كە ئەمە تایبەتە بە ئافرەتانی پەیامبەرەوە ﷺ.

سەبارەت بە ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿لِيُذْهِبَ عَنكُمُ﴾. کە نەیفەرمووە (عَنْكُنّ)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ﴾ ونەیفەرمووە (يُطَهِّرَكُنّ)[1] هەندێك ئەیکەنە بەڵگە و ئەڵێن مادام لێرەدا میمی جەمعی هێناوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ژنەکانی پەیامبەر ﷺ پاککردنەوە نایانگرێتەوە، بەڵام عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین ي دەگرێتەوە بە بەڵگەی فەرمودەکە، ئەمەش قسەیەکی پوچە، چونکە ئایەتەکە پەیوەستە بەوەی پێشووەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾[2]، پاشان ئەم ئایەتەی بە دواوە هێنا ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾[3]. هەر هەموو ئەم ئایەتانە قسەکردنە لەگەڵ ژنانی پەیامبەر ﷺ.

دووەم: خوای گەورە لە باتی نونی ژنانە میمی جەمعی هێنا، چونکە ئەو ژنانە پەیامبەری خواشیان لەگەڵدا بەشدار دەبێت (ئاخر ئەو گەورەی ئەهل و بەیتە)، هەروەك خوای پەروەردگار لەبارەی خێزانەکەی ئیبراهیمەوە دەفەرموێ: ﴿ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴾ {هود: ٧٣}.

---

(١) لە زمانی عەرەبیدا کۆی نێر بە (م) میمی جمع ئەبێ و جەمعی مێ بە (نّ) نونی ژنانە .. ئەبێ. جا خوای پەروەردگار قسە لەگەڵ ئافرەتانی پەیامبەردا ﷺ دەکات کەچی دەفەرموێ: ﴿ليذهب عَنكم﴾ نەیفەرمووە (عنكنّ)، لە کاتێکدا پاش و پێش و تەنانەت خودی ئایەتەکەش قسەکردنە لەگەڵ ژنەکانی پەیامبەردا ﷺ. هۆکارەکەشی ئێستا نووسەر روونی دەکاتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: (ولە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە..).

(٣) واتە: (وبیرکەنەوە لەوەی کە دەخوێندرێت لە ماڵەکانتاندا..).

واتە: (فریشتەکان فەرموویان: ئەتو سەرت لە فەرمانی خـوا سـوڕدەمێنێ، ڕەحمەت و بەرەکەتی زۆری خواتان لەسەر بێ ئەی ئال و بەیتی ئیبراهیم، بەڕاستی خوا سوپاسکراوی چاکە فراوانە).

دەفـەرموێ: ﴿ عَلَيْكُمْ ﴾ لـە کاتێکـدا ئـەوان دووانـن تـەنها ئیـبراهیم و خێزانەکەین.

دیسانەوە خوای پایە بەرز لە بارەی موساوە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾ {القصص:٢٩}.

واتە: (ئینجـا کاتێـك موسـا مـاوە دیاریکراوەکـەی تـەواو کـرد (مـاوەی شوانیەکە) لەگەڵ خێزانەکەی بە شەو ڕۆیشتن (لـە مەدیەنـەوە بـۆ میصـر) لـە دوورەوە لای ڕاستی کێوی طور ئاگر و ڕوناکیەکی بینی، بە خێزانەکەی ووت: ئـا لێرەدا بن، من بەڕاستی ئاگرێك بەدی دەکەم، بەڵکو هەواڵێکتان بۆ بێنم لای ئەو ئاگرە یا چڵوسکێکی ئاگرتان بۆ بێنم بەڵکو خۆتانی پێ گەرم کەنەوە).

دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾ کەچی تەنها ژنەکەی لەگەڵدا بووە.

هەروەها وتەی خێزانەکەی عەزیز: (سزای نییە ئەو کەسەی ویستبێتی خراپە لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات جگە لە... تا کۆتایی ئایەتەکـە)، کەچـی مەبەسـتی خۆیەتی.

کە خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿عَنكُمُ ﴾ لەبـەر بەشـداربوونی پەیامبـەر خوا ﷺ لەگەڵ ژنەکانیدا، نەك ئەوەی کە عەلی و فاتیمـە و حەسـەن وحوسـەین چووبێتنە ڕیزی ئەم ئایەتەوە. عەلی و فاتیمە و حەسەن وحوسـەینـي لـە ئـال و

بەیتن بە دەلیلی فەرمودەی كراسەكە نەك بە ئایەتەكـە، فـەرمودەی كراسـەكەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە عەلی و فاتیمە و حەسەن وحوسەین لـە ئـال و بـەیتی پەیامبەرن، كاتێك پەیامبەری خوا ﷺ كراسەكەی داسـەریانە و پاشـان ئەمـەی خوێنـــــد: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ كردیانی بە ئال و بەیتی خۆی.

سێیەم: واتای ئال و بەیتی پەیامبەر ﷺ، هەر خێزانەكانی پەیامبەر ﷺ بە تـەنها ناگرێتـەوە، هـەر عـەلی و حەسـەن و حوسـەین و فاتیمـەش‌ي بەتـەنها ناگرێتەوە، بەڵكو جگە لەوانیش دەگرێتەوە، هـەروەك لـە فەرمودەكـەی زەیـدی كوڕی ئەرقەمدا هاتووە، لێیان پرسی: ژنەكانی بە ئـەهل و بـەیتی ئـەژمێردرێ؟ وتی: ژنەكانی لە ئەهل و بەیتن، بەڵام ئـەهل و بەیتەكـەی ئەوانـەن كـە خێـر و صەدەقەیان لەسەر حەرام كرابوو، ئەوانیش بریتین لە (ئالی عەلی و ئالی جەعفەر و ئالی عەقیل و ئالی عەبباس)، وتی: هەموو ئەمانە صەدەقەیان لەسەر حـەرام بوو؟ وتی: بەڵێ). كەواتە مـەفهومی ئـەهل و بـەیتی پەیامبـەر ﷺ بـۆ لـەوە زیاتریش فراوان بوویەوە.

جا ئەهل و بەیت، بە بەڵگەی ئایەتەكـە خێزانـەكانی دەگرێتـەوە. عـەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینیش بە بەڵگەی فەرمودەی پۆشاكەكە و فەرمودەكەی زەیدی كوڕی ئەرقەم، دەیانگرێتەوە.

هەروەها ئالی عەبباسی كوڕی عەبدولموتەلیب و ئالی عەقیلی كـوڕی ئـەبو تالب و ئالی جەعفەری كوڕی ئەبو تالبیش دەگرێتەوە بـە فەرمودەكـەی زەیـدی كوڕی ئەرقەم.

هەموو ئا ئەمانە ئەهل و بەیتی پەیامبەرن ﷺ، بەڵکو هەموو بەنی هاشم لە ئەهل و بەیتی پەیامبەرن ﷺ، کە هەموو ئەوانەن وا صەدەقەیان لەسەر قەدەغە کراوە.

بە بەڵگەی فەرمودەکەی عەبدولموتەلیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەڵێ: ڕەبیعەی کوڕی حارس و عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دانیشتن و وتیان: بەخوا ئەگەر ئەم دوو منداڵەمان (بە من[1] و فەزڵی کوڕی عەبباسیان ووت) بناردایە بۆلای پەیامبەر ﷺ و قسەیان لەگەڵ بکردایە، بەڵکو هەردووکیانی بکردایە بە بەرپرسی ئەم خێر و صەدەقانە، ئەوەیان کە لەسەربوو ئەنجامیان دەدا و لەوەش بەر خەڵك دەکەوێ شتێك بەر ئەمانیش دەکەوت، ئەڵێ: ئەوان لەم قسەو باسانەدا بوون عەلی کوڕی ئەبو تالب هات و لایان وەستا، ئەوانیش باسەکەیان پێ ووت، عەلی وتی: کاری وا مەکەن، بەخوا بۆتان ناکات، ڕەبیعە چوو بە گژیدا و وتی: سوێند بەخوا بۆیە وا ئەڵێی حەسودیمان پێ ئەبەی، دە بەخوا تۆ بویتە زاوای پەیامبەری خوا ﷺ ئێمە حەسودیمان پێ نەبردیت.

عەلی وتی: بیان نێرن، ئەوان ڕۆیشتن و عەلی بۆخۆی پاڵکەوت.

ئەڵێ: هەرکە پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی تەواو کرد خێرا ڕۆیشتن بۆ هۆدەکەی، ئەڵێ: لەوێ دانیشتن تا هات، کە هات کردیە گوێمانە و فەرمووی: ئەو کەین و بەینەتان لەچیە، چیتان بە دەستەوەیە، پاشان ڕۆیشتە ژورەوە و ئێمەش لە دوای، جا ئەو ڕۆژە لە لای زەینەبی کچی جەحشدا بوو، ئەڵێ:

---

(١) بێژەری: (بە من...) عەبدولموتەلیبی کوڕی ڕەبیعەیە، گوتراویشە: ناوی موتەللیبە. ماناکەشی: یانی هەر یەك لە ڕەبیعە و عەبباس کوڕەکانی خۆیان: (عەبدولموتەلیب و فەزڵ) یان نارد بۆلای پەیامبەر ﷺ بۆ ئەوەی داوای ئیشێکی لێبکەن و ببێتە یارمەتی دەر بۆ ژن هێنانیان.

هەردووکمان چاوەڕێی یەکترمان دەکرد قسە بکەین، تا ئەوەبوو یەکێکمان هاتە گۆ و وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ تۆ چاکترینی خەڵکی ولە هەموو کەس باشتر سیلەی ڕەحم دەگەیەنی، ئەوەتا کاتی ژنهێنانمان هاتووە، بەڵکو بمانکەی بە بەرپرس بەسەر هەندێك لەم خێر و صەدەقانەوە، ئەوەی خەڵکی دەیکا ئێمەیش دەیکەین و لەوەی بەریان دەکەوێ ئێمەش بەرمان دەکەوێ، ئەڵێ: بێ دەنگ بوو و زۆری پێ چوو هەر هیچی نەفەرموو تا ویستمان قسەی لەگەڵدا بکەینەوە، ئەڵێ: بەڵام زەینەب لە پشت پەردەکەوە ئاماژەی بۆ کردین کە دووبارە لێی مەپرسن، ئەڵێ: دوای فەرمووی: (خێر و صەدەقە بۆ ئالی موحەممەد نییە، ئەمە چڵکی دەستی خەڵکە)[1].

**چوارەم:** ئایەتەکە ئەوەی تێدا نییە کە خوای گەورە پیسی و تاوانی لێ دوور خستبێتنەوە، چونکە ئەم ویستە (إرادة)یە ئیرادەیەکی شەرعیە، ئیرادەی خۆشەویستیە، نەك ئیرادەی قەدەری. یانی: خوا پێی خۆشە لە پیسی و خراپی دوورتان خاتەوە، جا بێگومان خوای پەروەردگار پیسی و خراپی لە فاتیمە و عەلی و حەسەن و حوسەین و لە خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ و هەروەها لە خانەوادەی عەقیل و خانەوادەی جەعفەر و خانەوادەی عەبباسیش دوور خستۆتەوە.

بەڵام ویستەکە ویستی شەرعیە، هەر بۆیە لە خودی ئەو فەرمودەیەدا هاتووە کە پەیامبەری خوا ﷺ بە پۆشاکەکەی دایپۆشیون و فەرمویەتی: «اللهم هؤلاء أهل بيتي، اللهم اذهب عنهم الرجس»، (پەروەردگارا ئەمانە ئەهل و بەیتی منن، پەروەردگارا پیسی و خراپیان لێ دوور بخەرەوە)[2].

---

(١) (أخرجه مسلم ): كتاب الزكاة، ترك استعمال آل النبي ﷺ على الصدقة برقم (١٠٧٢).
(٢) (رواه الترمذي): كتاب المناقب، باب مناقب أهل بيت النبي ﷺ رقم (٣٧٨٧).

باشە ئەگەر خوا ﷻ پیسی و خراپی لێ دوور خستونەتەوە، ئیتر بۆچی پەیامبەری خوا ﷺ دوعای لێدورخستنەوەی پیسیان بۆ دەکات؟[1].

دوعاکەی پەیامبەریش ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئیرادەکە ئیرادەیەکی شەرعیە هەروەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾ {النساء:٢٦-٢٨}. واتە: (خوا دەیەوێت بۆتان ڕون بکاتەوە و ڕێنموویتان بکات بۆ ڕێوشوێنی ئەو خواناسانەی کە لە پێش ئێوەوە بوون و لێتان خۆش ببێت وە خوا دەیەوێت لێتان ببورێت، بەڵام ئەوانەی کە شوێن ئارەزوەکانی خۆیان کەوتوون دەیانەوێ لاتان بدەن بە لادانێکی گەورە * وخوا دەیەوێت ئەرکتان لەسەر سوك بکات چونکە ئادەمی بە لاواز دروست کراوە).

هەموو ئەم ویستانەی خوای گەورە باسی دەکات هەمووی ویستی شەرعین، بەڵێ خوا ﷻ دەیەوێ ئەرکەکان لەسەر هەمووان سوك بکات و خوا ﷻ دەیەوێ لە هەموو خەڵك خۆش ببێت، بەڵام ئایا لە هەموو خەڵك خۆش بووە؟ خەڵکی باوەڕدار و بێ باوەڕیان تێدایە، خوا ﷻ لە هەموو خەڵك خۆش نەبووە، ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ {التغابن:٢}. واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە، ئینجا هەندێکتان بێ باوەڕ و هەندێکی ترتان باوەڕدارن وە خوایە بینیایە بە هەر شتێك ئەنجامی دەدەن).

---

(١) تەنانەت لەلای شیعەی دوازدە ئیمامی دا، هەر دوازدە ئیمامەکە و فاتیمەشیان لەگەڵدا بێ بە پاکی دروست کراون [لەوەش زیاتر وەك لە حەدیسە صەحیحە نا صەحیحەکانیاندا هاتووە: خەڵك هەموو منداڵی زینان (أولاد البغايا) تەنها شیعەکەی خۆمان نەبێت ].

**پێنجەم:** خوای پاك و بێ گەرد، دەیەوێت پیسی لە هەموو کەسێك و لە هەموو ئیماندارێك دوور خاتەوە.

بۆیە دەبینی پەیامبەری خوا ﷺ فەرمان دەکاتە موسڵمان کە ئەگەر ویستی نوێژ بکات با خۆی لە شوێنی پیس بە دوور بگرێت، خوای پاك و بێ گەرد دەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ {المدثر:٤}. واتە: (و پۆشاکت پاك و خاوێن بکەوە). هەروەها فەرمانی کردووە بە دەست نوێژگرتن، هەروەها فەرمانی کردووە بە خۆشۆردن لە کاتی لەشگرانی دا[1].

**شەشەم:** پاککردنەوە تایبەت نییە بە عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین ڕەزای خوایان لێبێ، بەڵکو بۆ جگە لەوانیشە، هەورەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ {التوبة:١٠٣}. واتە: (لە ماڵ و داراییان صەدەقە و زەکاتێك وەربگرە و بە هۆیەوە پاکیان دەکەیتەوە لە گوناه و تاوان و دڵیان و ڕەوشتیان پوخت و خاوێن دەکەیت بەو ماڵ بەخشینە، هەروەها دوعای خێریان بۆ بکە بەڕاستی دوعای تۆ ئارامی و دڵخۆشیە بۆ ئەوان و خوا هەمیشە بیسەری زانایە).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ {المائدة:٦}. واتە: (ئەی

---

(١) هەروەکو لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە ئاماژە بۆ ئەمەدەکەن، بڕوانە کتێبە فیقهیەکان، بەشەکانی (طهارة).

ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر هەستان بۆ نوێژکردن ئەوە دەم و چاوتان بشۆن ئینجا دەستەکانتان تا ئانیشەکەکانتان پاشان دەستی تەڕ بهێننە سەرتاندا و پێکانتان بشۆن تا هەردوو قولە پێتان وئەگەر لەش گران بوون ئەوا خۆتان خاوێن بکەنەوە و خۆتان بشۆن و ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون یان کەسێکتان هاتەوە لەسەر ئاو یان لەگەڵ خێزانەکانتاندا جووت بوون و ئاوتان دەست نەکەوت ئەوا بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن ئەو خۆڵە بهێنن بە ڕوخسارو دەستاندا، خوا نایەوێ تووشی هیچ تەنگی و نارەحەتیەکتان بکات بەڵکو ئەیەوێ پاکتان بکاتەوەو دەیەوێت نیعمەت و چاکەی خۆی تەواو بکات بەسەرتانەوە، بۆ ئەوەی شوکرانە بژێر بن).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴾ {الأنفال: ١١}.

واتە: (بیرکەنەوە کاتێك خوا وەنەوزی بەسەرتاندا هێنا (بۆ ئەوەی ترس و بیمتان لەدڵ نەهێڵێ و ببێتە) دڵنیایی بۆتان لەلایەن پەروەردگارەوە و بارانێکیشی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن تا پاکتان بکاتەوە پێی وپیسی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە و دڵەکانتان دامەزراو و توند پەیوەست بکات پێکەوە وە بەو بارانە پێکانتان دامەزراو و جێگیر بکات).

جا هەموو ئەوان کە (سێ سەد ودە وقسور دەبن) - لەسەر قیاس و مەزهەبی ئەوان بێ- ئەمانیش وەك ئەوان مەعصومن، چونکە خوا جل جلالە دەفەرموێ: ﴿لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾ (تا پاکتان بکاتەوە پێی و پیسی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە).

**حەوتەم:** پاك بوونەوە لە پیسی مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان خەلیفەی دوای پەیامبەرنﷺ، ئێمە دڵنیاین خوای گەورە عەلی پاك کردۆتەوە لە پیسی بۆیە بووە بە(مەولای) بڕواداران، هەروەهاحەسەن و حوسەین و فاتیمەش بە هەمان شێوە، هەروەها خێزانەکانی پەیامبەریش ﷺ و خوا جل جلاله ناوی ناون دایکانی ئیمانداران: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا﴾ {الأحزاب:٦}. واتە: (پەیامبەر ﷺ پێشترە بە بڕواداران لە خودی خۆیان، خێزانەکانیشی دایکی بڕوادارانن و خزمانیش لە قورئانی خوادا بۆ یەکتری لە پێشترن (میرات لە یەکتر بگرن)، لە ئیمانداران و کوچبەران، مەگەر خۆتان چاکەیەك بە دۆست و ئاشنا وخۆشەویستانتان بکەن، ئەو بڕیارە لە قورئاندا -یا لە لوح المحفوزدا- نووسراوە).

بە هەمان شێوە هاوەڵانی پەیامبەرﷺ، ئەوانیش هەر هەموویان خودا لە پیسی بە دووری گرتوون بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی کە پێشتر باسمان کرد[1] ئەوانیش دەبنە مەولای موسڵمانان، دوای ئەوەش پاکبونەوە لە پیسی (مەعصومیەت) ناگەیەنێ، چ جای ئیمامەت.

بە نیسبەت ئایەتی موباهەلەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ {آل عمران:٦١}.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و پلەوپایەیان و هیچ پەیوەندیەکی بە ئیمامەتەوە نییە نە لە نزیك و نە لە دورەوە.

❊ ❊ ❊

(١) انظر: تفصيل الرد على هذه الشبهة في: (مختصر التحفة الاثني عشرية) ص ١٤٩.

# باسی سێیەم

## ئایەتی ویلایەت

بریتیە لەو فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾ {المائدة:٥٥}. واتە: (بێگومان دۆست و پشتیوانی ئێوە تەنها خوا و پەیامبەرەکەیی و بڕوادارانن، ئەوانەی کە نوێژەکانیان بە ڕێك وپێکی بەرپا دەکەن و زەکات ئەدەن و بەردەوام ملکەچی فەرمانی خوان ).

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا باسی فەرمودەیەك دەکەن لە عەلیەوە کە نوێژی کردوە ولە ڕکوعدا بووە، جا هەژارێك هاتووە و داوای خێری لێکردوە، گوتراویشە: داوای زەکاتی لێکردوە، عەلیش دەستی درێژ کردوە و موستیلەیەکی لە دەستدا بووە، هەژارەکە موستیلەکەی بردووە، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نازلکردە خوارەوە ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾ ئەوان ئەڵێن: کەس لە رکوعدا زەکاتی نەداوە جگە لە عەلی نەبێ بۆیە عەلی وەلیە و کەواتە ئەو خەلیفەیە.

بەرپەرچ دانەوەی ئەمە لە چەند ڕویەکەوە:

**یەکەم:** ئەم چیرۆکە سەنەدێکی صەحیحی نییە و لە عەلیەوە ﷺ ئیسپات نەبووە کە موستیلەیەکی بەخشیبێ لە ڕکوعدا، ئەوان دەیانەوێ مەدحی عەلی ﷺ بکەن بەڵام نازانن زەمی دەکەن، ئەگەر چی عەلی ﷺ پێویستی بە مەدحێك نییە کە سابت نەبووە، ئەوەی بۆ بەسە کە خوای گەورە و پەیامبەری خوا ﷺ مەدحی کردوون، خوای پاك و بێ پەڵە دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١

ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴾ {المؤمنون١-٢}. واتـە: (بەڕاسـتی بـڕواداران سـەرکەوتوو و سەرفراز بوون، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا خاشع و گەردن کەچن بۆ خوا).

هەروەها پەیامبەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: (بـە ڕاسـتی لـە نوێـژدا مـرۆڤ مەشغەڵەتی هەیە)[1].

ئەی چۆن ڕازی ببین بۆ یەکێکی وەك عەلی کە لە گەورە و ئیمامی خاشعانە لە کاتی نوێژکردندا خێر بکات، ئەی نەیدەتوانی چـاوەڕێ بکـات تـا نوێژەکـەی تەواو بکات؟ بێگومان دەیتوانی ئەوە بکات، دوای ئەوەش ئەبێ مرۆڤ هەرچەندی لە توانادایە هەوڵ بدات لە نوێژدا خاشع و گەردن کەچ بێت بۆ خـوا و شـتانێکی ئاوها دوا بخات بۆ دوای نوێژ.

دووەم: ئەصل لە زەکاتدا ئەوەیە کە کابرای زەکاتدەر دەستپێشخەری بکـات بۆ دەرکردنی زەکاتی ماڵەکەی، نەك ئەوەی چاوەڕێ بکات تـا داواکـەر دێ، جـا کامەیان باشترە ئەوەی کە کابرا پەلە بکات لە زەکاتدانەکە، یان لە مـاڵی خـۆی دابنیشێت و چاوەڕێ بکات بزانێ کەی لە دەرگای دەدرێ ئـەو کاتـە زەکاتەکـەی بدات؟ بێگومان یەکەمیان باشترە.

سێیەم: عەلی ﷺ لەسەردەمی پەیامبەری خـوادا ﷺ پیـاوێکی هـەژار و نەدار بووە، ئەوەتا دەبینی مارەییەکەی فاتیمە -ڕەزای خـوای لـێبێ-، بـەهۆی نەداریوە مارەییەکەی پارە نەبووە ، بـەڵکو بـریتی بـووە لـە تـەنها قـەڵغانێك،

---

(١) واتە: مرۆڤ مەشغول وسەرقاڵی زیکر و دوعا و قورئان خوێندن و تەسبیحات و موناجاتی خوایە، مەشغەڵەتێك کە لە هەموو کارێکی دەکاتەوە و دەیبڕێت.

پیاوێکی زۆر کەم دەست بووە، جا پیاوێکی وەك عەلی ﵁ ئەسڵەن زەکاتی لەسەر واجب نابێت بەڵکو لەسەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ زەکاتی هەر لەسەر واجب نەبووە.

**چوارەم:** ئەم ئایەتە مەدحی تێدا نییە بۆ زەکاتدان لە کاتی ڕکوعدا، وەگەرنا ئەگەر وابوایە ئەوا هەرکەسێك لە ڕکوعدا زەکاتی بدایە مەدح دەکرا و دەبووە سونەتێکیش، چونکە خوای گەورە ستایشی کەسێك دەکات زەکات دەدا ولە ڕکوعدایە بۆیە لە کاتی زەکاتداننداا ئەم کارە دەبووە سوننەتێك، جا کەسیش شتی وای نەوتووە.

**پێنجەم:** خوای گەورە باسی (إقامة الصلاة)[1] دەکات، نەك (أداء الصلاة)[2]، چونکە ئیقامەی نوێژ هەروەك ئیبن عەبباس دەڵێ: (بەو شێوەیە

---

(١) واتە: (بەرپا کردنی نوێژ) (جوان بە جێهێنانی) (بە ڕێك و پێکی بەجێهێنانی). (وەرگێڕ)

(٢) بەڵام ئەمەیان واتە: کردنی نوێژ. ئەمەش دوو واتای دوور لە یەکن و جیاوازن، خوای گەورە جل جلالە کاتێك فەرمان دەکات بە نوێژ لە هەر هەموو قورئاندا ووشەی اقامە (بەرپاکردن و بەرێکی بەجێهێنان) بەکار دێنێ تەنانەت لە تەنها شوێنێکیشدا وشەی (أداء) بەکار نەهێناوە بۆ نوێژکردن، چونکە نوێژ بۆ ئامانجێك فەرز کراوە لە (ئەداء) دا بەدەست نایە بەڵکو لە بەجێ هێناندا بە دەست دێ، هەر چۆن لاشەی بێ ڕۆح بێ سودە بەهەمان شێوە نوێژی بێ خشوع بێ سودە، جا نوێژێك مرۆڤ دەگۆڕێ کە خشوعی تێدا بێت و لە واتای وشەکان بگا و ملکەچی خوا بێ تیایدا، ئەی نابینی لە ڕۆژانی هەینی و ڕۆژانی تریش مزگەوتەکان جمەی دێ لە نوێژکەران، بەڵام حاڵمان هەر وەك خۆیەتی، ڕەوشتی خۆمان، ماڵمان، منداڵمان، بازاڕمان، ئاکار و کردار و ڕەفتارمان، دەزانێ ئەو خەڵکە نوێژ بە خشوعەوە ئەکەن یان نا، لە تەراویحی ئەم ساڵدا دوای سەلامدانەوەی نوێژ پیاوێك دەمی هێنایە نزیك گوێمەوە و پێی وتم -کە ئەو خەڵکە زۆرەی بینی: ماشاء الله ئەم هەموو خەڵکە نوێژ دەکات بەس بۆ لە کڕین و فرۆشتندا قۆڵ پیاو ئەبڕن، منیش وتم: خالۆ گیان ئەم خەڵکە هێشتا لە کڕین و فرۆشتندان، نەهاتوون بۆ مزگەوت، ئەوەی کە ئەیبینی لاشەیانە نەك ڕوح

ئەنجامی بدەی کە پەیامبەری خوا ﷺ بەجێی هێناوە)، یانی: بە تەواوی لە خاوێنیدا، لە بە جێهێناندا، لە کڕنوشدا، لە سوژدەدا، لە خشوعدا، لە ویردەکاندا، لە قورئان خوێندندا، ئا ئەمەیە ئیقامەی نوێژ (اقامة الصلاة).

کەواتە هۆکاری باسکردنی ڕکوع چییە لە دوای باسکردنی ئیقامەی نوێژ؟

بێگومان مەبەست پێی ڕکوعێکی ترە.

مەبەست ملکەچییە بۆ خوای بەرز و پیرۆز.

هەروەك پەروەردگاری بەرز و مەزن لە بارەی داوودەوە -علیه السلام- دەفەرموێ: ﴿وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ {ص: ٢٤}. واتە: (داوود زانی کە تەنها ئێمە تاقیمان کردۆتەوە بۆیە داوای لێبوردنی کرد لە پەروەردگاری کەوت بە ڕوودا بە سوژدەی بردنەوە و تۆبەی کرد).

---

و دڵیان، هێشتا لە مزگەوتەکەش بیریان لای مامەڵە و ئەم لاو ئەولایە.. «الا ما رحم ربي نسأل الله العافیة» بەڵکو تەنانەت خەڵکانێك باسێکیان بۆ گێڕامەوە کە کابرا دەناسن، ڕۆیشتووە= =بەغداد لە مزگەوت نوێژی کردووە، عەگاڵ بەسەرێکیش هاتووە و نوێژی کردووە، گوێی لە کابرای عەگاڵ بەسەر دەبێ ئەڵێ: الحمد لله رب العالمين...، ئەمیش بەخۆی ئەڵێ: ئەمرە ئەزانی ئەمیش نوێژ وە کوردیەوە ئەکا. ئەم کابرایە ڕیش سپی بووە چەند ساڵە وای زانیووە الحمد لله...کوردییە نەك عەرەبی. هەروەها پیاوێك هەبووە لە ئاوایی (خۆم پیاوەکە دەناسم و خزمی خۆمە ئێستا وەفاتی کردووە و خوا لێی خۆش بێ)، کاتێك نوێژی کردووە عادەتی وا بووە هەندێك دوعای کردووە بە عەرەبی، بۆیە خەڵکەکە پێیان ئەووت: فلان کەس نوێژ بە عەربیەوە ئەکا. (وایان زانیووە نوێژ کوردیە). دەی کەسێك لە واتاکان نەگات چۆن بگۆڕێت، داواکارم لە خوای گەورە هەموومان بگێڕێتەوە بۆ سەر ئەو ڕاستە شەقامەی ئەو پێی ڕازیە. آمین (وەرگێڕ)

کەچی خۆی داود چووە سوژدە، بەڵام ناوی ( ڕکوعی) لێنا وەك ئاماژەیەك بۆ ملکەچی و زەلیلی لە بۆ پەروەردگار.

هەروەها خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ﴾ {المرسلات ٤٨}. واتە: (و ئەگەر پێیان بگوترێ کڕنوش بەرن و ملکەچ بن، کڕنوش نابەن و ملکەچ نابن). ئەمەش یانی: ملکەچ بن و تەسلیمی فەرمانی خوای بەرز و مەزن بن.

هەروەها لە بارەی مەریەمیشەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ {آل عمران: ٤٣}. واتە: (ئەی مەریەم فەرمانبەری پەروەردگارت بکە و شوژدە و کڕنوش بەرە لەگەڵ ئەوانەی کە کڕنووش دەبەن)، یانی: ئەی مەریەم ملکەچ و خاشع بە بۆ فەرمانی خوا جل جلالە، جا مەریەم لێبڕابوو بۆ خواپەرستی و لەو کەسانەیە کە نوێژی جەماعەتی لەسەر واجب نییە. جا مەبەستی خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەوە نییە کە باشتر وایە مرۆڤ لە کاتی کڕنوشدا زەکات بدات.

شەشەم: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە، ئەوەیە، کە کاتێك بەنی قەینوقاع پەیمانەکەی نێوان خۆیان و پەیامبەری خوایان ﷺ شکاند، ڕۆیشتن بۆلای عوبادەی کوڕی صامت و ویستیان بیخەن لەگەڵ خۆیاندا، بەڵام ئەو وێڵی کردن و دژایەتی کردن و دۆستایەتی خوا و پەیامبەری کرد ﷺ، ئەوەبوو خوای پەروەرگدار ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾[1] {المائدة: ٥٥}. یانی: حاڵیان ئەوەیە کە لەهەموو ئیش و کار و

(١) (تفسير الطبري) (٦/ ١٧٨).

بارێکیاندا ملکەچی خوای گەورەن، بۆیە دەبینی خوا ﷻ لە سەرەتای ئەو ئایەتانەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ {المائدة:٥١}. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەن دۆست و پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، جا ئەوەتان لەوان بکاتە دۆست و پشتیوان ئەوا بەڕاستی ئەویش لەوانە، بێگومان خوا ڕێنمووی گەلی ستەمکاران ناکات).

مەبەست پێی: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول، چونکە ئەو دۆست و پشتیوانی بەنی قەینوقاع بوو، کاتێکیش ناکۆکی کەوتە نێوانیان و پەیامبەری خواوە ﷺ، چوو پشتگیری کردن و دۆستایەتی بۆ دەربڕین و لەگەڵیاندا ڕاوەستا، تەنانەت چووەلای پەیامبەری خوا ﷺ تکایان بۆ بکات، بەڵام عوبادەی کوڕی صامت تەبەڕای لێکردن، بۆیە خوای بەرز و مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾، ئیتر خوای گەورە دوا بەدوای ئەوە باسی سیفاتی ئیمانداران دەکات کە عوبادەی کوڕی صامت و شوێنکەوتوانێتی ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾. جا ئەم ئایەتە لەسەر عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دابەزی.

حەوتەم: بێگومان هەموو کەسێك دەتوانێ شتی وا بڵێت. بۆ نمونە خۆشەویستانی موعاویە دەڵێن لەسەر موعاویە دابەزیوە و پاشان حەدیسێکی هەڵبەستراوی بۆ دێنن، هەروەکو غەیرە ئەوان هەستاون بە هێنانی فەرموودەیەکی هەڵبەستراو لەسەر عەلی. بە هەمان شێوە خۆشەویستانی عوسمانیش هەڵدەستن و ئەڵێن: لەسەر عوسمان دابەزیوە و پاشان فەرموودەیەکی هەڵبەستراوی بۆ دێنن.

**هەشتەم:** گریمان لەسەر عەلی ﷺ دابەزیوە، خۆ هیچ واتایەکی تێدا نییە بۆ ئەوەی کە خەلیفەی پەیامبەر بێ ﷺ، بەڵکو تەنیا ئەوەی تێدا دەخوێنینەوە کە پێویستە عەلی کوڕی ئەبو تالبمان خۆش بوێت، ئەی خۆ ئێمە خۆشیمان دەوێ -ڕەزای خوای لێبێ و ڕازی کا-.

**نۆیەم:** ئایەتەکە بە بێژە (لفظ)ی کۆ هاتووە، عەلیش تەنیا کەسێکە، ئێمە ئەگەرچی ئەڵێین دەکرێت بێژەی کۆ لە بۆ تاك بەکار بهێنرێ، بەڵام ئەسڵ ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو کۆ بوو مەبەست پێی کۆ بێ مەگەر بە شان (قرینة)یەك نەبێت لەو ئەسڵەی لایبدات، لێرەشدا هیچ شانێکمان نییە.

**دەیەم:** ئەڵێن ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾ بۆ کورت هەڵهێنان (حصر)ـە، [چونکە ئامرازی (إنّما)ی پێوەیە، کە بۆ حصر و کورت هەڵهێنانە] کەوابوو خیلافەتی ئەوانەی پێشو بەتاڵ دەکاتەوە کە مەبەستیان ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانە، ئێمە پێشتر ئەوەمان پوچەڵکردەوە کە ئەمە لە بارەی عەلیەوە ادابەزی بێ، پاشان ئەگەر گریمان کرد کە ئەڵێت (إنما) بۆ حەصرە و خیلافەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان پوچەڵ دەکاتەوە، ئەوا بەهەمان شێوە -ئەگەر بۆ حەصر بێت- خیلافەتی حەسەن و حوسەین و عەلی کوڕی حوسەین و موحەممەدی باقر و جەعفەر و ئەوانی تریش پوچەڵ دەکاتەوە ! ! [ئەمەش شتێکە ئەوان لەسەرەوە تا پێ ڕەفزی دەکەنەوە بەڵام بەبێ وەڵامێکی عەقڵی ئاراستەکراو].

**یازدەیەم:** هەرگیز خوای پاك و بێ گەرد بەوە وەسف ناکرێت کە ئەمیرە بەسەر بەندەکانیەوە و پێشەوایانە، بەڵکو خوا جل جلالە دروستکەر و ڕۆزی دەر و پەروەرگارو پادشایانە، دەی کەوای لێهات واتای ئایەتەکە چی لێ دێ؟!

بە هەمان شێوە لە بارەی پەیامبەری خواوە ﷺ شتی وا ناوترێ، ئەسڵەن ئەو لەوە گەورە ترە شتی وای لە بارەوە بگوترێ.

*** 

# باسی چوارەم

## فەرمودەی مەنزیلە

پەیامبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ غـەزای (تـەبوك ) و ئیزنـی کەسـی نـەدا لەگەڵی نەڕوا، کەسیش لە مەدینە نەمایەوە جگە لەم شەش کۆمەڵەیە نەبێت :

کۆمەڵەی یەکەم: ئەوانەی پەیامبەری خواﷺفەرمانی پێکردن بە مانەوە.

کۆمەڵەی دووەم: عوزرداره‌کان، لە نەخۆش و پیر و پەککەوتە و کەم ئەندام و کوێرو هەژار و هاوشێوەکانیان.

کۆمەڵەی سێیەم: ئافرەتان.

کۆمەڵەی چوارەم: منداڵان.

کۆمەڵەی پێـنجەم: بەجێماوە سەرپێچی کەرەکان، ئەوانـەی کـە سەرپێچـی فەرمانی پەیامبەری خوایانﷺکرد و مانەوە، کە بریتی بوون لە: کەعبی کـوڕی مالك و موراڕەی کوڕی ڕەبیع و هیلالی کوڕی ئومەییە و لەگەڵ حەوتی تردا.

کۆمەڵەی شـەشەم: دەغەڵەکان (مونافیقەکان).

تەنها ئەم شەش کۆمەڵەیە، جا عەلی ﵁ لە کۆمەڵەی یەکەمە لەوانەی کە پەیامبەری خوا ﷺ خۆی فەرمانی پێکردن بە دانیشتن و مانەوە لـە مەدینـەدا، بەڵام دەغەڵەکان دەستیان کردە قسەکردن و وتیان: کە بە عـەلی ووتوویـەتی لـە

مەدینە بمێنەوە حەتمەن ڕقی لە عەلی بووە[١]، ئەم قسەیە گەیشتە عەلی ﷺ، ئەوەبوو کەوتە شوێن پەیامبەری خوا ﷺ و لە ڕیوایەتێکی تردا: بەدەم گریانەوە[٢] هاتو و وتی: ئەی پەیامبەری خوا لە نێو ژن و منالّ بەجێم دێڵی ؟!

پەیامبەری خواش ﷺ دڵی خۆش کرد و فەرمووی: ( بۆ ڕازی نابیت تۆ بۆ من وەك هارون بیت بۆ موسا؟ بەڵام ئەوندە هەیە پەیامبەر دوای من نییە )[٣].

ئەڵێن:کە دەفەرموێ: (بۆ ڕازی نابیت، تۆ بۆ من وەك هارون بیت بۆ موسا) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عەلی خەلیفەیەی دوای پەیامبەرە ﷺ، چونکە دوای ئەوەی موسا دەرچوو بۆ لیقای پەروەردگاری هارون بوو بە جێنشین، کەواتە عەلی جێنشینی دوای پەیامبەری خوایە ﷺ.

ئەمەش قسەیەکی ناڕاستە لە چەند ڕویەکەوە:

یەکەم: هارون جێی موسای نەگرتۆتەوە، بەڵکو مەشهورە کە هارون -علیه السلام- ساڵێك پێش موسا وەفاتی کردوە[٤].

دووەم: کاتێك موسا ڕۆیشت بۆ لیقای پەروەردگاری، هارون لە شاردا مایەوە، سەرباز و سوپاشی هەموو لە لا بوو، موسا خۆی لەگەڵ هەندێ پیاودا

---

(١) (مختصر تاريخ ابن عساكر) (١٧/٣٤٧).

(٢) (مختصر تاريخ ابن عساكر) (١٧/٣٤٥).

(٣) (صحيح البخاري )، كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب علي حديث (٣٧٠٦). (صحيح مسلم)، كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل علي حديث (٢٤٠٤). دون أن تذكر تفاصيل القصة عندهما.

(٤) (تاريخ الطبري) (١/٣٠٤). (البداية والنهاية) (١/٢٩٧).

چوو بۆ لیقای پەروەردگاری، بەڵام عەلی لە مەدینـەدا كەسـی لەگـەڵ نەمایـەوە جگە لە سەرپێچی كەران و ئەوانەی خودی پەیامبەری خـوا ﷺخـۆی فـەرمانی پێكردن بە مانەوە، كەوابوو دوو حاڵەتی جیاوازە.

سێیەم: پەیامبەری خوا ﷺ تەنها دڵی عەلی ﷺ داوەتەوە وخۆش كردووە، چونكە عەلی هـاتووە سـكاڵا دەكـا، جـا ئەگـەر عـەلی ﷺ نەهاتایـە بـۆلای پیغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەویش ئـەو قسـەیەی نـەدەكرد، بـۆی ڕونكـردەوە كـە مەسەلەكە وا نییە، تۆ نابەم لەبەر ئەوە نییە حـەزت لێنەكـەم، ئـەزانی كاتێـك موسـا چـوو بـۆ لیقـای پـەروەردگاری هـارونی لـە جێـی خـۆی دانـا و هـیچ عەیبەیەكیشی بۆ هارون تیا نەبوو، تۆش بەهەمان شێوە كە دەرچووم و لـەجێی خۆم دامناوی هیچ عەیب و عارێكی تێدا نییە بۆت.

لەوانەیە ئەگەر غەیرە عەلیش ئەوەی پـێ بگوترایـە كـە بـە عـەلی گـوترا ئەویش ئەو سكاڵایەی بكردایە كە عەلی كـردی دوور نـەبوو پەیامبـەری خـوا ﷺهەمان قسەی بۆ ئەویش بكردایە، تەنها عەلیش ئەم سكاڵایەی كرد و غەیرە وی نەیكرد، چونكە پەیامبەری خواﷺ باقی والیەكانی تری لە لای ژن و منداڵ بە تەنها بەجێ نەدەهێشتن بەڵكو دەیكردن بە جێنشین بەسەر پیاوانیشەوە، ئینجا عادەتی وا نەبووە هەموو سوپاكە دەربكات.

عـەلی ﷺ كـە ئـەم كـارەی بـینی هەسـتی كـرد عەیبەیـە بـۆی، كـە دەغەڵەكانیش ئەو قسانەیانە كرد، كەوتە دوای پەیامبەرﷺ و پرسیاری ئـەم بـە جێ هێشتنەی لێكرد ئەویش بۆی ڕوونكردەوە كـە ئەمـە بـەهۆی ڕق لێبوونـەوە نەبووە، وا نییە كـە ئـەو موونافیقانـە ئـەیلێن، هـەروەكو چـۆن موسـا هـارونی بەجێهێشت منیش تۆ لە نێو خاوخێزانمدا بەجێ دەێڵم.

**چوارەم:** لەم غەزایەدا پەیامبەری خوا ﷺ عەلی وەکو خەلیفە بەجێ نەهێشت بەسەر گشت مەدینەوە، بەڵکو بەتایبەتی بەسەر خانەوادەکەی خۆیەوە بەجێی هێشت، هەروەك مێژونوسان باسیان کردوە وەك ئیبن جەری[(١)] وئیبن کەسی[(٢)].. وهتر، کەوا والی سەر مەدینە لەو غەزایەدا موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بووە نەك عەلی کوڕی ئەبو تالب.

**پێنجەم:** ئاخر چۆن دەکرێ ئەم هێشتنەوەی عەلیە ﷺ بە مەنقەبە و ڕێزداری تێبگەین، کە هەرکاتێك پەیامبەری خوا ﷺ لە شار دەربچێ ئەوا عەلی ﷺ خەلیفەیتی، کەچی دەبینین عەلی بە گریانەوە دەکەوێتە دوای پەیامبەری خوا ﷺ؟ ئێمە لەم واتایە تێگەیشتین بەلام عەلی ﷺ تێنەگەیشت، ئەگەر بە جێهێشتنی عەلی خۆی بۆ خۆی مەنقەبە بوایە ئەوا عەلی نەدەکەوتە دوای پەیامبەر ﷺ و ئەیزانی کە هەرکات پەیامبەری خوا ﷺ دەرچوو ئەم خلیفەی ئەوە.

**شەشەم:** پەیامبەری خوا ﷺ دوای عەلی خەڵکی تری بەجێ هێشتووە وکردویەتی بە والی، ئەوەتا دوای غەزای تەبوك کە پەیامبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ حەجی ماڵئاوایی عەلی هەر لە یەمەن بوو لە مەدینە نەمایەوە.

سەبارەت بەوەی پەیامبەر ﷺ عەلی چواندە بە هارون !

---

(١) (تاریخ الطبري) (٢/٣٦٨). بەڵام ئەم ئەڵێ والی سەر مەدینە سیباعی کوڕی عەرفەتە بووە.

(٢) (البدایة والنهایة) (٧/٥).

ئەڵێین: پەیامبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر و عومەری شوبهاندوە بە لە هارون گەورەتر، لە غەزای (بەدر)دا کاتێك پرسی (دیلەکان) هاتە پێشەوە پەیامبەری خوا ﷺ هات پرسی بە ئەبوبەکر[1] کرد، ئەبوبەکر وای پێ باش بوو عەفو بکرێن وبریتی(فدیە) لە کەس و کاریان وەربگیرێت، بەڵام عومەر ﷺ وتی بکوژرێن باشترە، پەیامبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو:

(نمونەی تۆ وەکو نمونەی ئیبراهیم وایە کاتێك فەرمووی ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ {ابراهيم:٣٦}، واتە: (ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە زۆر لەو خەڵکەیان گومڕا کردووە، جا هەر کەسێ لە ڕۆڵەکانم شوێنم کەوت ئەوە بێگومان لە منە و هەرکامیان سەرپێچی کردم بێگومان هەر تۆ لێبوردەی میهرەبانی).

هەروەها نمونەی تۆ وەکو نمونەی عیسا وایە کاتێك فەرمووی: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ [المائدة: ١٨}، واتە: (ئەگەر سزایان بدەی ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن، ئەگەر لێشیان خۆش ببی بێگومان هەر تۆی بەدەسەڵاتی کار دروست).

پاشان ڕووی کردە عومەر و پێی فەرموو: (ئەی عومەر نمونەی تۆش وەکو نمونەی نوح وایە کاتێك فەرمووی: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ [نوح:٢٦}، واتە: (نوح فەرمووی: ئەی پەروەردگارا هیچ کەسێك لە بێ بڕوایان لەسەر زەوی مەهێڵە).

---

(١) مەسەلەی چواندنی ئەبوبەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێبێ لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ، فەرمودەیەکی زەعیفە، ئەمما ڕاوێژ پێکردنیان فەرمودەیەکی صەحیحە و لە بوخاری دا هاتووە. (وەرگێڕ)

هەروەها نمونەی تۆ وەکو نمونەی موسا وایە کاتێك فەرمووی: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾ {يونس ٨٨}[1].

واتە: (وموسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ لە ژیانی دونیایادا هۆکاری ڕازانەوە و ماڵ و سامانی زۆرت بەخشیە فیرعەون و کۆمەڵەکەی، بۆ ئەوەی خەڵك ڕێگای تۆ وێڵکەن، ئەی پەروەردگارا ماڵ و سامانیان لەناو بەرە و تەفر و توانای بکە ودڵەکانیان ڕەق و ڕەش بکە و ئیمان نەهێنن هەتا سزای سەخت و ئازاردەری تۆ دەبینن)..

ئەوەتا پەیامبەر ﷺ ئەبوبەکر دەشوبهێنێ بە ئیبراهیم و عیسا، عومەریش دەچوێنێ بە نوح و موسا، ئەمانەش لە پەیامبەرە (أولو العزم) (خۆڕاگرە نەبەز) ـەکانن و باشترین کەسن لە دوای پەیامبەری خوا ﷺ و پلەشیان لە هارون بەرزترە سەلات و سەلامی خوا لەسەر هەمویان بێت، جا بۆیە چواندنی عەلی بە هارون لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ باشتر یا گەورە تر نییە لە چواندنی ئەبوبەکر و عومەر لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ بە ئیبراهیم و عیسا و موسا و نوح -عليهم السلام-.

* * *

(١) أخرجه أحمد (١/٣٨٣) ورجاله ثقات الا أبا عبيدة بن عبدالله بن مسعود لم يسمع من أبيه.

# باسی پێنجەم

## ئایەتی «ذِوي القُربى»

ئەم ئایەتە بریتیە لەو فەرمایشتەی خوای بەرز و پیرۆز کە ئەفەرموێ:

﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ [الشورى:٢٣]. واتە: (ئەو بەخششە ئەوەیە کە خوا موژدە دەدات بە بەندەکانی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە، (ئەی موحەممەد پێیان) بڵێ: داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەر ئەم بانگەوازەم مەگەر خۆشویستنی خزمایەتی وە هەر کەس هەر چاکەیەك بکات بۆی زیاد دەکەین بە چەند بەرانبەر بەڕاستی خوا لێبوردەی سوپاسگوزارە).

دەڵێن: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی بە خەڵك کردووە بە خۆشویتنی خزم ونزیکەکانی، تەنانەت هەندێکیان ئیجماع لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە کەوا لەسەر ئالی موحەممەد دابەزیوە، ئەمەش ڕاست نییە.

فەرمودەکە بوخاری لە صحیحەکەید[1] دەریهێناوە لە ڕێگەی سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، ئەڵێ: پرسیار کرا لە ئیبن عەبباس لە بارەی ئەم فەرمایشتەی

(١) كتاب التفسير: سورة الشورى، باب المودة في القربى برقم (٤٨١٨).

پەروەردگارەوە: ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ﴾. منیش وتم -واتە سەعیدی کوڕی جوبەیر- یانی: (مەگەر خۆشویستنی خزمایەتی نەبێت)[١].

ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئاوڕی دایەوە[٢] و وتی: (پەلەت کرد، دەبەخوا تیرەیەك نییە لە قوڕەیش ئیلا موحەممەد بە خزمایەتی دەیانگاتێ).

پاشان فەرمووی: مەگەر ئەو پەیوەندیە خزمایەیتە بپارێزن کە لە نێوان من و ئێوەدا هەیە.

خوای پەروەردگار لەبارەی پەیامبەرەکەیەوەﷺ دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴾ {ص:٨٦}. واتە: ((ئەی موحەممەد) بڵێ: من لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم و من لەو کەسانەش نیم کە درۆ هەڵبەستم و زۆر لە خۆ بکەم ).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ﴾ {سبأ: ٤٧}. واتە: ئەی موحەممەد بڵێ: من هەر پاداشتێکم لێ داواکردوون ئەوە بۆ خۆتان بووە، پاداشتی من تەنها لەسەر خوایە و هەر خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە ).

---

(١) ذكر الأنطاكي في كتابه (لماذا اخترت مذهب الشيعة؟) هذا الحديث وبتره هنا، ونسب كلام سعيد الى ابن عباس ص ٨٤.

(٢) سەرنجی برای خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشم کەوا ئیبن عەبباس هاوەڵێکی پایەبەرزە دەریایەکە لە زانست، پەیامبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کردوە و دوعایشی گیرایە، کە خوای گەورە فێری تەفسیر و حیکمەتی بکات، بەراستی دوعاکەی گیرابوو، هەروەها ئیبن عەباس یەکێکە لە خزم و نزیکەکانی پەیامبەر ﷺ (کوڕی مامی پەیامبەرە)، کەچی ئەم خزمایەتیەش نەبووە ڕێگرێك لە بەردەمی لە تەفسیر کردنی ئایەتەکە بەشێوەیەکی ڕاست و صەواب، بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێکردووە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ {یوسف:١٠٤}. واتە: (و تۆ ئەی موحەممەد داوای هیچ جۆرە ئەجر و پاداشتێکیان لێ ناکەی لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانە، ئەو قورئانە پەند و ئامۆژگاریە بۆ جیهانیان).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا﴾ {الفرقان: ٥٧}. واتە: «ئەی موحەممەد بڵێ: من لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامە هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ، جگە لەوەی کە کەسێك پارە ومالّ ببەخشێت لە رێگای خوادا -ئەوەش هەر پاداشت نییە بۆ من چونکە لە بۆ خۆتانە و قازانجی خۆتانی تێدایە-».

قورئانیش هێندێکی هێندێکی تری بەڕاست دەخاتەوە و هەرگیز هێندێکی دژ بە هێندێکی تری نییە.

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾ {النساء:٨٢}. واتە: (خۆ ئەگەر لە لایەن جگە لە (الله)ەوە بوایە، ئەوا بێگومان جیاوازیەکی زۆریان تێدا دەبینی ).

کەواتە هەرگیز مومکین نییە خوای پایەبەرز لەم هەموو ئایەتانەدا باسی ئەوە بکات پەیامبەری خوا ﷺ داوای پاداشتی لێ نەکردوون وە بڕا پەیامبەرەکانیشی بەهەمان شێوە، کەچی دوای ئەم هەمووە ئایەتێ دێ و ئەڵێ: بەڵێ داوای پاداشتێکتان لێدەکات کە بریتیە لە خۆشویستنی خزمەکانی!!

پەیامبەری خوا ﷺ هەرگیز داوای پاداشت ناکات، ئیتر چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویێتی: ( من تەنها داوای تاکە پاداشتێکتان لێ دەکەم ئەویش ئەوەیە کە خزمەکانی منتان خۆش بوێت!! هەرگیز.

پەیامبەر ﷺ داوای پاداشت ناکات بەڵکو هەموو پەیامبەرانی تریش بە هیچ شێوەیەك داوای پاداشتیان لە گەلەکانی خۆیان نەکردوە.

ئەوە نوحە بە گەلەکەی خۆی ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ { الشعراء: ١٠٩ }[١].

هود بە گەلەکەی ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

صالح بەگەلەکەی ئەفەرموێ ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

لوط بە گەلەکەی ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

شوعەیب بەگەلەکەی فەرموی: ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

پەیامبەرمان ﷺ بەرێزترین و باشترینی پەیامبەرانە، بۆیە ئەو لە پێشترە لەوەی داوای پاداشت لە گەلەکەی خۆی نەکات، ئەمەش بە ڕاستخەرەوەی فەرمایشتی ﴿إلاّ المَودَّةَ فِي القُرْبى﴾.

وە واتای (إلاّ) لێرەدا یان (هەڵاوێرێکی پەیوەستە- استثناء المتصل)ـە، یان (هەڵاوێرێکی جیا - إستثناء المنقطع)ـە، یانی بە واتای (لكنّ) دێت، لێرەشدا

---

(١) واتە: (من داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەر ئەم بانگەوازە، پاداشتی من تەنها لەسەر پەروەردگاری جیهانیانە).

ئەمەیان ڕاستە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتانەی کە ئێستا باسمان کردن، ئەویش ئەوەیە کە پەیامبەری خوا ﷺ هەرگیز داوای پاداشت ناکا، ئا بەم شێوەیە واتای فەرمایشتەکەی خوا -سبحانە-: ﴿إلاّ المَوَدَّةَ فِيَ القُرْبَى﴾ دەبێتە: بەلاّم لەگەڵما چاك بن بە هۆی ئەو خزمایەتیەی بەینمانەوە، من خزم و نزیکی ئێوەم، لێم گەڕێن با بانگەوازی خۆم بکەم، لە پەیامبەریشەوە ﷺ سابت بووە کە داوای لە قوڕەیش کردوە وازی لیّ بێنن بەڵکو بانەگەوازەکەی بکا، ئەگەر سەرکەوت ئەوا ئەوانیش لەگەڵیان، خۆ ئەگەر کوژرا ئەوان لە خوێنی ڕزگاریان دەبێت.

هەروەك دیارە پەیامبەری خوا ﷺ هەرگیز داوای پاداشتی نەکردووە لە بۆ خزمان ونزیکانی.

هەروەها ئەگەر ئایەتەکە مەبەستی پاداشت بوایە لە بۆ خزمانی وی ئەوا ئەیفەرموو: (لِذِ القُرْبَى) یان (لِذَوِي القُرْبى )، بەلاّم بلێت (في القُرْبى) ئەوا صەح نییە، بەلگەی ئەمەش ئەو ئایەتە وا خوای پابەرز باسی (خُمس) دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ [الانفال:٤١] ، واتە: (و بزانن بێگومان هەر چیەکتان لە غەنیمەت دەستکەوت، ئەوا پێنجیەکی بۆ خوا و بۆ پەیامبەر و بۆ خزمانی پەیامبەر ﷺ و هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانە -چوار بەشەکەی تریشی بۆ تێکۆشەرانە کە لەو غەزایەدا بەشداریان کردوە- ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خوا و بەوەی ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەر بەندەمان لە ڕۆژی جیاکردنەوەدا (جەنگی بەدر) ئەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵەکە بەرەنگاری یەك بوون وە خوا

بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە). دەبینی نەیفەرمووە: (فِي القُرْبَى) بەڵکو فەرموویەتی: (وَلِذِي القُرْبَى).

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیـە: ئـەڵێ: (هـەموو ئـەو ئامۆژگاریانـەی کـە لـە قورئاندا هاتووە چ لە بارەی مافی خزمانی پەیامبەرەوە بێﷺ، چ لە بارەی مـافی خزمانی خەڵکی ترەوە بێ، لە هەر هەموویدا ﴿ذَوِي القُرْبَى﴾ی بۆ بـەکار هـاتووە لە هیچ کامێکیاندا نەوتراوە (فِي القُرْبَى»[1].

هەروەها دەڵێین: شیاو نییە بۆ شانی پەیامبەرایەتی داوای پاداشت بکرێ کە ئەویش بریتی بێت لە خۆشویستنی خزمەکانی، ئەمە لە سیفاتی دونیا ویستانە. بەڕاستی ئەم گوتەیە تۆمەتبارکردنی پەیامبەری خوایەﷺ.

سەرباری هەموو ئەمانە، ئەم ئایەتە لە سورەتی(شوری) دایە، کە مەککیە، ئەی خۆ حەسەن و حەسەین جارێ ئەسڵەن هـەر دروسـت نـەکراون، عـەلیش رضي الله عنه هێشتا فاتیمەی نەهێناوە، ڕەزای خوا لە هەمویان بێت.

[سەرباری ئەو هەمووە، گریمان وایە و ئەفەرموێ: بەس ئەوەم لێتان دەوێـت نزیکەکانی منتان خۆش بـوێ، ئـەی هـیچ بەڵگەیـەکی تێـدا نیـە کـەوا ئـەوان خەلیفەی دوای پەیامبەرن و خیلافەتی غـەیرە ئـەوان بەتاڵـە، هـەر وەك ئـەوان باوەڕیان پێیەتی بە پشت بەستن بەم ئایەتانە و هاوشێوەکانی].

* * *

---

(١) (منهاج السنه) (١٠١/٧).

# باسی شەشەم

## فەرمودەی سەقەلەین

فەرمودەی: «تَرَكْتُ فِيكُم مَا إنْ تَمَسكْتُمْ بِهِ، لَنْ تَضِلّوا بَعْدِي أَبَداً كِتَابُ الله وعِتْرَتِي»[١]. واتە: (ئەوەم لە نێوانتاندا بە جێ هێشتووە کە ئەگەر دەستی پێوە بگرن، دوای من هەرگیز گومڕا نابن، ئەوەش کیتابەکەی خوا و خزمە نزیکەکانمە)

ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستە ئیمانداران دەست بگرنە عیترەی[٢] پەیامبەری خواوە ﷺ، ئینجا ئەڵێن: ئەگەر هاتوو پێویست بوو دەست بگیرێت بەوانەوە، ئەوا ئەوان دەبێ ببنە کاربەدەست لە دوای پەیامبەری خوا ﷺ و هەر ئەوان دەبێت ببنە خەلیفەی پەیامبەر ﷺ.

ئەمەش بە هەمان شێوە لە چەند ڕویەکەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە:

**ڕوانگەی یەکەم:** فەرمودەکە لە بارەی صیحەت و جێگیر بوونیەوە لە پەیامبەر ﷺ قسەی لەسەرە، ئەوەی کە لە موسلمدا فەرمان کردنە بە دەستگرتنە کیتابی خوا و ئامۆژگاری کردن دەرهەق بە ئەهلوبەیت هەروەك لە فەرمودەکەی

---

(١) رواه الترمذي: كتاب المناقب، باب مناقب أهل البيت، حديث (٣٧٨٦). وفيه زيدٌ الانماطي، وهو منكر الحديث، والحديث له أكثر من طريق مع اختلاف ألفاظه، ولا تخلو جميعها عن ضعف. [ولكن صححه الالباني].

(٢) ئیبن الأثیر: ئەڵێ :(عِتْرة الرجل: أخَصُّ أقَارِبه. وعِتْرةُ النبي ﷺ: بَنُو عَبْد المُطَّلب. وقيل: أهلُ بيتِه الأقْرَبُون وهم أوْلادُه وعليٌّ وأوْلادُه. وقيل: عِتْرته الأقْربُون والأبْعدُون منهم). انظر النهاية في غريب الحديث. (وەرگێڕ).

زەیدی کوڕی ئەرقەم لە صحیحی مسلم دا پێشتر باسمان لێوەکرد، وەسیەتی کرد بە قورئان و ئینجا هانی خەڵکیدا لەسەر دەستگرتن بە قورئانەوە، پاشان فەرمووی: (وە ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم، خواتان بەیاد دێنمەوە لە ئاست ئەهلو بەیتەکەم [(١)].

کەواتە ئەوەی فەرمان کراوە بە دەست پێوەگرتنی قورئان بووە، ئەمما ئەهلوبەیتی پەیامبەرﷺ فەرمانی کردوە بەوەی ڕێزیان لێ بگیرێ و ئەو مافانەیان پێ بدرێ کە خوای گەورە پێی بەخشیون.

هەروەها لە فەرمودەکەی جابریش سابت بووە کە پەیامبەری خواﷺ، کە لە حەجی ماڵئاوایی ووتاری داوە، فەرموویەتی: ( بەڕاستی لە نێوانتاندا شتێکم بەجێ هێشتووە کە ئەگەر دەستی پێوە بگرن گومڕا نابن ئەویش قورئانە[(٢)].

جا ئەوە قورئانە کە ئەگەر مرۆڤ دەستی پێوە بگرێ هەرگیز گومڕا نابێت و باسی ئوهلوبەیتیشی نەکردوە.

**ڕوانگەی دووەم:** عیترەکانی پەیامبەرﷺ کێن؟ عیترەی کەسێك بریتیە لە خانەوادەکەی (ئەهل و بەیتەکەی )، عیترەی پەیامبەریشﷺ بریتیە لە هەموو ئەوانەی کە زەکاتیان لەسەر قەدەغە کراوە، ئەوانەش بریتین لە: نەوەکانی هاشم، وتراویشە: نەوەکانی عەبدولموتەلیبی کوڕی مەنافیش دەگرێتەوە.

با ئێستا تەماشایەك بکەین بزانین کێ لە پێشترە بەدەستگرتن بەوانەوە؟

---

(١) صحيح مسلم: كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل علي، (٢٤٠٨).

(٢) (صحيح مسلم): كتاب الحج، باب حجة النبي، حديث (١٢١٨)

## سوننه یان شیعه؟

شیعه ئەسڵەن ڕچه و سەنەدیان بۆ پەیامبەری خوا ﷺ نییـه، خۆشـیان دان بەمەدا دەنێن که له گێڕانەوەی کتێب و ریوایەتەکانیاندا سەنەدیان نییـه، تـەنها چەند کتێبێك بووه بینیویانەتەوه، ئیتر وتویانه: لێوەی ڕیوایـەت بکـەن هـەموی ڕاستن[1].

سـەبارەت بـه سـەنەدەکانیان: هـەروەکو (حورڕلحـاملی) و هـی تـریش لـه پێشەوایانی شیعه وتویانه ئەسڵەن لەلای شیعه سەنەد هەر نییه و پشتیشـی پـێ نابەستن[2].

کەوابوو ئیتر بۆچی ئەوانەی که لـه کتێبـەکانی خۆیانـدا ڕیوایـەتی دەکـەن ئەڵێن ئەمه له عیترەی پەیامبەرەوەﷺ سـابت بـووه [کـه سـەنەد نـەبوو بـه چ ئیسـپات بـوو]؟ بێگومـان ئێمـه شـوێنکەوتووی ڕاسـتەقینەی عـیترەی پەیامبەرین ﷺ، که مافەکانیان دەدەین، نـه دەخەینـه سـەری و نـه لێـی کـەم

---

(١) کولەینی ڕیوایەت دەکا له موحەممەدی کوڕی حوسەینەوه که وتوویەتی: پرسیارم کرد لـه ئەبو جەعفەری دووەم (موحەممەدی جـەواد) وتم: قوربـان شـێخەکانمان لـه ئـەبو جەعفـەر و ئـەبو عەبدوڵلاوەڕیوایەتیان کردوه، جا لەو ڕۆژگارەدا (تەقیه) زۆر توند بووه، بۆیه ناچاربوون ئەو کتێبانه بشارنەوه، ئیتر لێیانەوه ڕیوایەت نەکراوه، بەڵام دوای مردنیان کتێبەکان گەیشتۆته دەسـت ئێمـه؟ فەرمووی: (لێوەی ڕیوایەت بکەن، ئەوه ڕاسته). (الكافي (١/٥٣).

ئەبو جەعفەری دووەم: موحەممـەدی کـوڕی عـەلی کـوڕی موسـای کـوڕی جەعفـەری کـوڕی موحەممەده، ئەوانەشی که هاتوون بۆ لای قوتابیەکانی بوون، ئیتر چۆن ئەو کتێبانه هەمو صەحیح و ڕاست دەرچوون له کاتێکدا سەنەدەکه پچڕاو (منقطع)ـه، بەو هەموو پچڕانه زۆرەشەوه.

(٢) بڕوانه: کتێبی (خاتمة الوسائل - الفائدة التاسعة) لەوێدا بەجوانی ڕونـی دەکاتـەوه کـەوا دوازده ئیمامی هیچ سەنەدێکیان نییه که لەسەر ئەساسی ئەوه ڕیوایەتەکان تەصحیح و [پاڵاوتـه] بکرێن، هەروەها مەسەلەی سەنەد شتێکی تازه داهێنراوه و بیدعەیه.

دەکەین، هەروەك پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لە گەورە ڕاگرتنمدا سنور مەبەزێنن وەك گاورەکان عیسایان لە سنوری خۆی زیاتر گەورە کردەوە، تەنها بلێن: بەندە و پەیامبەری خوا)[(١)].

**ڕوانگەی سێیەم:** ئیمام و زانای هەموو عیترەت عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷛، دوای ئەو زانای ئوممەت عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دێت، ئەو ئیبن عەباسەی کە ئیمامەتی ئەبوبەکر و عومەری دەخستە پێش عەلیەوە ﷛، تەنانەت لە خودی عەلیەوە ﷛ سابت بووە کە وتوویەتی: «أفضل الناس بعد رسول الله أبوبكر وعمر»[(٢)]. واتە:(باشترین کەس دوای پەیامبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر و عومەرە). تەنانەت لای شیعەکان لە عەلیەوە سابت بووە وتوویەتی: «أنا لكم وزير خير لكم مني أمير»[(٣)] واتە: (ئەمن وەزیرتان بم باشترە لەوەی ئەمیرتان بم).

**ڕوانگەی چوارەم:** ئەم فەرمودەیە هەر وەکو ئەو فەرمودەیەی پەیامبەری خوایە ﷺ، کە دەفەرموێت: «تركت فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا أبداً كتاب الله و سنتي»[(٤)]، واتە: (ئەوەم لە نێوانتاندا بە جێ هێشتووە کە ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن، ئەویش قورئان و سوننەتی منە). هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: «عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ مِنْ بَعْدِي

---

(١) البخاري: كتاب أحاديث الأنبياء، باب قول الله تعالى: ﴿واذكر في الكتاب مريم﴾، حديث(٣٤٤٥).

(٢) البخاري: كتاب فضائل الصحابة، باب قول النبي لو كنت متخذا خليلا، حديث (٣٦٧١).

(٣) (نهج البلاغة): (ص ٩٥ ـ خطبة ٩٢).

(٤) (مستدرك الحاكم)(٩٣/١).

عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ»[(١)]، واتە: (دەست بگرن بە سوننەتی من و جێنشینە سەر ڕاستەکانی دوای منەوە، بە کاکیلەکانتان ئەو سوننەتانە بگرن). ئەوەتا فەرمان دەکات بە گرتنی بە کاکیلەکان.

هەروەها دەفەرموێ: «اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ»[(٢)]، واتە: (شوێنی دوانەکەی پاش من بکەون ئەبوبەکر و عومەر).

هەروەها دەفەرموێ: «اهْتَدُوا بِهَدْيِ عَمَّارٍ وَتَمَسَّكُوا بِعَهْدِ ابْنِ مَسْعُودٍ»[(٣)]، جا هەرگیز ئەم فەرمایشتانە مانای ئیمامەتی لێوە نەفامراوە، ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوانە لەسەر ڕێنمویی پەیامبەرنﷺ، بۆیە ئێمەش ئەڵێین: هەرگیزا و هەرگیز عیترەی پەیامبەرﷺلەسەر گومڕایی کۆنابنەوە، بەڵام شوێنکەوتوانی عیترەتی پەیامبەرﷺکێن؟! ئەمەمان لەوە و پێش ڕوونکردەوە[(٤)].

* * *

---

(١) (رواه أبوداود: كتاب السنة، باب لزوم السنة، حديث (٤٦٠٧). (جامع الترمذي): كتاب العلم، باب ماجاء في الأخذ بالسنة، حديث (٢٦٧٦).

(٢) (رواه الترمذي: كتاب المناقب، باب مناقب أبي بكر وعمر، حديث (٣٦٦٢). ( سنن ابن ماجه): المقدمة، باب مباب فضائل أصحاب النبي ﷺ، حديث (٨٦).

(٣) (رواه الترمذي: كتاب المناقب، باب مناقب عبدالله بن مسعود، حديث (٣٨٠٥).

(٤) بڕوانە: ل ٤١٩ لە باسی (فەرمودەی پۆشاکەکە).

# باسی حەوتەم

## فەرمودەی:«عەلی لە منە و منیش لە عەلیم»

ئەڵێن: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «عَلِيٌّ مِنِّي وَ أَنَا مِنْ عَلِي وَلاَيُؤَدِّي عَنِّي إلاَّ أَنَا أَو عَلِي»[1]، واتە: (عەلی لە منە و منیش لە عەلیم، کەس لە باتیم پەیمان هەڵناوەشێنێتەوە[2] مەگەر خۆم یا عەلی). بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوای پەیامبەر ﷺ عەلی خەلیفەیە.

**وەڵام :**

ئەم فەرمودەیە تەوەرەکەی لەسەر ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیە [کە یەکێکە لە هەواڵخوانەکان]، ئەم پیاوە مودەلیسێکی[3] ناودارە، لە خەڵکانی لاوازەوە زۆر تەدلیس دەکات، خۆی ئەگەر بە ئاشکرا باسی لێوە بیستن بکا فەرمودەکەی صەحیحە بەڵکو لە بەرزترینی پلەکانی صەحیحە، قسە لەوەیە کە ئەگەر بە ئاشکرا باسی لێوە بیستن نەکا ئەوا ئەو کاتە فەرمودەکەی وەرناگیرێ.

---

(١) شطر الأول من الحديث أخرجه البخاري بلفظ: (أنت مني وأنا منك)، في كتاب الصلح، باب كيف يكتب هذا ما صالح فلان (٢٦٩٩). وأما زيادة: ( ولا يؤدي عني إلا أنا أو علي) أخرجها أحمد(٤/١٦٤). (تهذيب التهذيب) (٨/٦٦).

(٢) (عادەتی عەرەب وابووە، ئەگەر هاتوو پەیمان بەستنێك یان پوچەڵکردنەوەی یان صولحێك لە نێوانیاندا هەبوایە ئەوا ئەبوایە گەورەکەیان یان کەسێك لە خزمە نزیکەکانی بەو کارە هەستایە، جگە لەمانە کەسی تریان قبوڵ نەدەکرد، جا ئەو ساڵەی پەیامبەر ﷺ ئەبوبەکری کردە پێشەوا کە حەج بە خەڵکی بکا، وای بە باش زانی عەلیش بە دوایدا ڕەوانە بکا بۆ ئەوەی ئەو پەیمانەی کە لە نێوان خۆیان موشریکەکاندا هەبوو پوچەڵ کاتەوە و ئەو ئایەتەی سورەتی بەرائەیان بە سەردا بخوێنێتەوە: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾. هەربۆیە کاتێك گەیشت ئەبوبەکر پێی ووت: ئەمیری یان مەئمور وتی: نا، مەئمورم) ا.هـ بڕوانە شەرحی ئەم فەرمودەیە لە (تحفة الاحوذي). (وەرگێڕ)

(٣) بۆ زانینی پێناسەی مُدلس بڕوانە (ل٢٨) پەراوێزی ژمارە (١).

ئەبو ئیسحاقی جەوزەجانی دەڵێ: (کەسانێك هەبوون لە خەڵکی کوفە لەوانەی کە مەزهەبیان چاك نەبوو -یانی شیعە- لەگەڵ ئەوەشدا گەورەی موحەدیسەکانی کوفە بوون وەکو ئەبو ئیسحاق و ئەعمەش و مەنسور و زوبێد و هاودەمەکانی تریشیان، زانایان بە ڕاستگۆیان داناون لە فەرمودەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەستاون لەو ڕیوایەتانەیان کە تدلیسیان تێدا کردوە لە ترسی ئەوەی نەوەکو شوێنی لێدەرهێنراو صەحیح نەبێت، سەبارەت بە ئەبو ئیسحاق ئەو لە کەسانێکەوە ڕیوایەت دەکا کە نەناسراون و باسیان نەگەیشتۆتە زانایان جگە لەوەندە نەبێ کە ئەبوئیسحاق لێیانەوە ڕیوایەت دەکا)[1].

**سەرباری ئەوەش ئەڵێن:** عەلی لە پەیامبەرە و پەیامبەریش ﷺ لە عەلیە لە شوێنکەوتن و سەرخستندا، بۆیە کاتێك لە شەڕی (ئوحود)، جولەیبیب دیاری نەما، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: «جولەیبیب بدۆزنەوە» ، ئەوانیش وتیان: نەمان بینیووە، فەرمووی: (لە نێو کوژراوەکان بۆی بگەڕێن)، ئەوەبوو دۆزیانەوە، تەماشا دەکەن کەوتووە و حەوت لە بێ باوەڕەکانیش لەدەوری کەوتوون، هەواڵیان دا بە پەیامبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: (حەوتی لێ کوشتن پاشان کوشتیان، جولەیبیب لە منە و منیش لە ئەوم)[2].

هەروەها کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ باسی ئەشعەریەکانی کرد فەرمووی: (ئەوان لە منن و منیش لە ئەوانم)[3].

کە پەیامبەر ﷺ لەبارەی عەلیشەوە رضي الله عنه دەفەرموێ: (ئەو لە منە و منیش لە ئەوم)، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو خەلیفەیە دوای پەیامبەر ﷺ، بەڵکو ئەمە بۆ

---

(١) (تهذيب التهذيب) (٨/٦٦)
(٢) (صحيح مسلم): كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل جليبيب، حديث (٢٤٧٢).
(٣) (صحيح مسلم): كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل الأشعريين، حديث (٢٥٠٠).

زیادەڕۆییە لە ڕونکردنەوەی یەکێتی ڕێبازی پەیامبەر ﷺ و ڕێبازی عەلی، هەروەها بۆ پابەند بوونی عەلیە رضي الله عنه بە گوێڕایەڵی پەیامبەرەوە ﷺ.

هەروەها عەلی پەیوەندی خزمایەتی و ژن و ژنخوازیی و شوێنکەوتن و هەستان بە ئەنجامدانی مافەکانی خوا و سەرخستن و پشتگیری کردنی لەگەڵ پەیامبەر ﷺ هەیە، بۆیە ﷺ دەفەرموێت: (عەلی لە منەو منیش لە عەلیم).

❊ ❊ ❊

# باسی هەشتەم

## فەرمودەی «دوازدە ئیمامەکە»

زۆر جار فەرمودەی (دوازدە ئیمامەکە) دەکەنە بەڵگە، کە بە چەندین بێژە (لفظ) ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحەکە و غەیری ئەویشدا هاتووە:

- (دوازدە ئەمیر دێن هەر هەموویان لە قوڕەیشن)(١).

- (بەردەوام ئەم دینە بەهێزە بە درێژایی حوکمی دوازە خەلیفە هەرهەمویان لە قوڕەیشن)(٢).

- (بەردەوام ئەم دینە بەهێزە و نابەزێ بەدرێژایی [حوکمی] دوازدە پیاو)(٣).

- (بەردەوام ئەم دینە لەسەر پێیە و سەقامگیرە بە درێژایی ماوەی دوازدە خەلیفە کە حوکمتان دەکەن، هەرهەمویان هەموو ئوممەتیان لەسەر کۆ دەبێتەوە)(٤).

**ئەمانەی خوارەوەش ڕوونکردنەوەی ئەمەن:**

* لە فەرمودەکەدا هاتووە دین بە درێژایی ماوەی خیلافەتیان بەهێزە و پاشان ئەو بەهێزیە نامێنێ، دەی بەهێزیەکە کەیە و بێ هێزیەکە کەیە؟

---

(١) متفق عليه: (صحيح البخاري) كتاب الأحكام، باب الاستخلاف، حديث(٧٢٢٢). و(صحيح مسلم)، كتاب الامارة، باب الناس تبع لقريش، حديث (١٨٢١).

(٢) (صحيح مسلم)، كتاب الامارة، باب الناس تبع لقريش، حديث (١٨٢١).

(٣) (صحيح مسلم)، كتاب الامارة، باب الناس تبع لقريش، حديث (١٨٢١).

(٤) أبو داود (٤٢٧٩)، والطبراني في الكبير(١٨٤٩).

* شیعە ئەڵێ: لە خیلافەتی ئەوانەی پێشودا دین هەرگیز بەهێز نەبووە، بەڵکو هەمیشە ئیمامەکانیان خۆیان شاردۆتەوە و ترساون و کاریان بە (تەقیە) کردووە، تەنانەت پێیان وایە خیلافەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان زۆر خراپ بووە، تەنانەت عەلیش رضي الله عنه نەیتوانیوە دینە ڕاستەکە ئاشکرا بکات، ئەویش هەر کاری بە (تەقیە) کردووە، نەیتوانیوە قورئانە ڕاستەکە ئاشکرا بکات و نوێژی تەراویح مەنع بکات و زەواجی موتعە حەڵاڵ بکات.

* فەرمودەکە حەصری ژمارەی ئیمامەکان ناکات، تەنها هەواڵە کە دین لە ماوەی حوکمی ئەواندا بەهێزە.

* ویلایەتی مونتەزەر هەتا ڕۆژی قیامەتە، کەوابوو کەی بەهێز ئەبێ وکەی لاواز ئەبێ؟

* فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: (هەرهەمویان لە قوڕەیشن) دوورە کە مەبەست پێی عەلی و منداڵەکانی بێتۍ، تەنانەت خۆی ئەگەر بیشی فەرموویا: لە کوڕەکانی ئیسماعیلن، ئەوا شیعەش ڕاستەوخۆ دەیانووت کە ئیمامەکانیان لە نەوەکانی ئیسماعیلن.

* لە الصحیحدا هاتووە: (لە ئوممەتەکەمدا دوازدە مونافیق هەیە)[1] کەوابوو عیبرەت بە ژمارە نیە. قورئان باسی پەیامبەران و پەیامەکانیشیانی کردوە کەچی باسی ئیمامەکانی نەکردوە، لە کاتێکدا -لای ئەوان- ئیمامەکان

(١) أبو داود (٤٢٧٩)، والطبراني في الكبير (١٨٤٩).

باشتر و گرنگترن لە پەیامبەران [بۆ کەسێك زانیاری لەسـەر کتێبـەکانیان هـەبێ ئەم ڕاستیەی لا ڕوونە].

* بۆچی عەلی ﷛ بە ڕاوێژ ڕازی بوو، بۆچی حەسەن دەست بەردار بوو بـۆ موعاویە، بۆچی حوسەین بەیعەتی بە موعاویەدا، بۆچی هـەموو ئیمامـەکانیان بەیعەتیان بە خەلیفەکان داوە...؟

* چۆن دەکرێ عەلی دیاری کرابێ ودەقی لەسەر هاتبێ، کەچی ئەودەقانەی لە عەلیەوە ﷛ دەگێڕدرێنەوە پێچەوانەی ئەوەن، وەك لە (نهج البلاغة) هاتووە:

- (من ببمە وەزیرتان باشترە لەوەی ببمە ئەمیرتان)[1].

- کاتێك کە عەلی﷛ خیلافەتی گرتە دەست یەك دەقی نەهێنایەوە بەڵکو باسی ئەوەی کرد کە کردویانەتە کۆڵیەوە: (شورا تەنها بۆ موهاجیرین و ئەنسـارە کە لەسەر کەسێکیش کۆبونەوە و ناویان لێنا ئیمام، ئەوە خوا پێی ڕازیە)[2].

- بەییاضـی[3] ئەڵێ: (لە ڕاستیدا عەلی باسی دەقـی بـۆ هـاوەڵان نـەکرد) (الصراط المستقیم)

* کاتێك موحەممەدی کوڕی عەبـدوڵلای کـوڕی حەسـەن (الـنفس الزکیـة) ڕاپەڕی، صادق ڕێگەی دا بە موسا و عەبدوڵلای کوڕی بڕۆنە ڕیزیەوە[1].

(١) (نهج البلاغة)(ص ١٣٦).
(٢) (نهج البلاغة) (ص ٣٦٧).
(٣) یەکێکە لە زانایانی شیعە، خاوەنی کتێبی (الصراط المستقیم إلی مستحقي التقدیم). (و)
(١) (مقاتل الطالبیین) (٢٤٤).

* مەعقول نییە ئەو هەموو فەرموودانەی کە شیعە لە کتێبەکانی خۆیانـدا ڕیوایەتی دەکەن دەربارەی ئیمامەکانیان بە کۆمەڵ بێت یان بە تاك تـاك، دوایـی ئەم هەمووە ئەو ڕیوایەتانە وون دەبێت لە هەواڵخوانە گـەورەکانی شـیعە و لـەو گروپانەی شیعە کە لە دوای مردنی هەر ئیمامێکەوە تا ڕادەیەك ڕاجیاوازیان بـۆ دروست بووە، ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕیوایەتانە بەم دواییە هەڵبەستراون.

* ویلایەتی ئیمامەکان لەلای ئەوان بە نهێنییە، لـە ڕەزاوە کـە وتوویـەتی: (ویلایەت خوا بەنهێنی بە جوبرائیلی ڕاگەیاند، جوبرائیلیش بە نهـێنی گەیاندیـە موحەممەد، موحەممەدیش بە نهێنی گەیاندیە عەلی، عەلیش بـەنهێنی گەیاندیـە ئەوەی خۆی ویستی لێبوو، پاشان ئێوە ئاوها بلاوی دەکەنەوە؟! کێیە قسـەیەکی بیستووە وگلی داوەتەوە[1]. (الکافی).

*** وەسفەکانی دوازدە ئیمامەکە و کاتەکانیان :**

- خیلافەت دەگرنە دەست.
- لە سەردەمی ئەواندا ئیسلام بە هێز و دەسەلاتە.
- خەڵکی لەسەریان کۆکن.

هیچ کامێك لە مانە تەتبیق نابنە سەر ئیمامەکانی شیعە، تـەنها لـە ڕوی ژمارەوە نەبێت. ئەو ژمارەیەش دوای فەرمودەکە بانگەشەیان بۆ کـردوە. ئەمـە سەرباری ئەوەی حەسەنی عەسکەری مردوەو وەچەی لێ بەجێ نەماوە.

(١) الكافي: كتاب الايمان والكفر، باب الكتمان (٢/٢٢٤).

# باسی نۆیەم

## فەرمودەی: «أنا مَدينةُ العِلم وعليٌّ بابُها»

ئەم فەرمودەیە ضعیفە، نە سەنەدی و نە مەتنی لە پەیامبەرەوە ﷺ جێگیر نابێ.

* **سەنەدەکەی:**

فەرمودەکە حاکم لە ئیبن عەباسەوە دەریهێناوە[1]، لە دوو ڕێگەوە :

**یەکەم:** سەنەدەکە ئەبو صەلتی هەرەوی (أبو الصَّلت الهَرَوي) تێدایە.

ئەبو حاتم ئەڵێ: لای من ڕاستگۆ نییە.

عوقەیلیش ئەڵێ: ڕافزیەکی پیسە.

ئیبن عەدی ئەڵێ: تۆمەتبارە.

نەسائی ئەڵێ: سیقە نییە.

دوریش لە یەحیای کوڕی مەعینەوە دەگێڕێتەوە کە بە سیقەی داناوە.

هەروەها ئیبن میحرز لێی دەگێڕێتەوە وتوویەتی: لەو کەسانە نییە درۆ بکا.

**دووەم:** ئەمانەی تێدایە:

١. موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەکیم. فِيه لِينٌ

---

(١) (المستدرك) (٣/٢٢٦).

٢. حەسەنی کوڕی فەهم. لیس بالقوی.

٣. ئەعمەش سولەیمانی کوڕی میهران: سیقەیە بەڵام ئەوەندە هەیە مُدَلِّسە و لێرەشدا عەنعەنی کردووە یانی بە ڕاشکاوی ناڵێ بیستوومە[١].

**فەرمودەکەش زۆربەی زانایان بە لاوازیان داناوە:**

بوخاری ئەڵێ: فەرمودەیەکی مونکەرە، هیچ شێوازێکی صەحیحی نییە[٢].

ئەبو حاتم ئەڵێ: ئەسڵی نییە[٣].

ئەبو زورعە ئەڵێ: چەند کەس پێی ڕیسوا بوون[٤].

عوقەیلی ئەڵێ: هیچی صەحیح نییە[٥].

ئیبن حیببان ئەڵێ: ئەمە شتێکە ئەسڵی نییە[٦].

دارولقوتنی ئەڵێ: فەرمودەکە مضطربە و سابت نییە[١].

ئیبنولجەوزی ئەڵێ: صەحیح نییە و ئەسڵی نییە[٢].

نەوەوی و زەهەبی و ئیبن تەیمیە و ئەلبانی ئەڵێن: هەڵبەستراوە[٣].

---

(١) بۆ زانینی مدلس بڕوانە ل ٢٨ پەراوێزی ١.
(٢) (المقاصد الحسنة) (١٧٠).
(٣) (كشف الخفا) (١/٢٣٥).
(٤) (تاريخ بغداد) (١١/٢٠٥).
(٥) (الضعفاء الكبير) (٣/١٥٠).
(٦) (المجروحين) (٢/١٥١).
(١) (العلل) (٣/٢٤٧).
(٢) (الموضوعات) (١/٣٤٩).

**❊ مەتنەکەشی:**

مونکەرە لەبەر: زانا پێی ناوترێت شاری زانست، چونکە شار سنوردارە، بەڵکو پێی دەوترێت: دەریای زانست (بحر العلوم)، ئاسمانی زانست، فەزای زانست و هاوشێوەکانی ئەمانە.

ئەگەر ئەم وتەیەی: دەرگای شاری زانستە، لەبارەی عەلیەوە صەحیح بووایە، ئەوکات عەلی دەبووە نێرراوی هەموو جیهانیان نەك موحەممەد.

جگە لە عەلیش، زانست لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وەکو خێزانەکانی و باقی هاوەڵەکانی تری، ئیتر چۆن ئەوترێ: زانستی پێغەمبەر ﷺ وەرناگیرێ مەگەر لە ڕێگەی دەرگاکەیەوە نەبێ کە عەلیە ؟ !

❊ ❊ ❊

(١) (فتح الملك العلي) (٥١)، (تلخيص المستدرك) (٣/١٢٦)، ( مجموع الفتاوى) (١٨/٣٧٧)، (ضعيف الجامع) (١٤١٦).

# باسی دەیەم

## فەرمودەی «الإنذار یوم الدار»

ئەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ عەلی کردووە و وتوویەتی: (ئەمە برامە و وەصیمە و دوای خۆم خەلیفەمە، بۆیە گوێڕایەڵ و فەرمانداری بن)

هەر لە فەرمودەکەدا هاتووە کە چل کەس بوونە لە نەوەکانی عەبدولموتەللیب.

**وەڵام :**

ئەم فەرمودەیە سەنەد و مەتنی عیلەتدارە :

**❊ سەبارەت بە سەنەدەکەی:**

عەبدولغەفاری کوڕی قاسمی تێدایە: کە ناسراوە بە ئەبو مەریەمی کوفی.

ئیبن کەسیر ئەڵێ: تفرد به أبو مريم الكوفي[1]

ئیبنو لمەدینی ئەڵێ: كان يضع الحديث.

وئەبو حاتیم و نەسائی ئەڵێن: متروك الحديث[1]

**❊ مەتنەکەشی:**

هەر ڕوکەشی مەتنەکە دیارە مونکەرە لەبەر:

---

(١) (البداية والنهاية) (٣٨/٣).

(١) (ميزان الاعتدال) (٣٢٨/٢).

* نەوەکانی عەبدولموتەلیب نەگەیشتوونەتە چل پیاو، ئەمەش ژمارەیانەیە:

ئەبو تالب - ئەبو لەهەب - غەیداق - قیثم - حجل - المقوم - ضیرار - عەباس - حەمزە - عەبدولکەعبە - زوبەیر - عەبدوڵلا - حارس.

لەمانەش تەنها چواریان گەیشتنە ناردنی پەیامبەر ئەوانیش:

حەمزە ـ عەباس - ئەبوتالب - ئەبو لەهەب. ئەم چوارە.

**سەبارەت بە وەچەکانیشیان:**

**حەمزە:** چەند منداڵێکی بچوکی هەبووە وەچەیان لێ نەبووە.

**عەباس:** مناڵە گەورەکەی فەزڵە، کە پێنج ساڵ دوای ناردنی پەیامبەر ﷺ لە دایك بووە.

**ئەبو تالب:** چوار کوڕی هەبووە بچوکەکەیان عەلیە، ئەنجا: تالب، ئەنجا عەقیل ئەنجا جەعفەر.

**ئەبو لەهەب:** سێ کوڕی هەبووە: عوتبە و عوتەیبە و موعەتیب.

**غەیداق:** وەچەی نەبووە.

**قثم:** هەر بە مناڵی مردووە.

**حجل:** مناڵێکی هەبووە بە ناوی: مەڕە.

**المقوم:** کوڕی نەبووە.

**ضرار:** وەچەی نەبووە.

**عەبدولکەعبە:** وەچەی نەبووە.

**زوبەیر:** کوڕێکی هەبووە بە ناوی عەبدوڵڵا، ئەویش وەچەی نەبووە.

**حارس:** حەوت کوڕی هەبووە: ئەبو سوفیان - ڕەبیعە - نەوفل - عەبد شەمس - عەبدوڵڵا - ئومەییە - عوبەیدە، **ئیتر چل کوا؟**

* ووتەی: (**هەر کامتان یارمەتیم بدەن و پشتم بگرن لەسەر ئەم کارەم، ئەوا ئەیکەم بە برای خۆم و وەصی خۆم لە نێو ئێوە**). مومکین نییە لە پێغەمبەرەوە دەربچێت، چونکە تەنها بە بەدەم چوونەوەی بانگەوازەکەیی و شەیەتمان هێنان نابێتە خەلیفە، لە کاتێکدا کە زۆرێك بە دەم بانگەوازەکەیەوە چوون :

* حەمزە و جەعفەر و عوبەیدەی کوڕی حارس بە دەم بانگەوازەکەیەوە هاتن و [ لەو کاتەدا ] لە عەلیش زیاتر دینیان سەر خستووە.

* عەلی لەو وەختەدا عومری ٨ یا ١٠ساڵان بووە.

* ئەو ووتەیەیان بە ئەبو تالب: (فەرمانی پێکردوویت کە گوێڕایەڵ و فەرمانداری کوڕەکەت بیت). ووتەیەکی پووچە، ئاخر ئەبو تالب ڕەفزی کردەوە وەڵامی ئەسڵەکە بداتەوە کە پێغەمبەرە ﷺ، ئیتر چۆن دێت وەڵامی فەرعەکە ئەداتەوە کە عەلیە، کە پێی عەیبدار دەبێت. تا ڕادەیەك ئەمە گرنگترین ئەو بەڵگانەیە کە دەیهێننەوە بۆ لە پێشتری عەلی ؓ لە ئەبو بەکر و عومەر.

لەوانەیە بەڵگەی تریش هەبن باسم نەکردوون، لەبەرئەوە بووە مەبەست ناپێکن -هیچ نەبێ بە بۆچوونی من-.

## شەجەری بەنی هاشم

شجرة بني هاشم

- عبدالمطلب — شيبة الحمد
- أسد — لم يعقب ذكوراً
- أبو طالب — عبد مناف: طالب، عقيل، جعفر، علي
- أبو لهب — عبدالعزى: عتبة، عتيبة، معتب
- الغيداق ← لا يعقب
- الحارث: أبو سفيان، ربيعة، نوفل، عبد شمس، عبدالله، أمية
- قثم ← مات صغيراً
- حجل ← قرة ← ولم يعقب
- المقوم ← لم يعقب ذكوراً
- ضرار ← لم يولد له
- العباس: الفضل، عبدالله، عبيدالله، قثم، عبدالرحمن، معبد، تمام، كثير، الحارث
- حمزة: يعلى، بكر، عامر، عمارة ← ولم يعقبوا
- عبدالكعبة ← لم يعقب
- الزبير ← عبدالله ← ولم يعقب
- عبدالله

# بەشی دووەم

## بەڵگە عەقڵییەکانی ئەوانەی عەلی لە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان لە پێشتر دادەنێن بۆ خیلافەت لەگەڵ ڕەواندنەوەیان

# باسی یەکەم

## ئازاترین کەس بووە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ

بێگومان عەلی ﷺ یەکێك بووە لە هاوەڵە ئازا و لێهاتووەکان، تەنانەت ئەو شێرێك بووە لە شێرەکانی خوا و شیرێك بووە لە شیرەکانی خوا هەڵیکێشاوەتەوە بەسەر بێ باوەڕاندا، قسە لێرە نییە، قسە لە لە پێشختنی ئازایەتی ئەوە بەسەر ئازایەتی باقی هاوەڵاندا.

ئەم وتەیە تەواو نییە، لەبەر ئەوەی ئازایەتی (شجاعة) دوو واتای هەیە :

یەکەم: دڵ قایمی و چەسپاوی.

دووەمیان: توند شەڕکردن بە جەستە.

یەکەمیان بریتیە لە ئازایەتی.

بەڵام دووەمیان: بریتیە لە بە هێزی جەستە، ئەی جا هەموو لاشە قایمێك دڵ قایم نییە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، بۆیە کەسانێك دەبینی گەر لەگەڵ کۆمەڵێکدا بێ پشتیان پێ قایم دەکاو زۆر دەکوژێ، بەڵام ئەگەر خۆی بەتەنها بێ دەبینی دڵی ئەترسێ و تەمەڵ ئەبێ، لە کاتێکدا پیاوی دڵچەسپاوی واش دەبینی کە بەدەستەکانی زۆری نەکوشتووە چەسپاوە لە کاتی ترسناکدا و لە پێشە بۆ ناڕەحەتی، هەر ئەم خەسڵەتەشە خوازراوە بۆ سەرکردە و پێشەوا و پێشەنگی جەنگەکان نەك خەسڵەتی دووەم.

